د . کەمال مەزهەر

# دیاری یەك بۆ «مێژوو»

**پێشکەشە بەوانەی هیچیان لە باردا نی یەو زۆر بە ئەسڵو فەسڵەوە دەنازن ، بەوانەی زۆریان لە باردایەو هیچ بە ئەسڵو فەسڵەوە نانازن !**

دیارە کەس نەبووەو کەس نی یەو کەس نابێ لە ناخی دەروونەوە حەز نەکات ئەوی دەینووسێ بە دڵی خوێندەواران بێ ، وا نەبوایە کەس قەڵەمی نەدەخستە سەر کاغەز . ئەو بەدڵ بوونە لە سەرانسەری جیهانی پانو بەریندا گەورەترین پاداشتە بۆ هەر کەسێك بەرهەمی بیرو خامەو شەونخونی ی خۆی بکاتە دیاریی ڕازاوەی دەستی بۆ هاوزمانانی ، بەڵام بۆ کوردێك لەوەیش زیاترە .

ماوەیەك لەمەوبەر لە چەند لایەکەوە پێیان گوتم بەڕێز دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی دەیەوێ بچمە خزمەتی . یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بەر لە خوشكو دۆستو یاران ڕووم کردە قاپیی یەکێك لەوانەی جاران پێیان دەگوترا گەورە پیاوانو ئێمەو مانان پێیان دەڵێین پێشەنگی دەستەی ڕووناکبیران . یەکسەر فەرمووی :

**« ڕۆڵە کتێبی (مێژوو) مکەتم بەدڵ بوو ، دوای خوێندنەوەی بڕیارمدا تۆ وەریسی کتێبخانەکەم بی ، وا هەر لە ئێستەشەوە چەند بەڵگەو بەرهەمێکت پێشکەش دەکەم » .**

لەوەتەی ڕەمەزانو قوربان ڕوویان کردۆتە کوردستان یا هەر ناوچەیەکی تری خاکی موسڵمان ڕەنگبێ هیچ جەژنانەیەك خۆشی کەسی وا نەگەیاندبێتە ئاستی ئاسمان . بە خۆمو کۆڵێك گەوهەرو مرواریو برواوە گەڕامەوەو چاوو دڵی چەند برایەکی دڵسۆزم ڕوون کردەوەو وا لە ڕێگەی «کاروان» ی خۆشەویستەوە پوختەی یەکەم بەرهەمی ئەو دیاری یە بەنرخە دەگەیێنمە تۆماری ڕووناکبیریی ئێمرۆمان .

**یەکەم .. ئیجازەی شێخی سەراجەددین بۆ حاجیڕەسوڵی نەقشبەندی**

دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی شاری سلێمانی یە[1] . کوڕی حاجی فەتاحی کوڕی مەلا قادری کوڕی حاجی ڕەسوڵی کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی گودرون ئاغای کوڕی ڕۆستەم ئاغای کوڕی زۆراب ئاغای کوڕی زوڵاڵ ئاغای مەرگەیی یە . زوڵاڵ ئاغا یەکێك بوو لە دوانزە سوارەی مەریوان ، پیرەمێردی نەمر لە داستانەکەی خۆیدا چەند جارێك بەتایبەتی ناوی هێناوە[2] .

کە برایم پاشا شاری سلێمانیی بنیات ناو بارەگای میرنشینی بابانی لە قەڵاچوالانەوە گواستەوە ئەوێ محەمەد ئاغای نەوەی زوڵاڵ ئاغا[3] یەکێك بوو لەو پیاو ماقوڵانەی بەخۆیوماڵو منداڵی یەوە لەتەکیا هاتە شاری نوێی کوردستان . پاش دوازدە ساڵ ، واتە دەوروبەری ساڵی 1796 ، خوا ڕەسوڵی بەخشی بە محەمەد ئاغا .

ڕەسوڵ زوو وەك لاوێکی بەخشندەو زیرەكو وریاو دادپەروەرو یەکجار لە خواترس ناوی دەرکردو ڕووی کردە مەککەو مەدینەو پاش گەڕانەوەی بووە حاجی ڕەسوڵ . هەر لەوساشەوە ڕێبازی نەقشی دای لە کەلەیو بووە موریدێکی دڵسۆزی . زۆری نەبرد حاجی ڕەسوڵ خانەقایەکی لە تەنیشت ماڵی خۆیەوە دروستکردو هەموو ئەرکی بەڕێوەبردنی گرتە ئەستۆی خۆی .

دەنگو باوی حاجی ڕەسوڵ کەوتە سەر زاری پیاو چاکانی شارو دەوروبەری . سەودای نەقشی بووە کێچو کەوتە


میر محەمەد عەلی

کەولی ، بە پەرۆشەوە ڕووی کردە بیارەو چووە خزمەت شێخی سەراجەددین . شێخی گەورەی نەقشی حاجی ڕەسولی دەچێ بەدڵاو زۆر بەڕێزەوە ئیجازەی ئیرشادی پێدەبەخشێ . دەقی ئەو ئیجازە پڕ لە شانازی‌یەی پاش چەند مانگێکی‌تر تەمەنی دەگاتە صەدو پەنجا سالی ڕەبەق[4] یەکەم دیاریی بەنرخ بوو بۆ « مێژوو » .

بارستی ئیجازەکەی شێخی سەراجەددین 34 × 21 سانتیمەو بریتی‌یە لە 23 دێڕ کە بە دەسخەتی زاناو شاعیری ناسراو مەلا حامیدی کاتبی شێخ بە خەتی فارسی نووسراوەتەوە ، پێنج دێڕی یەکەمی عەرەبی‌و ئەوانی‌تری فارسین . مۆرو ئیمزای شێخی سەراجەددین وا بە لای چەپی دامێنی‌یەوە . ئەمە دەقی سەرەتا عەرەبی‌یەکەیەتی :

**« الحمدلله الذی جعل قلوب اولیائه الکاملین محکا لنقد الوجود وصیرّ قبولهم علامة لقبوله والاقتداء بهداهم مرِقاةً للعروج الی اعلی معارج الشهود ومیّز من بینهم السادة العلیة النقشبندیة وخصهم بمزایا لاتعد ولا تحصی منها ان نهایة سائر الطرق مندرجة فی بدایتهم فیقاس علی هذا شان کمال طریقتهم وحال نهایتهم ... »** .

دوای ئەو سەرەتایە دیسان بە فارسی باسی ڕێبازی نەقشی‌و تایبەتی‌یەکانی دەکات کە چۆن لەسەر بناغەی ئایینی ئیسلام دامەزراوەو هیچ شتێکی دوور لە ئایینی تێدا نی‌یەو تەنانەت ئەوەی لە تەریقەتەکانی‌تردا بە چلەکێشان‌و ڕیازەکردن پەیدا دەبێ لای نەقشی‌یەکان لە ڕێگەی هاوڕێیی پیاو چاکان‌و پیرانی تەریقەتەوە دێتە گۆڕێ . ئەمجا دێتە سەر باسی حاجی ڕەسول‌و دەڵێ یەکێکە لەو کەسانەی بە دل دەسەو دامێنی ڕێبازی نەقشی بوون‌و هەموو پایەکانی ئەو ڕێبازەی بڕیوەو « کەیشتۆتە دائیرەی ویلایەتی پچوك » ، بۆیەکا بە فەرمانی لە جیهانی گیانەوە هاتوی پیرانەوە ڕێگەمان‌دا تەریقەت نیشانی خەلك بداو ڕێی پیران بگرێ‌و « خەتمی خواجەگان » بکا . دوای ئەوە دەڵێ : هیواداین حاجی ڕەسول لەم ڕێگەدا زۆر بەرز بێتەوەو داواش لەوانە دەکەین کە ئارەزووی گرتنەبەری ڕێگەی ڕێبازی نەقشی‌یان هەیە دەست بدەنە دەستی‌و لێوەی فێربن‌و هاوڕێیی ئەو بە هەل بزانن چونکە پڕە لە بەرەکەت‌و بەختەوەری .

دوای وەرگرتنی ئەو بەڵگە نامەیە حاجی رەسوڵ زیاتر کەوتە کۆشش بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی رێبازی نەقشبەندی ، ئەو کارەی رقی ژمارەیەك دەسەلاتداری ناوچەکەی لێ هەلساندو لە تاوا ناچار بوو شاری سلێمانی بەجێ بهێڵێ و روو بکاتە گورگەدەری ناوچەی سورداش کە گوندی خۆی بووەو تا کۆچی دوایی لەوێ نیشتەجێ دەبێ . پاش مردنی لە ساڵی 1286ی کۆچی ( 1869 / 1870 ی عیسایی ) دا تەرمی حاجی رەسوڵ دەهێننەوە سلێمانی و لە گردی مەعفوانی گۆرستانی سەیوان دەینێژن .

بەر لەوەی سلێمانی بەجێ بهێڵێ حاجی رەسوڵ خانەقاکەی بە مەلا عوسمانی باڵەخی دەسپێرێ کە زانایەکی ناسراوو سەر بە رێبازی نەقشبەندی و موجازی شێخ بەهادینی خەلیفەی شێخی سەراجەددین بووەو دوای کۆچی دوایی حاجی مەلا عەلی کوڕی دێتە سەری کە ئەویش زانایەکی پایەبلند بووەو لەو ساوە ئیتر خانەقاکە دەبێتە « خانەقای مەلا عەلی » کە تا ئیستەش هەر ماوە .

### دووەم ـ محەمەد عەلی گەورەو کورد

هەموو ئەنسکلۆپیدیاو هەموو کتێبێکی مێژووی نوێی میسر کە باس دێتە سەر محەمەد عەلی گەورە دەڵێن بە رەگەز ئەلبانی و دانیشتووی شاری قوڵەو[5] سەرەتا توتن فرۆش بووە .

دەوروبەری کۆتایی ساڵی 1949 بە بۆنەی یادی سەد ساڵەی کۆچی دوایی محەمەد عەلی گەورەوە نووسەری بەناوبانگی میسر عەبباس مەحمود عەقاد بە ناوی گۆڤاری « المصور » ەوە دیدەنییەکی تایبەتیی لەگەڵ جێگری فاروقی پاشای ئەوسای میسردا کردووە کە ئەویش بە ناوی باپیرە گەورەیەوە ناو نراوە محەمەد عەلی . کاتێك باس هاتۆتە سەر رەگەزی محەمەد عەلی گەورە جێگری تەختی پاشایی میسر گوتوویە :

« ... دەربارەی بنەماڵەی عەلەوی[6] شتێکتان بێ دەڵێم لەوانەیە ببێتە هۆی سەرسورمانی گەلێك کەس . وا بڵاوە گوایە ئەو بنەماڵەیە لە نزیك قوڵەی ولاتی ئەرناوودەوە[7] دروست بووە ، بەلام ئەوی من لە رێگەی کتێبێکی قازیی میسری رۆژگاری محەمەد عەلی گەورەوە زانیومە ئەو بنەماڵەیە بە بنەچە لە دیاربەکری ولاتی کوردانەوە



عەبباس مەحمود عەقاد

هـاتووه ، لەوێـوە باوکی محـەمەد عـەلی‌ی‌و دوو برای چونەتە قوڵە ، دوای ئەوە یەکێك لە مامەکانی محەمەد عەلی چۆتە ئەستەموڵ‌و مامەکەی تریشی دوی بازرگانی کەوتووە ، تەنها باوکی محەمەد عەلی لە قوڵە ماوەتەوە . میر حەلیمیش[*] رەگەزی بنەماڵەی ئێمەی دەگێـڕایەوە دیـاربـەکـری وڵاتی کـوردان‌و ئـەوەش بـۆ خـۆی گێڕانەوەکەی قازیی میسر پتەوتر دەکات » .

وا دیارە ئەو قسانەی محەمەد عەلی‌ی جێگری تـەختی پاشایی میسری ئەو رۆژگارە تەلی هەستی عەبباس مەحمـود عەقادیان بزواندووە چونکە ئەویش ، وەك بۆ خۆی نووسیوی‌یە ، بە رەگەز کورد بووە . عەقاد هەر لەوێدا روو دەکاتە نـەوەی محەمەد عەلی‌ی گەورەو پێی دەڵێ :

**« وڵاتی کوردان ئەو شەرەف‌و شانازی‌یەی بەسەکە دوو قـارەمـانی نـەمـری دایـە جیهـانی ئیسـلام ـ صەلاحەددین‌و محەمەد عەلی‌ی گەورە ... »**

ئـەم زانیاری‌یـە کەم زانـراوە لە لاپـەڕە 56 ی ژمـارە (1311) ی رۆژی « 25 » ی تەشرینی دووەمی ساڵی « 1949 » ی « المصور » دا چاپکراوە کە دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی لەوساوە وەك بەڵگەیەکی مێژوویی لە کتێبخانەکەی خۆیدا پاراستوویە . لە هەمان ژمارەدا وتارێکی حەبیب جاماتی بەم نـاونیشانـەوە بڵاوکراوەتەوە : « کورد دەیەوێ دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێ » کە تێیدا بە تایبەتی باسی مەهابادو قازی محەمەدی کردووە .

بنەماڵەی محەمەد عەلی‌ی گەورە بە رەگەز کورد بێ یا کورد نەبێ هیچ لەو راستی‌یە ناگۆڕێ کە جیاوازی لە نێـوان گەلاندا نی‌یە ، کە کورد هیچی لە کەس کەمتر نی‌یـە ، هەڵو مەرج‌و دۆخی شوێن‌و قۆناغ جێگەی گەل‌و سەرداروقارەمان لە مێـژوودا دیـار دەکـەن . وا دیـارە زۆر لەو کـوردە زیـرەك‌و جوستانـەی باری ژیـانی کوردەواریی رابـوردوو نەیتـوانیوە تینوێتی‌یان بشکێنێ روویـان کردۆتـە ناوچـەی ترو لەوێ بـە لێهاتوویی خۆیان گەیشتوونەتە بەرزترین پلەو پایە .

بۆ زیاتـر روون کردنـەوەی ئەم بـۆ چوونـە دەڵێم هەر کۆرپەیەکی ناوچە زەلکاوێکانی ئاسیاو دارستان‌و بیابانەکانی ئەفەریقا لەگەڵ چاوی هەڵهێنا بیبەینە ناو خێزانێکی پارەداری ئینگلیزی‌یەوە کە گەورە بـوو وەك ئەوانـەی دەوروبەری بـە کەوچك‌و چەتاڵ نان دەخواو بە چەقۆ میوە پـاك دەکاو پـایپ دەکێشێ‌و سموکن لەبەر دەکاو وەك ئەوان دەدوێ‌و دەبزوێ‌و زۆر لە وانەشە ببێتە پسپۆڕێکی ناودار . دیارە هەر کۆرپەیەکی چـاو شینی سـویـدیش بهێنینـە نـاوچـەیـەکی زەلکـاوی دواکەوتووەوە کە گەورە بوو پاپەتی‌و نەخوێندەوارو دواکەوتوو دەبێ‌و لە هەرشت زیاتر حەز لە گـۆشت ماسی‌و رانـە مراوی دەکا . بهاتایەو محەمەد عەلی‌ی گەورە لە ئـەلبانیـا بمایـەوە لەوانە بوو ببێتە بازرگانێکی دەوڵەمەنـدو بەنـاوبانـگ ، بەلام نـەدەبووە ئـەو پیاوە سیـاسی‌یە لێهـاتووەی تـوانی دوو جار لەشکری سوڵتانی عوسمانی بشکێنێ‌و بگاتە نیمچە دوورگـەی عەرەب‌و سودان‌و سوریاو وای لێ بێ هەموو دەوڵەتە گەورەکان حسابی بۆ بکەن . بێ گومان لە خۆوە نی‌یە یەکێکی وەك مارکس گوتویە « میسری محەمەد عەلی تاکە پارچەی وڵاتی بەرفراوانی عوسمانی‌یە توانای ژیان‌و مانی هەبێ » .

شایانی باسە محـەمەد عـەلی بەر لە کـۆچی دوایی بە ماوەیەکی کەم ئینجا فێری نووسین‌و خوێندنەوە بوو !

**سێیەم ـ یەکەم ساڵی « گەلاوێژ »**

سـەرەتای سـاڵی 1961 هاوڕێی خـۆشەویستم دوکتـۆر عیزەددین مستەفا رەسول دوو دیـاری زۆر بەنـرخی دامێ ، یەکەمیان هەر شەش بەرگی یادداشتەکـەی مامـۆستا رەفیق حیلمی[*] و دووەمیـان ژمـارەکـانی « گـەلاوێـژ » لە سـاڵی سێیەمی‌یەوە بوون . لەوساوە عەودالی ساڵی یەکەم‌و دووەمی ئەو گۆڤارە بەرزەمانم ، بەرەکەتدا وا دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی هەموو ژمارەکانی ساڵی یەکەمی پێشکەش کـردم‌و بەو جـۆرە کەلێنێکی باش لە کتێبخانەکەمدا پڕبۆوە .

دیسان چاوم بە ناوەرۆکی هەر « 10 » ژمارەکەی ساڵی یەکەمی « گەلاوێژ » دا گێڕایەوە[**] . باوەڕ ناکەم کەسێك هەبێ دان بەوەدا نەنێ دەرچونی « گەلاوێـژ » بەڕاستی ڕوداوێکی گەورەی ژیانی رووناکبیریی هاوچەرخی کورد بوو . دیارە هەر لەبـەر ئەوەش « گـەلاوێژ » زۆر زوو لە نـاو خوێنـدەوارانی ناوەوەی وڵات‌و لە دەرەوەی دەنگی دایەوە . ئێدمۆندس دوای دەرچونی سێ ژمارەی دەربارەی نووسیوی‌یە دەڵێ :

**« گەلاوێژ ئەستێرەی هەرە گەشی ئاسمانە ، بەلای میسـری‌یـە کـۆنـەکـانـەوە مـزگێنی دەری خێـرو بەرەکەت بوو . ناوەرۆکی یەکەم سێ ژمارەی مژدەی**

ئـەوە دەدەمن کـە « گـەلاوێـژ » نـاوی خـۆی بەخۆیەوەیە » .

پێم وایە بەشی زۆری وتارەکانی « گەلاوێژ » ئەوە دەهێنن یا وەك خۆیان یا بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە دیسان لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا بلاوبکرێنەوە .

**چوارەم ـ « لەهستان » ی مەحمود جەودەت**

یەکێك لەو کتێبە نایابانەی بەڕێز دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی پێشکـەشی « مێژوو » ی کـردن « پـۆلۆنیـا ـ پـۆلەنـدەو یـا لەهستان » ەکەی خـوالێخۆشبـوو مەحمـود جەودەتـە کە لە لاپەرە 312 ی « مێژوو » دا ناوی هاتووەو دەمێکە بوتە یەکێك لە بەرهەمە کوردی‌یە دەگمەنەکان .

دوکتۆر ئیبراهیم وەك هەموو ڕووناکبیرانی هاوتەمـەنی خۆی بە ئەوپەڕی ڕێزو هەستەوە باسی ئەو نیشتمانپـەروەرە دلسۆزە دەکات کە ڕۆژی 20 ی تەشرینی دووەمی سالی 1937 لە بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا لە سێـدارە دراو مەرگی نـاخی دەرونی هەموانی هەژاندو تەلی خامەی شاعیـرانی بزوانـد . کەسێك نی‌یە خوالێخۆشبو مەحمود جەودەتی ناسیبێ‌و باسی ئازایەتی‌و خاوێنی‌و دلپاکی‌و بەخشندەیی‌و دەست بـلاوی‌و دلناسکیی نەکات .

مـەحمود جـەودەت تـەنها ئـەفسـەرێکی لێهـاتـووو یاریدەرێکی دلسۆزی شێخ مەحمودو دۆستێکی نزیکی سمکۆو ئاوارەی دەستی مێجەرسۆن نەبووە ، بەلکو هەمان کات یەکێك بووە لەوانەی بە نووسینیش خزمەتی گەلیان کردووە . دوای خۆی چەنـد وتارێـكو دوو کتێبی گەورەی بـەجێ‌هێشتووە ، یەکەمیان بەرهەمی ج . أ . سێلمەنتی ڕۆژئاوایی‌یە دەربارەی بابی‌و بەهائی کە ئەو کردوویە بە کوردی‌و بە ناوی « بهاء الله دەوری نوێ » وە سالی 1933 لە بەغدا بـلاوی‌کردوتـەوە ( 336 لاپەڕەیە ) . دووەمیشان ئەو کتێبەیەتی کە حوزەیرانی سالی 1936 بە ناوی « پولونیا ـ پولانداو پالهستان » ەوە[10] داینـاوەو بە داخەوە بۆ خۆی فریا نەکەوت بلاوی بکـاتەوە . سـالی 1940 ، واتـەسێ سـال‌دوای کـۆچی دوایی خـاوەنی لەچـاپخـانـەی « المعارف » ی بەغدایی لە 237 لاپەڕەی قەوارە پچوکدا ( 17 × 12 سـانتیم ) لەگەل نـەخشەیـەکی سیاسیی پـۆلۆنیـادا چاپکراوە .

لەو کتێبەیدا کە بە پشتیـوانی 3 سەرچـاوەی تورکی‌و سەرچاوەیەکی فەرەنسی‌و یەکێکی عەرەبی داینـاوە مەحمـود جەودەت باسی زۆر لایـەنی ژیانی ئـابووری‌و کـۆمەلایـەتی‌و سیاسی‌و چارەنووسی مێژوویی پـۆلۆنیا دەکـات . ئەم بـاسەی دواییان گەلێك سەرنجی دانەریان ڕاکێشـاوە ، وا دیارە وەك کـوردێـك زامـی دەرونـی کـولانـدوتـەوە . لە دووتـوێـی « لەهستان » دا لە هەر شت زیاتر هەست بە خۆگری‌و « هێزی ژیـان » و کۆلنـەدانی پۆلۆنی‌یـە ئازادیخـواکان دەکـەیت ، ئەوانەی بە درێژایی قۆناغێکی سەدان سالەی مێژوو بە دەست جەوری نەمسەو بە تایبەتی ڕووسیاو پرووسیاوە گیرۆدە بوون .

خوالێخۆشبـو باسـەکانی لەهستـانی بە کـوردی‌یەکی ڕەوان هۆنیونەتەوەو بە شێوەیەکی زانستی‌یانە دایڕشتوون‌و هەولی داوە لە ڕێگەیانەوە زاراوی نوێ بۆ کوردی دابڕێژێ یا وەربگرێ ، وەك ( ئاوەڕێژ ) کە لە بـریتي « مصب النهر » و (لیمان) کە لە بریتی « الميناء » و (قـەراڵو قەراڵیچـە) کە لە بـریتی « الملكو الملكة » و (ئـان) کە لە بـریتی « الثانیـة » و (پشتان) کە لە بریتی « الأجيال » بەکاری هێناون .

وا دیارە یەکێـك یا دەستـەیەك لە دۆستـانی مەحمـود جەودەت بەرپابوونی شـەڕی دووەمی جیهان‌و داگیـرکردنی پـۆلۆنیایـان لە لایەن نـازی‌یەکـانـەوە بـە هـەل زانیـوە بـۆ بلاوکردنەوەی لەهستانەکەی کە پێنج بەشی یەکەمی‌و تا لاپەڕە 210 ی لە نووسینی خۆین . هەرچی بەشی شەشەمی کتێبەکەیە ( ل 211 — 237 ) باسی ئەو بەسەرهاتانەی پۆلۆنیا دەکات کە دوای وەفاتی مەحمود جەودەت ڕوویان داوە ، بەلام بەداخەوە لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەدا باسی دانەری ئەو بەشەی نەکراوە . خۆزگە خـەبەرداران ئـەو لایـەنـەی « لەهستـان » یـان بـۆ ڕوون دەکردینەوە .

**پێنجەم ـ مێژووی کۆیە**

لە سـەرەتـای بـەشی «کـورتـەی بیبلیـۆگـرافیـای مێژوونووسیی کوردی»ی کتێبی «مێژوو»دا گوتومە :

**«ئـەم بیبلیـۆگـرافیـایـە تـەنها هـەنگـاوێکی سەرەتایی‌یە ، هیچ دوور نی‌یە کەموکورتیی زۆری تێدا بێ‌و ... وتاری بایەخدارم بەسەردا تێپەڕیبێ ، یا دەستم پیایـدا ڕانەگـەیشتبێ» . ئەمجـا لە زمان**

**«باوکی گەورەی مێژوو نووسیی کوردی شەرەف خانی بدلیسی» یەوە لە «زانایانی پیاوچاك و دلپاك و بەوەج» پاڕاومەتەوە کە «زۆر بە وردی لە نووسینەکەم وردببنەوەو ئەگەر پەشێوی یەکیان بەرچاو کەوت بە شێوەیەکی مەردانە بەراوردی بکەن . خۆ ئەگەر هەڵەو لە بیر چوونێکم لەسەر دەدۆزنەوە هەر بە گاڵتە پێکردن و تەشەر لێم نەقۆزنەوە . پیاوەتیم لەگەڵ بکەن و بە پارچەیەکی چاکترو بە بزگورێکی تازەترو پاکتر بۆم پینە بکەن»[12] .**

مامۆستاو هاوڕێ و برای یەکجار خۆشەویستم مەسعود محەمەد یەکەم کەس بوو بەو هەستەوە سەرنجی ڕاکێشام کە بە بیبلیۆگرافیای «مێژوو» دا «مێژووی کۆیە یا کۆیسنجق»ی مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزیم لەیاد کردووە . هەر ئەو ڕۆژەش لە ناو دیاری یە بەنرخەکانی دوکتۆر ئیبراهیم حیلمیدا ئەو کتێبەم بەرچاو کەوت .

«مێژووی کۆیە» ساڵی 1962 لە بەغدا چاپکراوە[13] ، ئەو ساڵە من لە دەرەوەی وڵات دەمخوێند ، بۆیەکا نە من و نە ئەو برایانەی وەك من[14] ئەوساکە بە مێژووی کوردەوە خەریك بوون ئەو کتێبەمان دەست نەکەوت کە زۆر لایەنی دەهێنن ببوایە سەرچاوەی ڕوونکردنەوەی ئەو باسانەی ئێمە لە نامەکانی خۆماندا شیمان کردوونەوە . زۆر بە داخەوە دوای گەڕانەوەشم لە هیچ شوێنێك «مێژووی کۆیە»م بەرچاو نەکەوت ، وا نەبوایە هەڵبەت ئەو کەلێنە نەدەکەوتە مێژووەوە .

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئەم قسانەم بۆیان نی یە دوا پاکانەم بۆ بکەن هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی مامۆستا نەریمان لە لاپەرە 133ی «بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی» یەکەیدا دروست باسی «مێژووی کۆیە»ی کردووە . هەرچۆن بێ ـ ملێم بریا گەلێك بەرهەمی تری وەك «مێژووی کۆیە» هەبونایەو جا با من لە یادم بکردنایە !

### شەشەم ـ دوا وشە

دیاری یە بەنرخەکانی دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی فەتاح بۆ «مێژوو» زۆر لەوە زیاترن کە چەند نمونەیەکیانم لەم وتارە گشتی یەدا خستە بەر چاو ، هیوادارم بتوانم کەڵکیان لێ ببینم و بۆ مامە برایمیش ئاواتەخوازی تەندروستی و تەمەن درێژیم .

پەراوێزەکان :

(1) ساڵی 1909 لە سلێمانی لە دایك بووە . سەرەتا لە حوجرەو لای خواجا ئەفەندی خوێندوویەو ئینجا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی کە ساڵی 1928 تەواوی کردووە . ساڵی 1932 لە قوتابخانەی ناوەندیی مەرکەزی بەغدا دەرچووەو بۆ تەواوکردنی خوێندن چۆتە قاهیرەو ساڵی 1937 لەوێ بەکەلۆریۆسی لە بەیطەرەدا وەرگرتووەو پاش ساڵێك چۆتە تورکیاو ڕۆژی 25ی تەشرینی دووەمی ساڵی 1940 لەوێ دوکتۆرای لە بەکتریۆلۆجیای نەخۆشیی ئاژەڵدا وەرگرتووە . دوای گەڕانەوەی و تا ڕۆژی خانەنشین کردنی لە 23ی مایسی ساڵی 1964دا فەرمانبەر بووەو وەك دەستپاکێکی کەم هاوتا ناوی دەرکردووە . زۆر بایەخ بە مێژووی کورد دەدات و دەربارەی چەند وتارێکی لە ڕۆژنامەی «التآخی»دا بلاوکردۆتەوە «بۆ کورتەی ژینامەی بڕوانە : محمود الجندي ، دائرة المعارف العراقية العامة ، الجزء الاول ، بغداد ، بلا ، ص 15) .

(2) بڕوانە : پیرەمێرد ، دوانزە سوارەی مەریوان ، چاپی سێیەم ، سلێمانی ، 1963 ، ل 7 ، 10 , 33 .

(3) حەماغایان پێ دەگوت .

(4) ساڵی 1251ی کۆچی ، 1836ی عیسایی بەخشراوە .

(5) لە سەرچاوە ئینگلیزی یەکاندا «قەوەلە» دەنووسن . دوور نی یە قۆلە لە «قلعە»ی عەرەبی یەوە هاتبێ .

(6) مەبەست بنەماڵەی محەمەد عەلی ی گەورەیە کە زۆر جار لە میسر بەنیسبەت دووەم ناوی لێکدراوی محەمەد . عەلی یەوە پێیان دەگوت عەلەوی .

(7) مەبەست ئەلبانیایە .

(8) یەکێك بوو لە نەوەی محەمەد عەلی ی گەورە .

(9) بەرگی یەکەمیان خوالێخۆشبوو ڕەفیق حیلمی بە خەتی خۆی پێشکەشی کردووە بە «خۆشەویستی کاك عیزەددین» .

(10) ژمارە پێنج و شەش و ژمارە یازدەو دوازدەی ساڵی یەکەمی «گەلاوێژ» پێکەوە دەرچون .

(11) دەقی ناوی کتێبەکە بەو جۆرە چاپ کراوە .

(12) بڕوانە ل 258 — 260ی «مێژوو» .

(13) طاهر احمد حویزی ، مێژووی کۆیە یا کۆیسنجق ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، 1962 ، 159ل .

(14) مەبەستم دوکتۆر کلوس فەفتان و دوکتۆر ئەحمەد عوسمانە .

# لێکۆڵینەوەی زانستی فۆلکلۆر «لە ئەوروپاو لە کوردستاندا»

● د . شوکرییە ڕەسوول ●

سەرنجدان لە مێژووی میللەتانی ئـەم جیهانـە ئەمـان گەیەنێتە ڕادەیەك بۆ تێگەیشتن و وردبـونەوە لەڕوی دروست بونیان و گەشە سـەندنیـانەوە ئـەوەشمان دێنێتـەوە یاد کـە هەندێکیان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو گەشەسەنـدن چون و هـەندێکی تریشیان بە پێچەوانەوە هۆی ئەم گەشە سەندنەش دەگەڕێتەوە بۆ باری کـارکردن لە هـوشیاری نـەتەوەو لەنـاو چونیشی بـە پێچەوانەوە ..

بێگومان مانەوەی ئـەم میللەتانـەو گەشـە سەنـدنیان مێژویەکی دێرینی نووسیوەتەوە کە نیشانەی ڕابوردویان دیاری ئەکات لەگەل سەرهەلدانی ئەم میللەتانەدا کەلەپورەکەشیان ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی کـردووەو چەنـد ئەو میللەتـە پێشکەوتبێ کەلەپورەکەی دەوڵەمەنـد بووە .. دیـارە ئەم درێـژە پێدان و دەوڵەمەند بونی کەلەپورە ئەگەڕێتەوە بۆ کۆمەلێ تاقی کردنەوە کە بەدرێژایی مێژوی ئەو میللەتە لەڕوی سیاسەت و ئەدەب و یاساو فەلسەفەو هەموو زانیاری یـەك کە سـەرخانی کـۆمەل دەگرێتەوە ئەو سەرخانەش لەگەل بارە ئابوری یەکەدا بناغەی مـەسەلەکـەیەو لە مێـژوی کەلەپـوری میللەتەکـەدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ .

کەواتە «کەلەپوری نەتەوە مەسەلەیـەکی مرۆڤـایەتی و ویژدانی یەو کەسیەتی نەتەوەو بـوونی مێژوی کـۆن و ئێستاو داهاتویەتی کە دەلالەت لەخواست و ئامانجەکانی ئەو کۆمەلە ئەکات»[1] یەکێك لەو مەرجانەی بوونی نەتەوە بوونی سامانی کەلەپورەکەیەتی و نەبونی کەلەپور بـەشێوەی ڕەسـەنایـەتی نـەبوونی نـەتـەوەیـە ، کـەلەپـوری نـەتـەوە لەڕوی واتـاو تێگەیشتنی و ئەتنۆلۆژیاوە ئەکرێ بەسێ بەشەوە :-

1 - کەلەپوری سەرزاری .
2 - کەلەپوری میللی .
3 - گێڕانەوە یاخود بیستنی لەگەلێکەوە بۆ گەلێکی تر .

کەلەپوری سەرزارەی و کەلەپـوری میللی و گێڕانـەوە ، ئەمڕۆ لە زۆربـەی زۆری وڵاتانـدا زاراوەی فۆلکلۆریـان بۆ بـەکارئـەهێنن بۆ یـەکەم جـار لەڕوی مێژوی یـەوە زاراوەی فۆلکلۆر[2] لە کۆنگرەی «ئەرنیهایم ـ Arnhem» لە هۆلەنـدە ساڵی 1955دا دانی پیانراوە زانای ئینگلیزی «ولیەم تۆماس» لە سـاڵی 1846دا ئەم ووشەیەی وەك زانستێك بەکارهێناوە[3] بەتایبەتی لە نامەیەکدا کە بۆگۆڤاری «ذی ئاثینۆم» «The Athenaeum»ی ناردبوو گەلێ لایەنی گرنگی فۆلکلۆری ڕون کـردۆتەوەو لەگـەل گرنگی بەکارهێنـانی ئەم زاراوەیـە فۆلکلۆری پێنـاسە کـردووە وەك زانستێك کە بریتی یە لە باوەڕی پوچ ، ئەفسانە ، داب و نەریتی کـۆن کە لەنـاو هەمـوو میللەتێکدا بـلاو بـۆتـەوە ، گـۆرانی سەرزارەکی پەندو قسەی ئەستەقە .

ولیم تـۆماس فـۆلکلۆری لەگەل ئـەتنۆگـرافیـا تێکـەل کردووە . ئەم تێکەل کردنە بۆتە هۆی دروستکردنی کێشەیەکی زۆر لەو وڵاتانەی کە فۆلکلۆریـان بە کـەلەپوری سـەرزاری دائەنێن ئەگینا پێش ئەم دان نانە بەزاراوەی فۆلکلۆردا وشەی فۆلکلۆر هەبووەو مێژویەکی کونیشی هەیە) تەنانەت هەندێ لە زانـایـان دەلێن زاراوەی فـۆلکلۆر وەرگێـڕانی ووشـەیـەکی ئـەلەمانی یـە کە «فـولکسکندە»ی پێ دەلێن . بـۆ یەکـەم جار لەلایـەن زانـای ئـەلەمـانـی «ریبـل[4] Riel»ەوە لە سـالی «1806 - 1808»دا بـەکارهـاتووە . وڵاتـانی ئەسکـەندنـافیا[5] لەڕووی بایەخدان بە فۆلکلۆرو زانستی فۆلکلۆرەوە لە ڕیـزی پێشەوەی میللەتان ئەژمێردرێن چونکە گرنگی یەکی زۆریان دا بە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەو هەلسەنگاندنی هەموو بابەتەکانی فۆلکلۆرداوە . لەم ڕووەوە «برونر Brunner»ی ئەلەمانی دەلێ : فۆلکسکندە زانستێکە توێـژینەوەی ئـەدەبی سەرزاری گـەل ئەکات یاخود یـەکێکی وەکو شفیتـرنگ[6] دەلێ : فـۆلکسکندە توێژینەوەی ژیانی جوتیارە ئەلەمانەکان و کەلەپوری سەرزاری گەل ئەکات» .

شـایانی بـاسە بـە پێی ئەو دوو پێنـاسەی سـەرەوە لەشیکردنەوەی زاراوەی فۆلکلۆردا ووشەی «گەل» «سەرزار» بەدی ئەکرێ ئەمەش ئەوە ئەگەیـەنێ کە فـۆلکلۆر لە وڵاتە ئەسکەندنافیەکاندا بە کەلەپورە سەرزاری یەکـە ئەوترێ کە دەماو دەم ئەگێڕێتەوەو خـاوەنەکـەی دیارنی یـە ... بەلام لە وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا ئەم زاراوەیە ناوەڕۆکێکی گەلێ فراوانی هەیەو هەرکەلەپورە سەرزاری یەکە ناگرێتەوە بـەلکو فۆلکلۆر هەموو لایەنێکی هـونەری میللیش ئـەگرێتـەوە وەکو «هۆنراوە ـ مۆسیقا ـ شایی ـ یاری ـ نەخش و نیگار ـ داب و نەریت ـ باوەڕی پووپوچ»[7] .

لەوڵاتە سۆشیالیستەکاندا بۆ ئەم زاراوە یە «شاکاری شیعـری سەرزای میللی یـاخود «جـوانکاری شیعـری گەل» «فۆلکلۆر»ەی پێ دەلێن ...

گـەل ئەو شـاکـارەی دروست کـردووەو لەسـەرووی هەموانەوە چینی زەحمەت کێش کەواتە لێرەوە گەیشتینە ئەوە کە لەوڵاتە سۆشیالیستەکاندا فۆلکلۆر هەموو هونەرێکی میللی ناگرێتەوە بەلکو بۆ هەر بابەتێك زاراوەی تایبەتی بەکار ئەهێنن وەك بـۆ مـۆسیقـای خـەلکی زاراوەی مـۆسیقـای میـللی بـەکـارئـەهێنـن .. بـابـەتـەکـانی فـۆلکـلۆر لە وڵاتـە سۆشیالیستەکاندا بریتین لە (پەندو قسەی ئەستەق ، گۆرانی بە هەموو بەشەکانیـەوە ، ئەفسـانە ، مـەلحەمـە ، بلینا = قەسیدەی شیعری درێژ ، چیرۆك بە هەموو بـەشەکـانیەوە ، حیکـایەت ، لاوانـدنەوە ، دەستگـرتنەوە ، گـاڵتەو گـەپ ، مەتەل ، نوشتە ، درامای میللی) ، وەئەوەی ئـاشکرایـە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر گەلێ زاراوە بۆ فۆلکلۆر بەکـارهێزاوە وەکـو «سەرزاری میللی» یاخـود «هۆنـراوەی میللی» یا «هـۆنراوەی سەرزاری خولقێنەری میللی» .

بەجێترین زاراوەی فـۆلکلۆر دوای شۆڕشی ئـۆکتۆبـەر زاراوەی «شـاکاری شیعـری سەرزاری» یـاخـود شـاکـاری «خولقێنەری میللی یا «فۆلکلۆر» یان بەکارهێناوە وەلەم قۆناغەدا شاکاری سەرزاری نوێ کە شێوەیەکی کۆمەلی «هەرەوەزی» وەرگرتبوو وەك «گۆرانی جەماوەر شێوەیـەکی تری وەرگـرت سێبەیتی ، حیکایەتی سەرزارەکی سـەری هەلدا وەزۆربـەی زۆری گۆرانی یە «بۆنە میللی یەکان ـ المراسیم الشعبیة»و پیـا هەلخوێندن و شیعری ئاینی بەرەو کزی دەڕۆیشت[8] .

لەڕۆژ هـەلاتیشدا بـۆ ئەم زاراوەیـە «زانیـاری گـەل» کەلەپوری گەل» ـ یاخود «فۆلکلۆر» بەکار ئـەهێنن . لە سەر هەمان ڕێبازکە «ولیم تۆماس» گرتبووی ، واتە ئەم ڕێبازە هەمان ڕێبازە کە لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا فۆلکلۆرو ئەتنۆگرافیایان تێکەل کردووە .

لە عیراقیشدا فۆلکلۆر یا «التراث الشعبي» بەکارئەهێنن[9] زۆربـەی زۆری فۆلکلۆر نـاسەکـان کـە لە زانستی فـۆلکلۆر کۆڵیونەتەوە گەیشتونەتە ئەنجامێـك هەنـدێکیان فـۆلکلۆریان کردووە بە ئەدەبێکی سەرزارو بەستویانە بە کۆمەلێ خەلکەوە لە شێوەی سەر زاری یاخود نووسراودا ، هـەندێکی تـر هونـەرە میللی یەکانیان گرتووەو بەشێکی تر یشیان کەلەپوری میللی یان بەکارهێناوە کەواتە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە هەروەك ووتمان بێبەش نی یە لە ووشەی «میللی» یاخود «گەل» لەم بـارەیەوە مـەکسیم گـۆرگی دەلێ : «فـۆلکلۆر هي گـەلەو لەسـەروو هـەموویـانەوە چینی ڕەنجـدەر» لە لێکۆڵینـەوەی فـۆلکلۆردا پێـویستە ئـەو کەسـە شارەزایی یـەکی تـەواوی لەمێـژووی کۆمەلایەتی و زانستی ئەدەب و مێژوو تیووری ئەدەب و ڕەخنەو زانستی زماندا هەبێ .

یەکەم هەوڵدانی لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر ئـەگەڕێتـەوە بۆ پێش دەرکـەوتنی ڕۆمـانسیـەت و سـەردەمی دەرکـەوتنی ڕۆمانسیەت کە هەستی نەتەوەیی لە گەشەسەندنـا بوو دان بەبونی نەتەوەیی دائەنرا . زانایان بۆ یەکـەم جار دەستیـان بەکۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی بەشەکانی فۆلکلۆر لەسەر بناغەی

مجوانی ناسی کرد زانایانی ئەلەمانیا یەکەم کەس بوون کە ئەم ڕێبازەیان گرت بەتایبەتی یەکێکی وەکو «شیلینگ» و براکەی شلیگیل» کە بەپسپۆڕو ڕابەری قوتابخانەی «میفەلۆژی» دائەنرێن . ئەم دوو برایە یەکەم جار دەستیان بە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەفسانەکرد ، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە کەیاندا ئەوەیان دەرخست کە «هەموو ژانرە جیاوازی‌یەکانی فۆلکلۆر سەرەتایی بۆ ئەفسانە ئەگەڕێتەوە»[11] هەروەها ئەوەشیان سەلماند کە «لەناو هۆنراوەدا ئەتوانرێ ئەفسانە بدۆزرێتەوە»[12] هەر بۆیە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا پەنایان بردە بەر دیاردەی زمانەوانی‌و توانیان زاراوە زمانیەکانیان بکەنە بنچینەی حیکایەتی خەرافی . تیورەکانی شیلنگ لە ئەڵەمانیا زۆر پەرەی سەندو چەندەها کەسی‌تر ڕێڕەوی ئەم قوتابخانەیان گرت بەتایبەتی قوتابیەکانی «یاکوب گریم 1785 — 1863» و «د . فیلهم گریم 1787 — 1859» دەستیان بەکۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەفسانەی ئەڵەمانی[13] کرد . ئەم دوبرایە خۆیان بەکۆکردنەوەی گۆرانی ئەڵەمانی‌و ئەفسانە خەریك کرد پاشان لە ڕێگای ئەو تێکستانەوە دەستیان بە توێژینەوەی زمانی میللی ئەڵەمانی کرد لە ئەنجامیشدا توانیان فەرهەنگێك دابنێن‌و توانیان مێژووی زمانی ئەڵەمانی‌و ڕێزمان‌و چیرۆك‌و داب‌و نەریت‌و پەندو قسەی نەستەق‌و یاساو دەستوری کۆنی ئەڵەمانی‌و خاسیەتی نەتەوەیی گەلی ئەڵەمانی لە ئەفسانەو گۆرانی‌یەکاندا بدۆزنەوە . لەکاتێکدا «یاکوب گریم» دەستی کرد بە بەراورد کردنی ئەفسانە میللی‌یەکان لەگەڵ ئەفسانەی ئەڵەمانیا توانی گەلێ کتێب دانێ وەکو حیکایەتی منال‌و خێزانی ئەڵەمانیا 1812 — 1845و «ئەفسانەی ئەڵەمانی 1830» و «حیکایەتی ئەڵەمانی» بە ئەنجامی ئەم کارانەی ئەوەی سەلماند مێژوی ئەم ئەفسانانە بۆ مێژویەکی کۆنی ئایینی بگەڕێننەوە دوا بە دوای ئەم دوبرایە لەئەلەمانیا «شفارتز ، کۆب جانهارت» دەرکەوتن ئەمانە زیاتر لە ئەفسانەیان کۆڵیەوە گرنگیان بە ناوەرۆکی ئەفسانەی گەلانی هیندو ئەوروپی داو گەلێ لێکۆڵینەوەی تازەیان خستە ڕوو وەهەریەکەیان ڕای تایبەتی خۆیان لە بارەی ئەفسانەوە دەرخست یەکێکی وەکو «کون» توانی لە ڕێگەی بناغەی زانستی زمانەوە ئەفسانە بدۆزێتەوەو کتێبێکی دانا بە ناوی «ووشەی ئاگرو شەرابی خوایی» لێرەدا باسی ئەفسانەی پرۆمیشیوسی یۆنانی کردووە کە چۆن بە ڕێگەی پرۆمیشیوسەوە ئاگر کەوتۆتە سەرزەوی .. ووشەی پرۆمیشیوسی گەڕاندۆتەوە بۆ کۆنترین ووشەی سانسکریتی .. پاشان ئەوەی دەرخست کە هەموو ڕەشەباو هەورە تریشقەو هەور ئەمانە لەئەفسانەدا هەیە .. ئەمە جگە لە پرۆمیشیوس‌و ئەفسانەی ترازیدیای یۆنانی کە یۆنانیەکان بە باپیرە گەورەی خۆیانی دادەنێن‌و پوختەی ئەفسانەکە ئەوەیە پرۆمیشیوس پارچەیەك لە ڕۆژی لەگەڵ خۆیدا هێناو ئەم ڕۆژە لە لایەن خاوەن بیرەکانەوە بەچەند شێوەیەك لێك ئەدرایەوە بەشێکیان دەیانگوت ئەو شێوەیە کە ئاینی ئاسمانییەکان «ئادەم» خواردی‌و لە بەهەشت دەرکراوە ، هەندێکی‌تر بەوێنەی «زانیاری» دائەنێن .. ئەفسانەکە ئەلێ : «زیوس»ی خوداوەندی گەورەی یونان لە «پرۆمیشیوس» تووڕە بوو چونکە پارچە ڕۆژەکەی دزیبوو بەلام هەندێك ئەڵێن : زیوس خۆی لە هەموو شت زیاتر لە «زانیاری» ئەترسا چونکە ئادەمیزاد وریا دەکاتەوەو وایان لێ دەکا لێ‌ی یاخی ببن ، بۆیە «زیوس» فەرمانی بە «هیڤایستوس»ی خوای ئاسنگەرانی یۆنان دانا لە جێگای قەفقاس بە بەردێکی‌دا چەسپیوەوە ببیەستێتەوەو بزمار بەدەست‌و قاچیدا بکوتێ .. پاشان زیوس هەموو ڕۆژ ـ هەڵۆ ـ یەکی ئەنارد کە بەدرێژایی ڕۆژ جگەری ـ پرۆمیشیوس ـ ی ئیەخواردو بەشەو بەجێ‌ی ئەهێشت‌و جگەر لە خۆیەوە پەیدا ئەبۆوە .. سەر لە نوێ ـ هەڵۆ کە دەستی دەکردەوە بە خواردنی جگەرەکەی ـ پرۆمیشیوس ـ تا لە ئەنجامدا قارەمانێك بەناوی «هەرقل» پەیدابوو توانی پرۆمیشیوس ڕزگار بکات‌و تیرێکی نابە هەڵۆکەوە[14] .

ـ شفارتز ـ یش لە کتێبەکەیدا «ڕیشەی ئەفسانە» توانی هەمان ڕونکردنەوە بسەلمێنێ کە هەموو ڕەشەبایەك بابەتێکی سەرەکی‌یە لە ئەفسانەو هەمیشە کێشەیەکیش لە نێوان ڕوناکی‌و تاریکی‌دا هەیە» .

هەروەها هەڵگری ڕێبازی قوتابخانەی میفەلۆژی لە ئینگلترە «ماکس موڵر» بوو . موللر سەرهەڵدانی ئەفسانەی ناو ناوە «نەخۆشی زمان» مەبەستی لەمە ئەو شێواوی‌و ڕسکانەیە کە لە ڕیشەی ووشەکەدا هەیەو مرۆڤی سەرەتایی بە تایبەتی باپیرانی گەلانی هیندو ئەوروپی سەرەتا بیرەکانیان بە ووشە دەبڕیوەو نەیانتوانیوە بیرێکی سادە دەربڕن‌و هەموو ووشەیەکیان بۆ زمانی سانسکریتی گەڕانەوتەوە کە کۆنترین زمانە .

ئەم کارانەی ماکس موللر لە ڕووی زمانەوانیەوە گەلێ

هەڵەیان تیابووە چونکە موللر لە سنورێکی زور تەسك ڕاکانی بڕیوە لەکاتی بەراوردکاریا ئەفسانەکانیشی بە شێوەیەکی تەسك گرتووە .

بەڵام لە ڕوسیادا هەر لە کۆتایی سەدەی هەژدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە دەست کرا بە لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر ، ڕابەرانی ئەم ڕێبازەش «بۆسلاییێف ، ئەفانا سیێف پریژوف ، خودیا کۆف ، میللر» بووە[15] لەم ڕووەوە ئازادۆفسکی دەڵێ : ئەم زانایانە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا دوو ڕێچکەیان گرتبوو ڕێچکەی بورجوازی لیبرالی وەکو ـ بۆسلاییف ـ ئەفاناسیف . ڕێچکەی یاکۆف ـ پریژۆف، ئەمانە لە ناو بەرهەمەکانیاندا چەندەها بیری جۆراو جۆریان دەربڕیووە .

ئاشکرایە کارەکانی ئەم زانایانە هەر یەکە بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کردویانە توانیویانە گەڵ ڕوی ئەفسانە بخەنە ڕوو هەر وەك چۆن «یاکوب گریم» ویراسەی زمانی ئەڵەمانی کرد ، زاناکانی ئەم ڕێبازەی ڕوسیاش دەستیان بە لێکۆڵینەوەی زمانی ڕوسی لە ڕێگەی ئەو ئەفسانانەی کە کۆیان کردبونەوە کرد یەکێکی وەکو «بوسلاییف» توانی لە کتێبەکەیدا «وتاری مێژوویی» ڕیشەی شیعرو ئەفسانە بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی زەمان بگەڕێنێتەوە بەڵام «ئەفاناسییف» لە ڕێگەی ئەو تێکستانەی کەدەربارەی «خوو ڕەوشت و نەریتی جۆراوجۆر» کۆی کردبونەوە لە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەکەیدا توانی کێشەی ڕوناکی و تاریکی لە چیرۆك و گۆرانی و ئەفسانەو پەنددا دیاری بکات .

ئەوەی لەم «قوتابخانە میفەلۆژی» یەدا ئاشکرایە ئەوەیە کە هەرزانایەك لە ڕێگەی کارەکەیەوە توانیویە مێژووی کۆنی گەلەکەی بخاتە ڕوو . لە ئەنجامی بەراوردکاری ئەفسانە بە ئەفسانەو گۆرانی گەلانەوە تیئۆرێکی تازە دەرکەوت بەناونیشانی «تیئۆری لێوەرگرتن» یاخود «تیئۆری ڕۆژهەلات» ، ئەوەبوو لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەوروپا گۆڕانێکی گەورە لە فۆلکلۆردا ڕویدا . بەهۆی ئەو گۆڕان و پێشکەوتنەی بەهۆی پەرەسەندنی بازرگانی و پیشەسازی ڕویدابوو هۆی دەرکەوتنی گەلێ بابەتی زانستی و دۆزینەوەی چەندەها دیاردەی زمان و ئاین و هونراوە ئەمانە دەستیان بە دۆزینەوەی ئەو لەیەك چوونەی کە لە ژیانی گەلانی ئەوروپاو ڕۆژهەلاتا ئەبینرێ کرد . ئەمەش لە ڕێگەی بەشەکانی فۆلکلۆرەوە بوو . بۆ نمونە زۆر جار چیرۆکی کۆن لای زۆربەی زۆری گەلان لەیەك ئەکات کەئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك ئە لێرەدا لێدوان لەو هۆیانە درێژە بەباسەکە ئەدات .

یەکەم کەس هەڵگری ئەم ڕێبازە «بەنەخی» ئەڵەمانی بوو کە توانی حیکایەتی میللی ڕۆژ هەلات وەرگێڕیو پاشان توانی ئەو لێکچوونە بدۆزێتەوە کە لە حیکایەتی سانسکریتی و حیکایەتی ئەوروپیدا هەیە . «بەنەخی» ئەوەی خستۆتە ڕوو کە لێکچوونی ئەم حیکایەتانە ناگەڕێتەوە بۆ خزمایەتی ئەم میللەتانە ، بەڵکو ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندییە مێژوویی و شارستانیای کە هەیە ئەمەش لە ڕێگەی وەرگرتنەوە بووە ، ڕۆژهەلات کارێکی زۆری کردۆتە سەر ئەوروپای ڕۆژئاوا بەتایبەتی لە ڕووی ئەفسانەوە ئەم لێوەرگرتنە بووە سەر هەڵدانی «تیۆری ڕۆژهەلاتی» .

یەکەم کارتێکردنی ڕۆژهەلات لە ئەوروپا لە ڕێگەی دەریای سپییەوە بووەو پاشان لە ڕێگەی ئیسپانیاوە . دووەم ڕێگەش لە ڕێگەی عەرەبەکانەوە بوو کە لە ناوەڕاستی ئاسیاو ئاسیای بچوك «تورکیا» لە ڕێگەی بیزەنتی و جزیرەی بلقانەوە بۆ ئەوروپا چووە .. لە ئەسپانیادا عەرەبەکان و عیبرییەکان توانیان گەلێ حیکایەت وەرگێڕنە سەر زمانی لاتینی و پاشان ئەم وەرگێڕانە زۆر بلاوبۆوە بۆ گەلێ زمانی تروەك «فەرەنسی ـ ئیتالی ـ ئەڵەمانی ـ پۆلۆنی» . لە ڕوسیادا ـ پاپین ـ لە کتێبەکەیدا بە ناو نیشانی «مێژوی ئەدەبی حیکایەتی ڕوس 1858» توانی پەیوەندی ئەدەبی کۆنی ڕوسی بە ئەدەبی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتەوە ببەستێ . لەم تیۆرەیەدا چەندەها ڕەخنە پەیدابوو لەلایەن «بوسلاییف ، میللر ، شفانزر»ەوە ئەمانە توانیان یەکێکی وەکو «ستاسۆف» تاوانباربکەن بەوەی کەوتی : «بلیخای ڕوسی لە بنچینەدا هی گەلی ڕوسی نییە بەڵکو لە ڕۆژهەلاتەوە وەرگێڕاوە» .

هەروەها ڕەخنەیەکی زۆر لە ستاسۆف گیرا بەتایبەتی لە کتێبەکەیدا بەناوی «یروسلان لازاریف» چونکە ئەم حیکایەتەی بە «شانامەی فیردەوسی» بەراورد کردوو وتی : ئەم حیکایەتە لە «ڕۆژهەلات بەتایبەتی لە فارسییەوە وەرگیراوە» ئەم ڕایەی ستاسۆف دوور بوو لە ڕاستییەوە چونکە ئەم حیکایەتە واتە «یروسلان لازاریف» حیکایەتێکی ڕەسەنی ڕوسییە .

گەورەترین نوێنەری «تیئۆری لێوەرگرتن» لە ڕوسیادا ڤیسلۆفسکی بوو کە جێگایەکی تایبەتی لە مێژوی کۆنو نوێی فۆلکلۆری ڕووسیدا گرتو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو حیکایەتانەی هاتۆنە ناو حیکایەتی ڕوسیەوە هەمووی ڕێگەی «گەشتەوە» بوو کە لە هندیەوە بەرەو ئەوروپا هاتووە .

هەروەها لەئینگلتەرە لە ژێر کارتێکردنی ڕێبازی (ڕۆمانتسی) کارەکانی «ڕیشارد دورسون» گرنگی پێدرا بەتایبەتی بە هۆی هێزی داگیرکردنەوەو هەر لەسالی 1813 تا سەرەتای سەدەی بیستەم ئینگلتەرە زۆربەی وولاتانی ئاسیاو ئەفەریقاو ڕۆژهەلاتی نزیکی داگیر کردبوو ، وەزۆربەی زۆری سەربازەکان لەم وولاتانەدا بلاوبوبونەوە لە ئەنجامی ئەو مانەویەیاندا گەلێ سودیان وەرگرتو کەلەپورەکەیان دەولەمەندکرد بەتایبەتی فۆلکلۆر . ئەنجامی ئەم پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەو وەرگرتنە توانرا سالی 1878 کۆمەلگایەکی فۆلکلۆری بکەنەوە کەگرنگی بەکۆکردنەوەو لێکۆلینەوەی فۆلکلۆر بدەن یەکێکی وەکو «میللر ، کۆکسن ، لەم مەیدانەدا کەلکێکی زۆریان بەم کۆمەلگایەوە بەخشی .

سالانی 60 — 70ی سەدەی نۆزدەهەم بووە هۆی سەرهەلدانی گەلێ ڕێبازو قوتابخانەی نوێ لە مێژووی زانستی فۆلکلۆردا بەتایبەتی «قوتابخانەی ئەنثۆپۆلۆژی» ڕابەرانی ئەم قوتابخانەیە هەولی ئەوەیان ئەدا کە ئەو دیاردەیە لە ڕوی لەیەکچوونی فۆلکلۆری گەلانو باری بایلۆژیو یەکێتی ڕەگەزی مرۆڤایەتیو باری دەرونی گەلو دەستورو یاسای کۆن ئاشکرا بکەن .

ڕابەرانی ئەم قوتابخانەیە لە ئینگلتەرە «تایلور» وە لە «اسکتلندە» «ئەندرو لانگ» بوو . تایلۆر لە کۆتایی سالانی «60»ی سەدەی نۆزدەهەم کتێبێکی بەناوی «لێکۆلینەوەی مێژوی مرۆڤی کۆن» نووسی لەم کتێبەدا «تایلۆر» باسی ڕوناکبیری مرۆڤایەتی ئەکا لەسەرەتاوەو پاشان لەکتێبی «سەرەتای ڕو ناکبیری» دەیەوێ ئەو ڕایە بسەلمێنێ کە کە لێکچونێکی زۆر لە ڕوی ژیانو خووڕەوشتو جوانکاریو هەست کردنی ئاینو هۆنراوە لە ناو میللەتاندا هەیە . ئەم ڕایە لەلایەن هەندێ زاناو توێژەرەوەی ترەوە بەر پەرچ درایەوە بەوەی کە زۆربەی تێگەیشتنی حیکایەتی ئاینیو شیعری گەلانو بیری مرۆڤ بارێکی تایبەتی دروست ئەکا «فرۆید» توانی لەگە لێک

چیرۆكو ئەفسانەی کۆن بکۆلێتەوەو ئەنجامیش پەرەگرافێکی دانا بۆشی کردنەوەی دەرونی مرۆڤ . هەروەها بۆ نمونە لە ئەفسانەی یۆنانی «ئۆدیب»دا ئەوە دەرئەخات کە هێمای ڕاکێشانی ڕەگەز زۆر جار لە نێوان منالو دایکدا ڕووی داوە کەفتینی منال بۆ باوكبووەو ئەمەش بۆیە ناونرا «گرێی ئۆدیب» .

بەهاتنی «فریزەر» گۆڕانێکی تازە ڕویداو چەندەها ڕای تازە دروست بوو لە کارە بەناو بانگەکانیدا . لە کارەکانی «فریزەر» دا ئەوە دەرئەکەوێ کە هەموو مرۆڤێك بیرێکی هەیەو یاسای پێشکەوتنی مرۆڤ هەمووی یەکەو هەموو مرۆڤێك بەچەند هەنگاوێکدا تێئەپەڕیو بەهەنگاوی شارستانیدا تێپەڕیوەو تارادەیەکیش پارێزگاری هەنگاوەکانی پێشوی کردووە . لەڕوسیاشدا زانایانی وەکو «کیریچنیکوڤ ڤیسولۆفسکی» بەڕابەری ئەم قوتابخانەیە ناسراونو بەتایبەتی یەکێکی وەکو «ڤیسولۆفسکی 1837 — 1906» خاوەنی گەلێ بەرهەمە لەیەکێ لە کارەکانیدا هەولێکی زۆریدا بۆتێگەیشتنی پاشماوە کۆنەکانی «یۆنانو ڕۆما» . فیسلۆفسکی گرنگی بەڕیشەی جۆرەکانی هۆنراوەدا بەتایبەتی «داستان لیریك دراما» لەم بەشە فۆلکلۆرانەدا ڕەگەزی ئاوازو شیعر دۆزراوەتەوە .

شایانی باسە بیرەکانی ئەم زانایانە شێوەیەکی میسالی «ئایدیالی» لێك ئەدرایەوەو لەلایەن ڕێبازە نوێ کەوە تووشی هەلەیەکی یەکجار گەورە بوو ... بەتایبەتی لە ڕێبازی «قوتابخانەی مێژوویی» دا ئەوە بوو یەکێکی وەك «فیسلۆفسکی» بەلێکۆلینەوەی کارەکانی توانی مێژووی رووس ببەستێت بەفۆلکلۆرەوەو سودێکی گەورەی لە داستان وەرگرت .

لە لایەکیتریشەوە هەندێکی وەکو مارکۆڤ ـ سۆکۆلۆڤ ـ ئاومان» خۆیان بەلێکۆلینەوەی داستان ـ وە خەریك کردو توانیان کارەکانیان لەگەل واقعیدا بگونجێن بەلام وەك سەرچاوەیەك ئەم قوتابخانەیە گرنگی بەمێژوو ـ داوە بۆ نموونە بەهۆی نیشانەکانی پرسیارەوە «کەی ، لەکوێ» زانایان توانیویانە بگەنە ئەنجامی کارەکانیانو روداوی سیاسیو کۆمەلایەتی بخەنە ڕوو .

لەم قوتابخانەیەدا کارەکانی «میللر» جێگای سەرنجە کە هەموو مەسەلەیەکی فۆلکلۆری لەڕووی ناوەڕۆکو ڕوخسارەوە ڕوون کردوتەوە بەتایبەتی لە «بلینای» ڕووسیدا ئەوەی خستوتە ڕوو کە کۆچەرەکان ڕۆڵێکی گەورەیان لە گۆرانیو مۆسیقادا بینیوە .

ئەم قوتابخانەیەش بێ خەوش نەبووە یەکێك لەو ڕەخنانەی لەم قوتابخانەیە گیران ئەوەیە کە لە ڕووی تیۆری کارکردنەوە نەیتوانیوە بگاتە ئەنجامێکو بنچینەیەکی ئەرستۆکراتی هەبووەو لە «جوانکاری» شیعری میللی نەگەیشتووە ، ئەوەی لەم قوتابخانەیەدا بەدی ئەکرێ ئەوەیە کە زۆربەی زانایان گرنگیان بە «داستان ملحمة» داوە .. نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە فینلندییەکان لە ڕووی کۆکردنەوەی فۆلکلۆر بەتایبەتی مەلحەمەی میللییەوە . هەنگاوێکی گەلێ گەورەیان ناوە .. بەتایبەتی مەلحەمەی «کالیفالا» کە بە سەرەتای ئەدەبی فینلندی ئەژمێرێ .

کالیفالا کۆمەڵە چیرۆکێکی شیعرییە ، یەکەم کەس کە هەوڵی کۆ کردنەوەی ئەم بەشە گرنگەیدا «ئەلیاس لوفردن»[15] بوو کە کارەکانی بۆ مێژوویەکی زۆر کۆنی فینلندی ئەگەڕێتەوە .. گەلی فینلندە شانازییەکی زۆر بە مێژووی فینلندەوە ئەکات ، ئەمەش لە ڕێگەی فۆلکلۆرەکەیانەوە ★ بۆیە مەکسیم گۆرکی جوانی ووتوە کە دەڵێ «گەورەیی مێژووی میللەت نازانرێ هەتا فۆلکلۆرەکەی نەزانرێ»[16] لەگەڵ سەر هەڵدانی قوتابخانەی «شۆڕش ـ گێری دیموکراسی» لە وولاتە سۆشیالیستەکاندا فۆلکلۆر وەك زانستێك لە ئەدەب جیاکرایەوە .

یەکەم هەڵگری ئەم ڕێبازە «بلینسکی»★ بوو .. کە بە چاوێکی مەوزوعییەوە ڕوانییە کە لەپووری میللیو ئەوەی دەرخست کە فۆلکلۆر ڕەنگدانەوەی باری کۆمەلایەتییە شۆڕشگێڕییە لەیەکێ لەبەرهەمەکانی «ئێستاتیکای میللی»دا بلینسکی کێشەیەکی زۆری تووش بوو لەگەڵ ئەوانەی کە بانگەوازی ، ڕەگەز پەرستی سلافیان ئەکرد .

چونکە ئەم هیچ شتێکی بەتێڕوانینێکی عاتفیانە وەرنەگرتبوو . ئەوەی شایانی باسە لەم قوتابخانەیەدا دوو جۆرە لایەنگیری هەبوو یەکێکیان ڕێبازی لیبرالی کە لەگەڵ بیرەکانی ڕۆژئاوا تێکەڵ بوو بوو .. ئەویتریان ڕێبازی شۆڕشگێڕیو نوێنەرەکانی «دۆبرۆلۆبۆف چیرینشیفسکی» بوو ئەمانە هێرشێکی تیژیان کردە سەر لیبرالییەکانو کارێکی گرنگیان لە جەماوەر کرد وەهەموو جوانکارییە میللییەکانیان لە نوسراوەکانیاندا ڕەنگی ئەدایەوە یەکێکی وەکو دۆبرۆلۆبۆف ئەوەی سەلماند کە لە فۆلکلۆرا یاسای چینایەتی کۆمەڵ بەدی ئەکرێ .

کەواتە لەگەڵ ڕەوتی گۆرانی سروشتو مرۆڤا فۆلکلۆریش لە گۆڕانو پێشکەوتنو پەرەسەندنو گەشەسەندنا بووەو زیاتر ئەدەبەسەر زارەکییەکەی گرتوتەوە تایلۆر گووتەنی :ـ فۆلکلۆر بابەتێکی سەر زارەکییە ئەوەیەك بۆنەوەیەکیتر ئەگێڕێتەوەو بەبێ ئەوەی ببەسترێت بەیەکێکی ناسراوەوە .. هەتا فۆلکلۆر ناسەکانیش دانیان بەم تەعریفە داناوەکە[17] :ـ

1 ـ فۆلکلۆر مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە .
2 ـ فۆلکلۆر ئەو پاشماوە هونەرییەیە کەدانەرەکەی نەناسراوەکییە .
3 ـ بوونی هەموو بارێکی کۆمەلایەتی فۆلکلۆر ڕەنگ ئەداتەوە .
4 ـ شێوەی دەربڕینو تێگەیشتنی فۆلکلۆر زۆر ئاسانە .
5 ـ لەبەر ئەوەی فۆلکلۆر هەمیشە لەسەرزارە توانای مانەوەو بەکارهێنانی ڕۆژانەی هەیە .
6 ـ هونەری سەرزاری خولقێنەر ، هونەرێکی واقعییە لە ناو جەرگەی کۆمەلا سەر هەڵ ئەدات .
7 ـ هەریەکە لەو بابەتە جیاوازانە لە ناو یەکدا ئەژیو بەکاردێت .

کەواتە گەیشتینە ئەوەی کە بڵێین فۆلکلۆر واتایەکی گەلێ فراوانی هەیەو دەلالەت لە دیاردەیەکی لاسایی کردنەوە ئەکات کە لە واقعدا ڕوو ئەدات[18] بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەم واتایە ڤان گنپ دەڵێ :ـ «فۆلکلۆر لێکۆلینەوەی هەموو ڕووداوێکی کەلەپووری میللییە» وەئەوەشی ڕوونکردوتەوە کە فۆلکلۆر بریتییە لە کەلەپوورێکی تێکەڵاوی جوتیارو ژیانی لادێو وێنەی باری پیشەسازیو شارستانیەت ، لەم ڕووانەوە توانیمان ئەوەش بسەلمێنین کەکۆنترین کەلەپووری میللی سەر زاری لەگەڵ مرۆڤا سەری هەڵداوەو بەهۆی ئەم ئەدەبەوە ئەتوانین سەردەمی ئابوریو ژیانی کۆمەلایەتی

ـکەین کە بەژێرخانی هەموو کارێکی ئەژمێری لە پێش خستنی ژیانە کۆمەلایەتی یەکەدا .

کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆری کوردیش بۆ یەکەم جار لەدەرەوەی وولات دەستی پێکرد واتە هەر لە کۆتایی سیوەی یەکەمو سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕوسیا بۆ یەکەم جار دەست بەلێکۆڵینەوەی زمانی کوردیو ـیالیکتەکانی کوردی کرا ئەویش لە ڕێگای کۆکردنەوەی تێکستی فۆلکلۆرەو بوو ، بەتایبەتی زانایانی ڕووسیو ئەرمەن وەك «ف ـ دیتیك ، خ ئابۆڤیان ، و لیرخ ، میللر ، ئاژابا یەگیزارەف» ئەمانە زیاتر بایەخیان بەکۆکردنەوەی ئەدەبی سەرزاری میللی کورد داوە ، بابەتی جیاوازی فۆلکلۆریان کۆکردۆتەوەو کەلەپووری کوردیان لەڕێگەی وەرگێرانەوە لە زمانی فەڕەنسی ئەلەمانی ، روسی ، گروزی ، ئەرمەنی ، ـەولەمەند کردووەو بەگەلان ناساندووە .

ئەگەر چاوێك بەکارەکانی «پیوتەر لیرخ» دابگێرین ئەبینین یەکەم کەس بوو لە روسیا فۆلکلۆری کوردی لە دەمی کوردەکانی ئەرمینیا کۆکردەوەو لە کتێبە بەناو بانگەکەیدا [لێکۆڵینەوە ـ دەربارەی کوردەکانی ئێرانو خالدییەکانی باپیرانیان] گەلێ تێکستی فۆلکلۆری تیا بلاو کردۆتەوە هیچ شتێك نەبووە کە پیوتەر لیرخ ئاگاداری نەبووبێ دەربارەی ئەم گەلە خاوەن فۆلکلۆرە بەرزە هەتا زانایانی وەکو «برووسێ ، بیولێنگ ، دورن ، اولنگ» لەئەتروحەکانیاندا دەست نیشانی کارەگرنگەکانی پیوتەر لیرخ یان کردووەو نووسیویانە :ـ هیچ گەشت کەرێك نەیتوانیوە لەو کاتەدا ئەوەندەی پ . لیرخ کاری گەورەو بەنرخ دەربارەی فۆلکلۆری کوردیو مێژوویان پێشکەش بکات .

پ . لیرخ یەکەم ئەوروپی بووە بەردەوام لەگەل گەلی کوردا ژیابێو تێکەلاو بووبێ لە بارەی «جوگراف ـ ئیتنۆگرافیو زمانەوانیو مێژووی گەلی کوردی» نووسیوە .

نووسینەکانی لێرخ هەمووی بە شێوەی کرمانجی ژوورووە بەتایبەتی شێوەی زازاو لە دەمی کوردەکانی «ماردین ـ جزیرێ ـ دەرسیم ـ موش ـ دیاربەکر ـ ئورفە ـ خارپوت ـ ئەرزەرووم» وەرگرتووە .

سالی 1836 — 1869 ئەلیکساندەر ژاپا ، قونسولی ڕووسی لە تورکیا .. لە ڕێگەی .. کاروباری دبلوماسییەوە لە ئەرزەڕووم دەستی کرد بەفێربوونی زمانی کوردی بە یارمەتی مەلا مەحموودی بایەزیدی کە کاتبێکی بەناو بانگی بووە ... ئەو ماوەیەی لە تورکیادا مایەوە گەلێ فۆلکلۆری کوردی کۆکردۆتەوەو توانی ئەرشیفی کۆڕی زانیای ڕووسیا بەتایبەتی نامەخانەی «سالیکوف شیررین» بەو کۆمەلە دەستنووسەی دەربارەی ئەدەبو زمانو فۆلکلۆرو ئەتنوگرافیای کورد دەولەمەند بکا ، بەشی مێژووی فیلۆلۆژیای کۆڕی زانیاری ڕوسیا لەسەر بڕیاری ن . ماریا بزی 1911 توانی یەکێك لە قوتابییە چالاکەکانی بمێرێتە ئەرمینیاکە «ئا . ئوربیلی» بوو بۆ کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردیو ئەرمەن . ئوربیلی ماوەی سێ مانگ لەناوچەی وان ، مەکسی مایەوەو گەلێ تێکستی فۆلکلۆری وەکو «حیکایەت ـ پەند ـ گۆرانی ـ مەتەڵ» کۆکردەوە کۆکردنەوەی بابەتەکانی فولکلۆر ب ەشێوەیەکی گشتی بۆ دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەگەڕێتەە ئەوەبوو زاناکانی سۆڤیەت گرنگییەکی چاکیان دابەکۆکردنەوە دوا لیژنەیەکی کارامەیان لە زانا کوردو ئەرمەنیەکان پێك هێناو ناردیانن بۆ دێهاتەکانی کوردەکانی ئەرمینیا بەتایبەتی سالانی 1931 — 1933, — 1934» .

لیژنەکەش لەم نووسەرانە پێك هاتبوو «جەردۆیە گەنجۆ ، ئاجییە جندی ، کارۆ زەکەریا» .

سەرۆکی لیژنەکەش «ئاستۆر خەجە تۆریان» بوو ئەم لیژنەیە بە ناوچەکانی (تالین) ئەپاران ، ڤانار ، شاپانی» . گەران . لە ئەریڤان دوو زانای کوردیان لە بیژنەکە هەلبژارد ئەویش «ئەمینی عەبدالو حاجیجندی» بوون ئەمانە توانیان کتێبێك دەربارەی فۆلکلۆری کوردی بلاو بکەنەوە واتە «حاجی جندیو ئەمینی عەبدال» توانیان لەسالی 1936 کتێبێکی فۆلکلۆری لە ژێر ناوی «فۆلکلۆرا کرمانج ـ یەریڤان 1936» دەربکەنو زۆربەی زۆری بابەتەکانی فۆلکلۆری کۆ بکەنەوە .. لێرەدا ئەوە ئاشکرا بوو کەزاراوەی فۆلکلۆر پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر زاراوەی ئەدەبی سەرزاری خەلکی بوو بەلام دوای شۆڕش کوردەکان هەمان ڕێڕەویان لەگەل ئەدەبی سەرزاری گەلی سۆڤیەتا گرت .

گرنگیدان بەفۆلکلۆرو زانستی فۆلکلۆری کوردی لە یەکیەتی سۆڤیەت لە باکۆو لێنگرادو مۆسکۆو یەریڤان لەلایەن سۆڤیەتییەکانو کوردەکانەوە بایەخێکی زۆری پێدراوەو لە هەموو ژانرەکانی فۆلکلۆریان کۆلیوەتەوەو هەندێکیان پلەی

بەرزی و دەخۆرایان لە بابەتێك لە بابەتەكانی فۆلكلۆردا وەرگرتووەو [19] گەلێ كادرو پسپۆڕیان پێگەیاندووە كە لێكۆڵینەوەی زانستی بكەیەننە چاپكرن[20] . شایانی باسە هەر لە نێوان سالانی (1935 — 1950) لەسەر زاری كوردی سۆڤیەت مامۆستا كوردۆییفی خۆی ژمارەیەك تێكستی فۆلكلۆری جۆراو جۆری تۆماركرد[21] ئەمەلەیەكیەتیلا سۆڤیەت بەلام لە ئەوروپا لە كۆتایی سەدەی هەژدەو سەدەی نۆزدە دەست بە كۆكردنەوەی فۆلكلۆری كوردی كرا ، ئەو بەرهەمە فۆلكلۆریانەی كە كۆیان ئەكردنەوە بریتی بوون لە بەشێك لە بەشەكانی فۆلكلۆرو بەناوی خۆیەوە ناو ئەنرا چ گۆرانی چ ئەفسانە پەندو قسەی نەستەق ، چیرۆكەو مەلحەمە .. هتد ..
بۆ نموونە : زانای سویسرەیی «ئەلبەرت سۆتسین» (1844 — 1896) بەهاوبەشی لەگەل ئیگین پریم دالە 1901 تاسالی 1903 لەسەر فەرمانی خاوەن شكۆ ئیمپراتۆری دەولەتی ئەلەمانی بۆ لێكۆڵینەوەی شێوەی موكری «ئوسكارمان» نێرایە ئێران لە ماوەی ماوەیەدا بەیارمەتی «مظفر الدین» شای قاجار توانی گەلێ بەیتی كوردی لە زای كوردەكانی ئەو ناوچەیە كۆبكاتەوە سالی 1906 — 1909 لەبەرلین توانی ئەو تێكستانە بەچاپ بگەیەنێ بەناوی «تحفه مظفرية»ی سەر رێنوسی كوردی» ـ ئەم تێكستانە بە پیتی عەرەبی و لاتینی و وەرگێرانی بۆ كوردی بلاوكردۆتەوە .. ئەم كارەی ئۆسكارمان كارێكی بێ هاوتایەو توانیویەتی سامانی فۆلكلۆری لە فەوتان رزگار بكاو بیكاتە كەرەسەیەكی یەكجار بەنرخ بۆ لێكۆڵینەوەی زمان و بەراوردی لەگەل رەوتی پێشكەوتن و سەردەمدا .

كەواتە تاكو ئێستا لە ئەوروپای رۆژ ئاوا كتێبێك دەرنەچووە هەموو بەشەكانی فۆلكلۆری كوردی گرتبێتەوەو كۆ كردنەوەی تێكستی فۆلكلۆری دراو زروف لەباری خوێندەواری بووە هۆی بایەخدان بە لێكۆڵینەوەی زمان و ئەدەب و مێژوو چاپ كردنی ئەو بەرهەمانە ئەوانەی خۆیان بە كۆكردنەوەی ئەم بابەتە خەریك كرد ئەگەڕێتەوە بۆ سالانی (1933 — 19938)[23] ئەگەر زیاتر وردبینەوە لەم بارە مەوزوعی یە لە بارەی گەلی كورد ، ئەبینی كوردستانی عێراق بووە مەلبەندی بزوتنەوەی رۆشنبیری بەتایبەتی دوای شۆڕشی چواردەی تەموز گۆڕانێكی گشتی لە ژیانی عێرا قدا بەهەموو نەتەوەو كەمایەتی یەكانەوە رویدا .

ئەدەب بەروخسارو ناوەڕۆك گۆڕا فۆلكلۆرو كەلەپوری نەتەوایەتی بوژایەوە گەلێ نووسەرو چیرۆك نووس و شاعیری لاو دەركەوتن گەلێك لێكۆڵینەوە لەم بابەتانە پەیدابوو .. گەلی مامۆستاو شارەزایانی كورد دلسۆزانە كەوتنە كۆكردنەوەو لێكۆڵینەوەی فۆلكلۆرو بابەتەكانی بۆ یەكەم جار ووشەی فۆلكلۆر وەك زانستێك هاتە ناو ئەدەبەوەو بۆ ئەدەبە سەرزاری یەكە بەكار هات كە هەموو بەشەكانی فۆلكلۆری گرتەوە ووشەی «فۆلكلۆر» یەكەمجار لەگۆڤاری «شەفەق»ی ژمارە دوو سالی یەك 1958 لە ژێرناو نیشانی «كوردو فۆلكلۆر» لەلایەن مارف بەرزنجی یەوە بلاوكرایەوە[24] گەلێ نووسەرو شارەزایان دوابە دوای سالی 1960وە بۆ زاراوەی فۆلكلۆر زۆر جار زاراوەی «شاكاری شیعری سەرزاری میللی»و «كورد دەلێ» یاخود «فۆلكلۆر» یان بەكار هێناوە .. بەلام ژانرەكانی فۆلكلۆر بۆ یەكەم جار لەلایەن محمد توفیق ووردی یەوە[25] لە كتێبێكدا بلاوكرایەوە .

شایانی باسە گەلێ ووتارو لێكۆڵینەوەو كتێب دەربارەی بەشەكانی فۆلكلۆری كوردی دەرچوون كە هەریەكە جێگای خۆی لە رووی مێژووی لێكۆڵینەوە یاخود كۆكردنەوە گرتووە[26] بەلام لەناو ئەو كارانەدا كەجێگای سەرنجی ئەو كتێبەی كە لە لایەن یەكێتی مامۆستایانی لقی هەولێرەوە لەژێر ناوی «سەرنجێك لە دەروازەی فۆلكلۆری كوردەوە»[27] بلاوكرایەوە شوێنێكی تایبەتی هەیە ئەوەی سەرنجی ئەم كتێبەدا بۆی دەرئەكەوێ ئەو بابەتانەی لەم كتێبەدا كۆكراوەتەوە هەر بریتی نی یە لە ئەدەبە سەرزاری یەكە بەلكو لەگەلی بابەتی «ئەنثوگرافی»دا تێكەل كراوە .

واتە جل و بەرگو قاپ و قاچاغ ، ویژە نیگار ـ یاری یەكان ـ سازو ئاواز ـ لەبەركردن و رازانەوە خۆراك ـ ئامێری دروست كەرو بەرهەم هێنەر ـ نەریتی كۆمەلایەتی ـ كاسەو كەوچك ـ تیمار كردن ـ باوەڕی كۆن ـ خانەسازی ـ راوو چەك ـ پیشەكان ـ كەل و پەلی ئاژەل ـ ئەستێرەوانی و كەش بۆ نموونە لەبەش دووەمدا بە ناوی «نیگار» ئەبنیین بەفۆلكلۆر دانراوە كە نیگار هەرچەندە كۆن بێت بەشێكە لە بەشەكانی هونەری میللی و فۆلكلۆر ئەدەبێكی سەرزاری یە بەلام نیگاری سەر بەرە سەر پۆپەشمین و حاجم و گۆرەوی و دیوارو بەرمال و مافور پانی بەرزو سینی و پەنجەرەوە بێجگە لە نیگار ئاوازەكانی سازییش بە فۆلكلۆریان داناوە وەكو «شمشال» تونەك ـ بلوێر ـ زوڕنا ـ بالەبان ـ تەپل ـ دوردگ (چەشنە

ته‌ميكه) ـ ده‌هۆل ـ كه‌ڕه‌نا» .

هه‌روه‌ها ئه‌وانه‌ی په‌یوه‌ندی به شتومه‌كی له‌به‌ر كردن‌و ... نه‌وه وه‌هه‌یه وه‌كو كه‌وا ـ كراس ـ وه‌ســال ـ كۆلوانـه ـ ...چك ـ سه‌رپۆش ـ فیست ـ سه‌رو پێچ‌و سوخمه‌ی قۆلدار ـ ســوخمه‌ی بێ قـۆڵ ـ پشتێن‌و ئـاوه‌ل كـراس ـ گـۆره‌وی ـ جرشێوه ـ تاری بوكێنی بـه‌نه‌خـۆین ـ كه‌وشی پـانی به‌رز ـ كلاش ـ سه‌ڵتـه ـ سوخمـه . ئه‌وانـه‌ی بۆ ڕازانـه‌وه به‌كـار هێنـراوه ـ قشڵ ـ كـرمه‌ك ـ پـه‌روانـه ـ لاگێـره ـ دوگمـه‌و ...ولاب ـ لوته‌وانه ـ غه‌زێم ـ بازی به‌نگ ـ ژێرچه‌مه ـ ئه‌لقه‌و قولاپ ـ لووله‌و زنجیر ـ بازان ـ گۆیی ده‌ست ـ پشته‌سه‌ره ـ سه‌رو په‌رچه‌م ـ گوڵ ـ گواره ـ حیل‌و میخه‌ك ـ عه‌شق‌به‌ند ـ كۆبه‌رۆك ـ گه‌ردانه ـ كورته پۆبله ـ گێل گێله ـ تاس‌و كلاو ـ هه‌یاسه ـ كه‌مه‌ره ـ قاپ قورئان ـ ده‌رزیله ـ كلاوزه‌ڕ .

هــه‌روه‌ها ئـارایش‌و خۆ جـوان كـردنی ژنـانیش یـان به‌كارهێناوه وه‌كو خه‌نه‌و وه‌سمه ـ سوراو سپیاو ـ نیمه‌شور ـ سابونی سه‌ركه‌ف ـ لفكه لوله‌كه ـ گڵه سه‌ر ـ كل‌و كـل‌تور ـ كولاو ـ خاڵ كوتان ـ پرچ هۆنینه‌وه ـ ملوانكه‌ی بـۆن‌و به‌رام ...ار ـ پشتێنی سه‌ر به هێلكه .

هــه‌روه‌ها له نـاو كتێبه‌كـه‌دا ده‌رباره‌ی جـل‌وبـه‌رگی پیاوانیش نوسراوه «كه‌وا ـ سه‌ڵته ـ ڕانگ‌و چۆغه ـ سه‌رو پێچ كـلاو پشتێن ـ شــه‌روال‌و مراخـانی ـ كـراس‌و فـه‌قیـانـه ـ ســوخمــه ـ كـلاش ـ گـۆره‌وی ـ ده‌ست كیش ـ كلێتــه ـ په‌سته‌ك ـ فه‌ڕه‌نجی كۆڵه‌باڵ» .

گه‌لێ بابه‌تی تریش له نـاو كتێبه‌كـه‌دا ئه‌بینـرێ كه‌بـه هه‌مووی به‌ئه‌نتوگرافیا دائه‌نرێ ...

ئه‌ویش بریتی‌یه له ژیانی «ماته‌ری ـ مادی» گه‌ل‌و ئه‌ده‌به سه‌رزاری‌یه‌كه ناگرێته‌وه ، بێجگه له‌م كتێبه كتێبێك به نـاوی «چه‌ند مه‌لویه‌ك له شـارای فۆلكلۆری كـوردی بلاو كـرایه‌وه مامۆستا به‌لازنجی له‌م كتێبه‌دا كه‌وتـۆته هــه‌مان گێـژاوه‌وه‌و گۆرانی‌یه فـۆلكلۆری‌یه‌كـانیشی ته‌خمیس كـردووه‌و له لاپه‌ڕه «33»وا هــه‌مان ڕێبـازی گرتـووه كه له كتێبی «ســه‌رنجێك له ده‌روازه‌ی فـۆلكلۆری كورد»ه‌وه وتـراوه هۆی ســه‌ره‌كی ئه‌م تێكـه‌ل كردنـه‌ی فۆلكلۆر یـه ئه‌نتـوگرافیـاوه ... بـه‌ڕای من ئه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی كه ئه‌و كه‌سانه‌ی خۆیان به‌كۆكردنه‌وه‌ی ئه‌م بابه‌ته‌وه خه‌ریك كـردووه فۆلكلۆریـان كردووه بـه‌كارێكی پیشــه‌یی‌و له بـابــه‌تـه‌كـانی فــۆلكلۆریــان وه‌ك زانستێـك ئه‌كۆلیوه‌ته‌وه .

شایانی باسه بـاشترین لێكـۆڵینه‌وه له‌ســه‌ر فۆلكلۆری كوردی تا ئێستا كرابێ له كاره‌كه‌ی د . عیزه‌دین‌و موسته‌فا دایه كه له ژێر ناوی «الواقعية في الادب الكردي»ی نووسیوه‌و هـه‌روا هه‌روا «لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌ده‌بی فۆلكلۆری كوردی» ئـه‌م كتێبه‌ی دوایی ده‌رباره‌ی زۆربه‌ی هه‌ره زۆری به‌شه‌كانی فـۆلكلۆری كوردی‌یه ـ دكتۆر بۆ هه‌ڵبژاردنی ژانره‌كانی فۆلكلۆر هه‌مـان ڕێبازی گرتووه كه له وولاته سۆشیالیسته‌كاندا په‌یڕه‌و كراوه ، ئێستاش زۆربه‌ی زۆری نووسه‌ره‌كانمانبابه‌ته سه‌رزاری‌یه‌كه به‌كار ئه‌هێنین «30» له كوردستانی ئێراندات گه‌لێ فۆلكلۆرستی به‌ناو بانگ چالاكانه كه‌وتنه كۆكردنه‌وه‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی به‌شه‌كانی فۆلكلۆر چ به‌ڕادیۆ چ له‌ڕێگه‌ی چاپ كردنی به‌رهه‌مه‌كانیانه‌وه فۆلكلۆریان به‌خه‌ڵكی ناساندووه بۆ نموونه . د . محمد موكری كوردی ئێران بووه ده‌رباره‌ی گۆرانی كوردی كتێبێكی به چاپ گه‌یاندووه له ژێر ناو نیشانی «سترانه‌های كوردی» كه له زاری كوردی ناوچه جیاوازه‌كانی كوردستانه‌وه كۆی كردونـه‌ته‌وه‌و به‌لوڕی‌و شێوه‌ی كـرمانجی خـوارو» وه پیشه‌كی‌یـه‌كی زۆر جوانی بۆ كتێبه‌كه‌شی نووسیوه .

بێجگه له د . محمد مامۆستا «قادری فتاحی قازی» له‌م سالانه‌ی دواییدا ده‌ستی به چاپ كردنی گه‌لێ داستانی كوردی كرد . وه‌ك میهرد وه‌فاو شێخ فه‌ره‌خ و خاتو ئه‌ستێ گه‌لێ ووتاری تریش ده‌رباره‌ی [په‌ندی پێشینان‌و ئیدیـومه‌ی كـوردی] بلاو كرده‌وه هه‌روه‌ها عزیز ئاسفی «فه‌قێ‌ی ته‌یران‌و مه‌نـظومه‌ی شێخی سه‌نعانی» وه‌رگیراوه .. هه‌روه‌هـا عبدالله ئـه‌یوبیـان داستانی «چریكه‌ی خه‌ج‌و سیامه‌ند»و داستانی مه‌م‌و زین» و هــه‌روه‌ها ووتـارێك ده‌ربـاره‌ی «فه‌رهـه‌نگی كـوردی‌و لاس‌و خه‌زال» كه له‌م دوایی‌دا له گـۆڤاری «نشـرية ادبيـات وعلوم انسانی» چاپ كراوه ...

بێجگـه له كورده‌كـانی «ئه‌مــین قولی ئـه‌مین»ی فـارسی سه‌رۆكی ڕۆژنامه‌ی ئه‌سفه‌هان یه‌كه‌م ئێرانی ناس بووه له ناو ئێرانی ناسه‌كاندا ئاوڕی له فۆلكلۆری كوردی داوه‌ته‌وه گه‌لی فـۆلكلۆری له كورده‌كـانی موكـری‌و لوڕی وه‌رگرتـووه به‌لام به‌داخه‌وه تاكو ئێستا ئه‌م كـاره‌ی خراوه‌تـه ژێر چـاپه‌وه كـه ده‌رباره‌ی په‌ند پێشینانه»[31] . كه‌واته گه‌یشتینه ئه‌وه‌ی كه بڵێین به‌شه‌كانی فۆلكلۆر بریتین له :

پەندو قسەی نەستەق ـ گۆرانی بە هەموو بەشەکانیەوە ـ مەلحەمە ـ حیکایەت ـ چیرۆك ـ هۆنراوە ـ لاواندنەوە ـ گاڵتەو گەپ ـ مەتەل «پیا هەلخوێندن ـ ستایش» دوعاو نوشتە ـ دەست گرتنەوە .

ئەم بەشانە دەماو دەم ، پشتاو پشت لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی‌تر ئەگێڕێتەوەو گەل پارێزگاری لە مانەوەی دەکا .. کەرەسەیەکی یەکجار دەولەمەندیشە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو ـ زمان ـ کەلچەرو ئابوری کورد هەوڵدان‌و بایەخدان بە کۆکردنەوەو توێژینەوەی ژانرەکانی فۆلکلۆر بایەخدانە بەدەولەمەندکردنی زمانی کوردی‌و مێژووی لە هەموو بارێکی کۆمەلایەتی سیاسی‌و ئابووری لە هەمان کاتا فەلسەفەی گەلی کوردمان بۆ دەرئەکەوێ .

## «سەرچاوەکان»


1 ـ طراد الكبيسي : الموسوعة الصغيرة ـ التراث العربي كمصدر في نظرية المعرفة والابداع في الشعر العربي الحديث ـ بغداد ـ 1978 ص 3 .

2 ـ فۆلکلۆر : وشەیەکی ئینگلیزی‌یە ـ بریتی‌یە لە دوو وشە : فولك = گەل ، لور = زانیاری واتە «زانیاری گەل» ئەم وشەیە لە هەر ولاتێکی ئەوروپادا بەو جۆرە بەکار هێنراوە : ئەلەمانەکان : بەزانیاری جوانکاری گەلی‌دا ئەنێن ـ فەرەنسی‌یەکان بە پەندی گەل یاخود حیکایەتی میللی بڕوانە «یوری سوکولوف» الفولکلور وقضایا تأريخية ـ ترجمة حلمي شعراوي وعبدالحميد جواس قاهرة 1971 ص 17 .

هەروەها بەعەرەبی کەلەپووری میللی یاخود فۆلکلۆری پێ‌دەلێن .

3 ـ 3 — Alan Dandes. The Stady of folklore Prentice — (Z) Han nec Enqle Wood d.ff. N.T 1965. P. 4 — 6

4 ـ ڕێل Rienl ـ زاناو فۆلکلۆر ناسی ئەلەمانی‌یە لە مێژووی کەلەپووری میللی ئەڵەمانی کۆڵیوەتەوەو خاوەنی چەندەها کتێبە دەربارەی ئابوری ، سیاسەت ـ فۆلکلۆر لەیەکێك لەو تێکستانەی کە لە دانیشتگای میونیخ ساڵی 1858 دا وتویەتی‌یەوە بەگەرمی‌یەوە ڕێبازی سوسیولوژی گرتبوو ... دانی بەوە دانا (فۆلکسکندە) زانستی‌یەکی کۆمەلایەتی‌یە .

5 ـ ولاتانی ئەسکەندنافیاواتە «فنلندە ـ سوید ـ نەرویج» ولاتانی ڕۆژ ئاوای ئەوروپا .

6 ـ شفیترنگ : 1884 زانایەکی فۆلکلۆر ناسی ئەلەمانی بوو هەلگری ڕێبازی سۆسیالوژی تازەیە ، هەروەها خاوەنی چەندەها لێکۆڵینەوەی زانستی‌یە دەربارەی بەشەکانی فۆلکلۆر .

7 ـ ن ـ ی کراتسۆن ـ شاکاری شیعری میللی روسی موسکۆ 1971 ـ بەزمانی روسی .

8 ـ ن ـ گ بەگاتیرۆف ـ شاکاری شیعری میللی روسی/ موسکۆ 1954ل 3 ـ بەزمانی روسی .

9 ـ فۆلکلۆر : لەلایەن «محمد صالح» بۆ ووشەی فۆلکلۆر چوار زاراوە دانراوە کەلەپوری گەل ڕۆشنبیری میللی ـ خلقيات ـ فلقيات ناوبراودەلێ «خلقيات»ی عەرەبی بەرامبەر زاراوەی فۆلکلۆری ئەوروپی‌یە ... لەبەر چەند هۆیەك ئەوە کە فۆلکلۆر ئەوروپی‌یەکان دروستیان کردووەو لەعەرەبیان وەرگرتووە یا بە پیچەوانەوە ـ بروانە التراث الشعبي ـ العدد/ 7 ـ بغداد 1977 التراث الشعبي ـ العدد الاول ـ بغداد 1978 ص 7 .. شایانی ڕونکردنەوەیە نوسەر کەوتۆتە هەلەو گومانەوە ... هەڵەکە لەوەدایە کە لە بنچینەدا فۆلکلۆر ووشەیەکی ئینگلیزی‌یەو پەیوەندی بەزمانی عەرەبی‌یەوە نی‌یە وە ووشەی فلقیایش بڕ بەپێستی کەلە پووری میللی نی‌یە .. بگرە هەتا ووشەی (خلقيات) یش .

10 ـ میر فەلوژی : لێکۆڵینەوەی زانستی ئەفسانە .

11 ـ کورتە ئینسکلۆبیدیای ئەدەبی ـ مۆسکۆ 1970 ل 33 ـ بەزمانی روسی .

12 ـ تیئۆریٚ ئەدەبی رۆمانسی ئەڵەمانی 1934 .

13 ـ یوری سەکۆلۆف ـ فۆلکلۆری ڕوسی ـ مۆسکۆ 1941 ل 42 بەزمانی روسی .

ماکس موللر : زانایەکی زمانەوانیە . بەڕەگەز ئەڵەمانی‌یە ... بەلام زۆربەی ژیانی لە ئینگلتەرەدا بەسەر بردووەو لەدانشگای ئوسکفورد ـ بووە هەموو بەرهەمەکانی بەزمانی ئینگلیزی‌یە یەکێ لەبەرهەمەکانی بەناوی «وتارێکی بەراوردکاری میفەلۆژیاو زانستی‌زمان .

14 ـ د . عیزەدین مستەفا ـ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ـ بەغدا 1970 .

15 ـ م ن ـ ئازادۆفسکی ـ مێژوی زانستی فۆلکلۆری ڕووسی موسکۆ 1958 ل 33 بەزمانی روسی .

* ئەفاناسیف ـ 1826 — 1871 .

16 ـ د . احمد علی مرسیٚ مقدمة في الفولكلۆر ـ قاهرة 1976 ـ ص 17 .

* کۆ کردنەوەو لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر فیلندی بۆپێش دامەزراندنی وولاتەکە ئەگەرێتەوە کە نزیکەی پێنج سەدە لە ژێر دەستی وولاتی سویدابوو ، ئێستاش بۆ لێکۆڵینەوەو کۆکردنەوەی فۆلکلۆر چەندەها کۆمەڵگا کراوەتەوەو فۆلکلۆری گەلەکەیان بەمیللەتانی‌تر بەراورد ئەکەن‌و گەلێ ئەرشیفی فۆلکلۆریان کردۆتەوە کەبە گەورەترین ئەرشیف دەژمێرێ لە جیهانداو گرنگی‌یەکی زۆریان بەزیندو کردنەوەی مەلحەمەی «کالیفالا» داوە .. تەنانەت دەڵێن مال نیە پارچەیەك لە ئاوازی ئەم مەلحەمەیەی تیانەبێ .

17 ـ مەکسیم گۆرکی دەربارەی ئەدەب ـ وتاری ڕەخنەی ئەدەبی ـ گۆڤاری نوسەری سۆڤیەت ـ مۆسکۆ 19055 ل 738 [بەزمانی

روسی] .

- بلینسکی : یەکێکە لە نووسەرە پێشکەوتن خوازەکانی روسیای سەدەی نۆزدەهەم یەکێکە لەو فەیلەسوفە ڕەخنەگرە بیر دەولەمەندانەی کە هیچ هەلێکی لە دەس خۆی نەداوەو یەکسەر دەربارەی نووسیوەو لەسالی 1835 — 1839 چالاکانە دژی ئەوانە ئەدوا کەرەخنەیان لە بیرو باوەڕو «باو»ی کۆن ئەگرتو ئەیسەلماند کە پێویست بەوە ناکات هەولی گۆڕینیان بدرێبەلکو ئیەبێت هەلوێستی وایان بۆ کەلاڵە بکرێ کەوردە وردە خۆیان نەمێنن بلینسکی لە 1840دا هەستی بەهەلەی خۆیکرد .

هەلەکانی خۆی خستە ڕوو وەنووسی «والەخەوە ترسناکە خەبەرم بۆوە کە بیرکەوتنەوەیم لەلاستەمبوو ئەو زمانە لالبێ کە هەول ئەدات لەسەر پایە پەرستی - بی ئاینی - بێ ئابرویی - بێ هۆشی - واتە ئەو شتانەی ئەبنە هۆی چەوساندنەوەی مرۆڤایەتی ، ئەگەر منیش وابمو لەسەر ئەمە زمانم ببڕن گلەیی ناکەم» ئەم ئازایەتی یە وای لە بلینسکی کرد کە ببێتە ئالایەکی هەمیشە شەکاوەی ئەدەبی ڕووسی .. هەتا لەیەکێ لەو دوانەی کە لەنێوان بلینسکیو گۆگۆلدا ڕوویدا بلینسکی دەلێ : «وولاتی پێویستی بە وریا کردنەوەی هۆشو هەستی گەل هەیە ، پێویستی بەوە هەیە گەل هەست بەکەرامەتی مرۆڤایەتی بکات ئەو کەرامەتەی کە چەندین سالە دۆڕاندنویتیو بزری کردووە ، گەل پێویستی بەوە هەیە دان بە مافە ڕەواکانیان بنرێت ... بڕوانە «ف - بلنیسکی دەربارەی ڕەخنە وەرگێڕا - جلال تقی - 1971/ هەروەها گۆڤاری «بەیان» 1976 - گفتوگۆیەك لە نێوان بلینسکیو گۆگۆلدا - کامەران عبدالرحمن .

18 - محمـود العبطة : مـاهو الفـولكلور العراقي - التـراث الشعبي - بغداد - 1969/ عدد ص 6 .

19 - ایله هولتكرانس - قاموس مصطلحات الاثنويولوجيا والفولكلور . ترجمة . د . محمد الجوهري و د :- حسين الشامي . قاهرة 1973 ص 28 .

- ڤان گنب - 1873 — 1957 - زانای فۆلکلوری فەرەنسی - توانایەکی زیرەکانەی خستەکار لە ڕووی یەك بەستنی کۆمەلایەتیو ئەتنولوژیاو فۆلکلور بەناو بانگ ترین نووسینەکانی ئەم زانایە (دروست بوونی حیکایەتو دەروازەیەك لە فۆلکلۆری فەرەنسی سەردەمدا - — 1946 1943 .

20 - ی . م ئەرانسکی . پیشەکییەك لە فیلەلوژی ئێرانی / موسکۆ 1960 ل 39 «بەزمانی رووسی» .

- نوردوخانی جەلیل ... سالی 1967 توانی پلەی دوکتۆرا لە مەلحەمەی قارەمانی کورد «خانی لەپ زێرین» وەرگرێ .

21 - هەر لەگەل کردنەوەی بەشی کوردی لەلینیگراد 1956 زانایانی وەکو «کوردۆییف سۆکەرمان م . رۆدینکۆ نۆردوخانی جەلیل . ژمارەیەکی زۆر کاری فۆلکلۆرو لێکۆلینەوەیان - بلاوکردەوە .

22 - قەناتی کوردۆییف : کۆمەلە تێکستی فۆلکلۆری کوردی - بەغدا 1976 ل 10 .

23 - د . جەمال نەبەز - کورتە مێژوویەکی کورد ناسی لە ئەلەمانیادا گۆڤاری کۆری زانیاری کورد بەغدا 1974 بەرگی دووهەم ل 430 .

24 - سالی 1933 مامۆستا اسماعیل حەقی شاوەیس بۆ یەکەم جار کتێبێکی لە ژێر ناوی «قسەی پێشینان - گوستاولۆبۆن» لە بەغدا دەرکرد وە مەعروف جیاوگ سالی 1938 کتێبی «هەزار بێژو بەند»ی لە بەغدا چاپکرد . سالی 1957 شێخ محمدی خال پەندی پێشنیانی لە بەغدا چاپ کرد «چاپی یەکەم» .

25 - شەفەق : بەغدا 1958 ژمارە دوو «کوردو فۆلکلۆر» سالی 1960 لەلایەن تۆفیق وردی ئەم زاراوەیە بەکار هات پاشان لەلایەن عوسمان شارباژێری ئەم زاراوەی بۆ ئەدەبە سەرزارییەکە بەکارهێناوە بەتایبەتی لە گۆڤاری - بڕوا - سالی 1960 - ژمارە (— 14 — 15 — 16 12 — 13) لە ژێر ناو نیشانی «فۆلکلۆری کوردی»دا .

تایەر تۆفیق «گۆرانیو هەلپەڕکێ» کە لە سالی 1967 دەری کرد ... لەسەر هەر گۆرانییەك نووسیویەتی «فۆلکلۆر» .

- ڕەمزی قەزاز - لە «داستانی دوو پالەوان - فۆلکلۆرێکی کوردی» سالی 1969 - نوری عەلی ئەمین «لە فۆلکلۆری کوردییەوە» چەند چیرۆکێکی فۆلکلۆری کۆکردۆتەوە .

بێجگە لەو گۆڤارو ڕۆژ نامانەی کە وتاری ئێجگار زۆریان تیا بلاو کراوەتەوە ..

چ کۆکردنەوە چ لێکۆلینەوە .. ئەو بابەتانەی کە بە زۆری لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بلاو ئەکرێتەوە .. بریتییە لە «گۆرانی - پەندو - قسەی نەستەق - مەتەل - داستان»و بەشەکانیتر زۆر بەکەمی بلاوکراوەتەوە .

28 - نەقابەی مامۆستایانی لقی هەولێر «سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە» بەغدا 1969 .

29 - شیخ جەعفەر بەرزنجی - چەند مەلۆیەك لە شارای فۆلکلۆری کوردی سلیمانی 1969 - ل 33 - 36 .

30 - أ - د . عیزەدین مصطفى - الواقعية في الادب الكردي - بيروت 1966 ص 28 — 50 .

ب - د . عیزەدین مصطفى - ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی - لێکۆلینەوە بەغدا 1970 .

31 - محمد کریم شریف - فۆلکلور هۆنراوەی کوردەواری 1974 هەروەها - سالح علی فۆلکلۆری یاریو وەرزشی نەتەوەی کورد 1974 هەروەها سوارچاکی لە لاوکی کوردەواری دا - 1978 .

- عومەر شێخەوڵا دەشتەکی - پەندی کوردی (1972) - داستانیو گۆرانی 1978 .

32 - عبدالخالق حسین کوردو علی پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی فارسی/ مۆسکۆ 1973 . ل 7 .

# پرۆفیسۆرێ کورد

# د. کامیران عالی بەدرخان

●

- پێزانێ ئالیخانی -

●

پروفیسورێ کورد د. کامیران ئەمین عالی بەدرخان، نەڤیێ بەدرخان پاشایێ میرێ جەزیرا بوتایە یێ دویماهیکێ، ئەوێ ل سالا (1870) ێ ز ژڤێ دونیا روهن بارکری. هەروەسا برایێ میر جەلادەت وئەحمەدثریا بەدرخان وسافدار .... هـ . د . یە .

لسالا (1895) ێ ز یێ ل باژێرێ ئستامبولێ هاتیە سەر دونیایێ، هەر ژبچویکاتی یا خو کورەکێ زفت و زیرەك و زانا بو. گەلەك ب حال خوشی و دلگەشی یێ مەزت بوی، چنکی یێ دمالەکا مەزن و خانەدان و دەولەمەنددا ژیایی ئو دناڤ خێزانەکا رەوشەنبیرو زاناو خوێندەڤان و جوامێرو دونیادیتی وپەروەدەیی دا یی رابوی. زاناو دەست هەلێمە د. کامیران بەدرخان لسالا (1919)[1] ێ دگەل برایێ خویێ مەزن میرجەلادەت بەدرخانی ونەکرەمی جەمیلێ دیاربەکری ومێجەر نوئیلێ ژ باژێرێ ئستامبولێ دەرکەتنە ناڤا وەلاتی، ژبو زانینا هویڤی ودا خازێن کورێن مللەتی بەری پەیمانا - سیڤر - بهێننە گرێدان. لڤێرە هوسا یادیارە کوخاندنا خویا سەرەتایی و ئامادەیی یال باژێرێ ئستامبولێ خوێندی ب دویماهیك ئینای.

چنکی سنێلێ (مراهق) وگەنجینیا خو یا ل ئستامبولێ بوراندی .. هەتا ژیی وی بویە (23) سال.

د. کامیران ئەمین عالی بەدرخان ئێکە ژکەنکەنێن سەدێ بیستێ، ئێکە ژزاناو دەست هەلو دلسوزو روناك بیرو وەلات پارێزێن مللەتێ کورد .. ئو هەرژ بچویکاتی یا خو گەلەك هەست ب مافێن مروڤا دکر و حەز ژسەربەستیێ دکر ودڤیا دیمێ ئومێدەکا مەزن وبلند ماچی کەتن .. لەورا ل تورکی یا ناچاربو وارێ باب و باپیران بهێلیت ودگەل میرجەلادەتی ب رێ بکەڤیت بوئەلمانیا .. ژبەر بارێ رامیاری و ئەو کاودانێ تێدا دژیان (ظروف).

بەلێ دەمێ مشەخت بویو چویە ناڤ وەلاتێن بیانی یا وەلاتێن ئەوروپی، خوێن شرین و زانین و تێکەهشتنا - خو داشولی، لەورا شیا بگەهیتە هندە کەنکەنەو نڤیسەڤانێن بیانی و ئەوروپی مینا مارگرێت رودینکو ولورانس (شیراد)[2] و لوسی پول مارگرێت و فون کورت وندرلینج و .. هـ . د، ئوپێنڤیسێ خوتیشکەت و بەرپەرێن نامەخانا [ کتێبخانا ] کوردی ب رەوش پێخیتن، ئوشیا چەند کەشکولا بتنێ و چەندە - کاژی ب پشکداری دگەل نڤیسەڤانێن ئەوروپی بدویماهیك بینیت و بدەت چاپکرن.

هەروەسا د. کامیران بەدرخان دژیانا خودا گەلەك بزاڤ و خەباتاکری ژبو روژنامەگەری یا کوردی و ساخ کرنا پەیڤا



ڕەسەنا کوردی ژمارە (20) یارو ـ ژناما کوردستان [(1898) ، مقداد مدحەد بدرخان ] ، هەتا ژمارا دویماهیاکێ کوژمارا (31،30) بون ل جنێف دەرکەتی ، د . کامیرانی هاریکاری کرو وب رێ ئێخبست . ڤەمانا ڤێ روژمامێ (4)[3] چارسالێن زێرین بون . هەردسالێن [ 1941 — 1943 ] دەستێ خو داگەل هێژا میرجەلادەتێ برایێ خو ، ژبو دەرئێخستنا گوڤارا ـ هاوارو ـ ڕوناهی ـ ل باژێرێ دیمەشقێ ـ لسوریێ هەروەسا گوڤارا [ روژانوی ][4] ، ل سالا 1943 ، ل بەیروتێ ـ لبنان ـ دەرێخست بزمانێ کوردی وفەرەنسی . پاشی گوڤارەکا دی دەرێخست لبن ناڤ ونیشانێن ـ ستێر ـ هەر ژیالا [ 1943 — 1945 ] ، بەردەوام بو ـ ئەڤ روژنام و گوڤارانە وشورەشا ویژەیی ل سوریاو لوبنان بەردەوام بون هەتا سالا ـ 1947 ـ سەر بخوبونا سوریاو لوبنان . هەروەسا ببون مەتال ژبو دوربێن ئیمپریالیزمێ و دوژمنێن مللەتێ کورد .

پروفیسور کامیران ئەمین عالی گەلەکێ ب هەست و مێشك تیژو بزهین بو ، ئودژیانا خودا فێری گەلەك زمانابو مینا : ـ زمانێ تورکی ، عەرەبی ، ئەلمانی ، ئومینا نفیسەڤانەکێ فەرەنسی فەرەنسی دزانی ژبلی زمانێ زکماکی ـ زمانێ کوردی ـ لەورا شیایە گەلەك نڤشتا ـ کتێبا ـ بڤان زمانێن سەری چێکەتن ، ئو گەلەکاژێ ژڤان زمانا بگوهوریتە زمانێ کوردی ، هەروەکی پشکداری کری دگەل ( لوسی پول مارگریت )[6] بو گوهرینا هوزانێن کەڤنترین هۆزانڤانێ کورد کوعەلی تەرموکی یە ، بوسەر زمانێ فەرەنسی [ کۆمەلەك هۆزانێن عەلی تەرموکی ] .

د . کامیران بەدرخانی گەلەك هەولادای ژبوساخ کرنا ژیانا هۆزانڤانێن کەڤنێن کوردان مینا : خانی ، جەزیری ، حەریری ، هەروەسارایا خو دیاردکەت ل سەر فەیلەسوفێ مەزن (خانی)[7] و دبێژیتن : ـ جارا یێکێ بو بەرێ پتر ژ سێسەد سالاپێش نهو کو خانیێ مەزن بیرا نەتەوایەتی دیارو ئاشکراو روهن کری دناڤ مللەتێ کوردان دا یانکو شیا قویناغا ئێکێ بدەت دەست خوو هەتانهو کەس نەگەهشتیە پێپەلیسکا خانی گەهشتێ ، هەرچەندە هندەك شاگردێن خانی یێن هاتین پشتیوی بەلێ چ تشتێ نوی دیارنەکرینە بەلکی هەر تشتێن ژخانیێ مەزن ڤە گوهاستین . ژبلی وێ چەندێ دسالا (1937) یدا پشکداری کری دگەل لوسی پول مارگریت [ هەلشکافتن ][8] دهۆزانا کوردیدا . ئوهەتا ئینایە بەرهەم .

پارێزەر کامیران بەدرخان مەلەڤانەکێ مەلەڤان دگشت یاسادا ، رەهوانەکێ رەهوان بو لبەر دەرێ هەر دادگایەکێ «محکمة» ، هەروەسا شارەزایەکێ شارەزابو درێزمان و زمانەوانیێ دا ، باراپتر ژیانا خویا تورەیی یانکو پێنڤیسێ خویی ب ژمانەڤانیێڤە بوراندی هەتا شیای خویمەکێ دانیت بورێزمانا کوردی ژهندە لاڤە ، چەند نڤشتەك لسەر رێزمانا کوردی دەرئێخستن ژبلی فەرهەنگا [ کوردی ـ فەرەسی ][9] کوژ « 95/000 » پەیڤا پتر بون دێ شێین بێژین مەزنترین وبهاترین فەر هەنگا کوردییە ، پشتی مرناوی کول سالا (1979) ێ ئێخستییە دژێر چاپێدا لپاریس .

پروفیسور کامیران بەدرخان پێغەمبەرەك بو ( مسؤل ) گەلەکێ زاناو دلسوز بو ، پوینە ددا [ خەباتێ و خوگوریکرنێ و سەربەستییێ ][10] ، هەلبەت هندی روژەکێ مایەل سەر تویخێ زەڤیێ پێکول دکرو دبزڤی ژبو پەیڤا تەناهیێ و ئازادییێ . ژبلی ڤێ چەندێ خودانێ [ خاندنگەهەکا ][11] راستەقینا سترانا کوردی بو لدویڤ سەروا ستوینی (العمودي) ڤێرە شیا جهەکێ بەرفرەه بڤەوژێریت بوڤێ خاندنگە . هێ .. دویماهیکێ نڤشتەکا سترانا بزمانێ فەرەنسی

سالا (1973) ێ ل پاریش چاپ کر .

د . کامیران عالی بەدرخان لسالا (1948)[12] ێ ئاموژگا یەکا خاندنا کوردی فەکر (دانا) ل بازێرێ پاریسی ئودفێ ئاموژگایێ‌دا شیا بەلاڤوکەکێ دەربێخیت ، بو ئاموژگایێ لبن نافێ [ بەلاڤوکا کوردی ] هەتا [13] ژمارە ژێ دەرێخستین . هەروەسا بوماموستایێ زمانێ کوردی لخاندنگەهەکا روژهەلاتی سەرب زانکویا [ سوربون ][13] ئو بەشەك فەکر بو زمان و دویروکا کوردی ، ئو پشکداری کر دچەندەها کومیتێن تورەیی داکرن ژبو بەزرکرن و ساخ کرنا پەیڤا رەسەنا کوردی دناف جیهانا ئەورویی دا .

پروفیسورێ مە کوخوژ هوزانێ بێ بارە نەکری‌یە بەلکی دەستەکێ دریژ هەبو دهوزانا کوردی ئوشیا . دیوانێن هوزانا دەربێخیت ژبلی چەند هوزان دگوڤارو روژنامێن کوردی‌دا بەلاڤکرین .

ئەمر کامران بەدرخانی گەلەڤیای خو بەردەتە دناف دەریا ئولێ ئیسلامی‌داو لدویف بچیت تشتەکێ ژێ بزانیت هەتابگەهیتە راستی‌یەکێ ژڤی ئولی لەورا هەولداو پێنفیسێ خو تیژکرو هەتا هەمی ( قورئانا پیروز )[14] راڤەکری . (تفسیر) ب زمانێ کوردی ، ژبلی وێ چەندێ کو شیای خو مینا ماموستایەکێ شارەزاو پسپور دانیت دئولێ ئیسلامی‌دا . چەند وانێن ـ شریعەتی ـ لسالا (1938) ێ دانە چاپ کرن و بەلاڤکرن ـ بزمانێ کوردی ـ . هەروەسا چەند ئایەتێن ( قورئانا پیروز ) گوهرینە سەر زمانی کوردی‌و دگوڤارو روژنامادا بەلاڤکرن .

ئەڤیندارو پسپورو فامایێ پەیڤا کوردی ( د . ك . ب ) گەلەك هەڤالین‌یا دگەل نفیسەڤان و زمانێن جیهانی داکری گەلەك جارا پشکداری‌یا دگەل نفیسەڤانێن جیهانی‌و ئەورویی‌دا کری چ ب گوهرینێ (ترجمة) یان ب نفیسینێ بوبەلگە نفیسینا بەراهی‌یەکا ب هێزو بەرفرەه بوکتێبا نفیسەڤان ( ئێس ئیس گاڤان ـ S S Gavan ) ، ئەوالبن نافونیشانێت [ کوردستان وەلاتەکێ پارچە پارچە کری‌یە دروژهەلاتا ناڤەراستدا ][15] ـ Kurdstan Divided Nation Of The Middle east .. )

کو نفیسەڤان لورانس ویشراد لسالا (1958) ێ‌دایە چاپکرن لبازێرێ لەندەن .

یان ژێ‌یێ شیای چەند پارچێن هەلبژارتی‌یێن هوزانێن کوردی بگوهریتە سەرزمانێن بیانی‌و ئەورویی یان هوزانێت هوزانڤانێن جیهانی بگوهریتە سەر زمانێ کوردی‌و بەلاڤ‌کەتن مینا گوهرین و راڤەکرنا هوزانێن : ـ

لامارتینێ فەرەنسی‌و ڤیکتور هوگوی یان م . ئە . بوتی ، هەرلبن ناڤێ خوێی هوزانی (شیعری) دا [ سەیدایی گەروك ]* . براستی پشتی مروڤ بەرهەم و کارێن بێکی مینا کامیران بەدرخانی دبینیت ودبهیسیت ژنوی مروڤ بهایێ خەباتێ‌و بزاڤا ویژەیی دزانیت هەتا چ رادایە .. !!! ...

لێ‌مخابن نفیسەڤان وزمانەوان وئەڤینداری پەیڤا کوردی د . کامیران لروژا [ دوشەمبی 1978/12/6 ][16] ێ بەلگێن داراوی زەربوین‌و تازە وەریان ئوپارزینکێ خوێی کوڤان‌و کەسەرا ب پشتنا خوڤەداو ژجیهانامە بارکروچو لێتشتێ ب بابەخ (مهم) لدویف مرناوی هاتیە کرن ئەڤەیە : پشتی (40) چل روژبسەر مرناوی فەچوین زانکویا (سوربون) بشەهیانەکا مەزن رابون برەنگێ کورێ (ندوە) ب هەزارەها ژناوکەنکەنەو نفیسەڤانێن جیهانی پشکداربون ، دەرگەهێن گەنگەشێ لسەر بزاڤ و خەباتا پروفیسورێ کورد ( د . کامیران ئەمین عالی بەدرخان ) ڤەکرن . لدویماهیکێ هەزارسلاڤ لسەر گیانێ پاقژێ نفیسەڤانێ‌مە یێ‌نەمرو هەمی دلسوزان .

## بەرهەمێن پروفیسور ( د . ك . ب ) ێ

1 — دلێن کورێن من : هوزان ـ (1932) [17]
2 — چارینێن خەیام : هوزان ـ گوهرین ـ 1932 .
3 — فێربونا خویندنا کوردی : [ پاریس 1968 ][18] .
4 — زمانێ کوردی : پاریس ـ 1953 .
5 — ئەلف‌بێ‌یا کوردی : (؟) .
6 — [ بەندێن پێشینێن کوردی ][19] : دگەل لوسی پول مارگرێت / 1937 ـ پاریس .
7 — ئەلف بێ‌یامن : دمشق ـ 1938 .
8 — [ مەتەلوکێن کوردی ][20] : پشکداری دگەل لوسی پول مار ـ گرێت ـ دیمشق ـ (؟) .
9 — دەرسێن شەریعەتی : بزمانێ کوردی ـ دیمەشق ـ 1938 .
10 — ریزمانا زمانێ کوردی : بزمانێ فەرەنسی ـ پاریس ـ 1953 .

— زمانێ مادەر : [نڤشت] ـ 1968 .

— زمانێ کوردی زهشکداری دگەل س . شنان ب زمانێ کوردی‌و تورکی ـ 1976 .

— فەرهەنگا کوردی‌و فەرەنسی سالا 1979 ل پاریس ئێخستی‌یە ژێر چاپێ دا .

— [ آلام کوردستان ] هۆزان پاریس ـ 1976 .

— گوهرپینا هۆزانێن کوردی بۆزمانێ ئەلمانی : پشکداری دگەل فون کورت وندرلینج ـ بەرلین ـ 1935 .

— راڤە کرنا قورئانا پیروز ب زمانێ کوردی : (؟)

— لێکولینەوە لسەر ئول‌و حەدیثێن پێغەمبەری ، ب زمانێ کوردی .

— سترانێن کوردی ، ب زمانێ فەرەنسی ـ پاریس ـ 1973 .

— بەرهەڤکرن وبەلاڤکرنا پارچێن هەلبژارتی ، ژ توری کوردی‌و جیهانی ب زمانێ کوردی ـ 1971 .

— [ هەلشکافتن دهوزنا کوردی ][21] دا ، پشکداری دگەل لوس پول مارگریت ب زمانێ فەرەنسی پاریس ـ 1937 . و ل سالا 1939 هێژا رفیق حلمی وەرگێراو ل بەغدا چاپکر .

— ریزمانا کوردی ب زمانێ کوردی ـ 1956 .

— بەلاڤوکا کوردی : (13) سێزدە هژمارژێ بەلاڤکرینە ل ئاموژگایا کوردی ل پاریس ـ 1948 .

— [ پێلێن روناهیێ ]* هوزان ـ پارس ـ 1976 .

ژێدەر : REFERENCE


1 — گوڤاری کوری زاناری کورد : بەرگێ حەفتێ — 7 — 1980 ، بپ 258 .

2 — لمحة عن الاكراد : توما بوا ـ ترجمة محمد شريف عثمان ـ النجف الاشرف ـ 1969 ص 77 .

3 — جريدە « العراق » : ـ 21 / 4 / 1980 .

4 — مجلة شمس كردستان : هژمار (55) ـ 1979 .

شمس كردستان : المصدر السابق .

6 — کاروانی شیعری نوێی کوردی : کاکەی فەلاح ـ چاچی دووەم ـ بەغدا ـ 1980 بپ 256 .

7 — مەم‌وزنیا خانی : گیو موکریانی ـ هەولێرا 1968 ، بپ 211 .

8 — مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة : د . معروف خزنەدار ـ الجزء الاول بغداد / 1978 ص 47 — 76 .

9 — شمس كردستان : المصدر السابق .

10 — مع الاكراد : تومابوا . ترجمة آواز زنگنة / 1975 ، ص 57 .

11 — المصدر السابق .

12 — شمس كردستان المصدر السابق .

13 — المصدر السابق .

14 — المصدر السابق .

15 — لمحة عن الاكراد : تومابوا : المصدر السابق .

16 — رۆژ ژمێری پیرەمێرد : نەریحان ـ 1982 ، بەلێ هەر ماموستا نەریحانی دهاوکاری ـ هژمار (686) دا رۆژا 5/5/1983 نڤیسی‌یە ل سالا 1977 پێ‌مری .

* گوڤاری کوری زانیاری کورد : ژێدەرێ بەرێ / بپ (182) .

17 — هۆزانڤانێت کورد : ص . ب . ئامێدی : بەغدا ـ 1980 ـ بپ (8 — 9) .

18 — کومەلە تێکستی فولکلوری کوردی . کوردویف ، شکور مصطفی‌و ئەنوەر قادر محمد ئینایە سەر رێنڤیسانوی / بغداد ـ 1979 بپ (15) .

19 — هۆزانڤانێت کورد : ص ـ ب ـ ئامێدی / بپ (199) .

20 — ژێدەرێ بەرێ / بپ (8 — 9) .

21 — مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة : المصدر السابق ـ ص 50 .

22 — الثقافة : العدد (8) — 1982 / ص 35 .

23 — الثقافة : العدد (1) ـ 1983 / ص (58 — 60) .

24 — خلاصة تأريخ كردستان : محمد امين زكي ـ نقله الى العربية محمد علي عوني ـ مصر ـ 1952

25 — الثقافة : العدد (7) — 1981 ص (52) .

26 — جريدة العراق العدد ـ 2199 ـ 23 نيسان 1983 ص 4 .

27 — الثقافة : العدد (2 — 3) شباط‌و آذار 1982 ص 83 .

28 — کاروان : ژمارە (3) سالی 1982 .


* تومابوای دنڤشتا خویا [ مع الأكراد ] دا یانڤیسای ( جليد الشور ) بەلێ یاڤێك نەکەتیە وبەلکی جهێ باوەرێی دگوڤارا روشنبیری‌نوێ ، یاسالا 1974 دەر کەت .. نڤیسا بو [ پێلێن روناهیێ ] ئەڤێ چێتر خول مێشکێ من داومن باوەری پێ‌ئینا .

# بەرەو ڕووناکی

ئەخۆڵ

لەناخی جەرگی تاریکیەوە .. ،
لە کانگای دیلی‌و هەژاریەوە ،
دەس بە کەلەپچەو زنجیر لە پێما ..
تەوقی نەزانی واله گەردنما
کەوتومەتە ڕێ ... ڕێگەی بێ‌باکی
هاتوم و ئەڕۆم ... بەرەو ڕوناکی

* * *

پشت بەجەزرەبەی قامچی داڕزاو
چاوو ناوچەوان تف پیاهەڵپژاو
بەشەلی‌و قاچی دارکاری کراو .. ،
فرمێسك لە چاوماو شکۆ قەتیس ماو
پێستی لەش بەسەرئێسکما نووساوە
بەدلێك وەکو پۆلای ئاو دراوە ...
ڕێم گرتۆتە بەر زۆر بەچالاکی ...
ئەڕۆم‌و ئەڕۆم بەرەو ڕوناکی ...
هەرچەند ماندوم‌و ڕێگام دورەو دێر ...
برسیم و ڕووتم ، دوژمن پۆشتەو تێر ...
من پێ‌و دەس بەسراو ، بێ‌هێزو توانا ...
دوژمن بەهێزو دەستی بەرەڵڵا ...
لەگەڵ ئەوەشا بەهەستێکی بەرز
ویستێکی نەگۆڕ ، گیانێکی نەبەز
ئەڕۆم بەمەردی‌و زاتی بێ باکی ...
ئەڕۆم بێ وچان ... بەرەو ڕووناکی ..
ئەزانم ڕێگام سەختەو پڕ ئازار
پڕ لە دوژمنی خوێنە خۆو زۆردار
بەچەن کۆسپ‌و ئەرك ڕێگام تەنراوە
بۆ ئەوەی نەڕۆم بکشێمە دوواوە ..
بەلام نەسەختی ڕێی‌ی پڕ ئەرکو دوور
نەتاریکایی سامی بێ سنوور ...

# هەڵوەرین

د . احسان فؤاد

گەلای عومرم وا ئەوەرێ
سەرێکم بە ئەی لانەی نیاز
وەرە ئەی نەرمە بای کوێستان

وادەی خەزانمە شیرین راز
وەرە شێت گیرم کە بەناز
پێش ئەوەی تەمەن تێپەرێ .

ژیانی‌چی ؟ ژینێکە : تار ،
خەوێکە وەك هەوری بەهار
پاراوە بەنمی ئازار

چەند شۆخی تۆ .. چەند نیانی
چۆن‌ نایزانی ؟
ئەم ژیانە بەبێ بزەی گەرمی جوانی
سەختە وەکو ذەستی تاوان
پەستە وەکو رووی بیابان .

چەند شۆخی .. چەند نەرم‌و جوانی
چۆن نازانی ؟
ئەم ژیانە . زیندەگانی
خۆشی‌و شادی‌و کامەرانی
وەکو شەستی لێزمەی باران
چۆن بە گوڕدێت ، کە رەهێڵە
بەلای ئاسمان دەگرێ بەتاو
قولپ ئەدات وەك دەنگی گریان
ئا ..وا تێدەپەڕێ‌و خێرا
لەگەڵ پەپوولەی پاییزا
لەگەڵ کزەی زەردەپەڕا ...

چەند شۆخی تۆ .. چەند نیانی
چۆن نازانی ؟
عەشق‌و لاوی‌و بەلێن‌و ژووان
تیژ رەون وەك ئاوی سیروان
وەك ئارایشتی رووی زەمین

وەك هەلمی بەیانی‌ی هاوین
تاوێکە .. ئیتر نایبینی
لە ناکاو دەرەوێتەوە
کە رۆیشت ناگەرێتەوو .

دە ..سا .. وەرە ئەی نەرمە با
چریە ناسگ ، دیدە سیا
نازلێ هاتووی بێ ئارایشت
ئەی پەری ، ئەی گەشکەی چیا !
تەنیایی من خەم رەوێن کە
خەوی شەوانم شیرین کە
دەم‌و لێوم بە هەنگوین کە
دوو دیاری سنگ :
لە ژێر کراسی تەنگدا
بە ناز .. با .. بلەرێنەوە
هیواکانم وەکو خونچەی بەهاری نوێ
لە ناو ئەو لەش‌و لارەتا بشنێن‌و بگەشێنەو




● ئازاد دڵزار ●

کە سپێدە
دەرزی‌و دوگمەی سینگی بەیان
دەترازێنێ
کاتێ شنە،
چناری سەر بناوانێ
لە ئامێزێ رادەژێنێ
جووتیار لەسەر تاتە نوێژێ
بۆ کوریژگەو مانگایەکەی
روەو ئاسمان
دوعاکانی دەلێتەوە
کاتێ درنجی تاریکی
بەرەو بارەگای خودای شەڕ،
سەرەو ژوور کێل دەبێتەوە.
ئەو شەوگارە چی رویدابێ،
ئەو شەوگارە،

«چەند سەر بێ کلاو،
چەند کلاو بێ سەر کرابێ.
چەند خەرمان بوبێ بە سووتو

گورگێ لەکام پەزی دابێ،
لەگەڵ بەیان،
چۆلەکەکان دەیگێڕنەوە،
لەگەڵ بەیان،
ورد ورد لەبوم دەگێڕنەوە.

# دەرگەهێ ژینێ و هیڤیێ

• بدرخان سندي •

-ەرگەهێ ژینو هیڤيیا گرتيیە دیسا چما ؟
ما ژژینا کورتە ژینبت ما ژعەمرێ مە چما
سیدەیا بێتن چ لێکم گەر دگەنجيدا نەهات
نێرگزا وارێمە وەریاو خوناڤەك پێدا نەهات
ـڤەتا چەرخو سەمامە نەما یادێ بزان
شینيیو گرین بومە مان شەربەتا ئاهو خەمان
ـو دنالم لەو دکالم بلبلو .. هێلین هەرفت
سەد هزار هێلین هەرفتن دژمنو تەمەق کەرفت
ـلێ بێکەس مشەختە کاڤلە رەزێ گولا
ئاگرەك بەربي هناڤو تالانا جەرگو دلا
جانیکێت کومێدا رەڤین کەتنە ناڤ چولو چیا
رەوینا گورگا لنیڤ شەڤا بچاندن جەرگو سيیا
ئاگرەك کەتە دلێمەو چریسکەك ژێ ڤەبەیي
کەتە ئەسماناو نڤێسي کوردو تو هەبيو هەیي
-ەرگەهێ ژینو هیڤيیا گرتيیە دیسا چما ؟
ما ژژینا کورتە ژین ما ژعەمرێمە چما
تە دڤێتن ئەز بمینم کەتيیێ بارێ خوبم
ئەز مێڤاني وارێ خوبم دەروزێ مالێ خوبم
بارەکێ ئێکجار گرانە پەسارە رێکا کەژێ
شێخ عوبەیدو شێخ سەعیدێ روهنە ریکاوا لەتێ
ـەنەرێت تاریخێ دگەشن روهنيیا چاڤو دلان
دێ چ خونیم بەرپەران ئاڤرويیێ وئیشوکولان
تازيیا قازي ژبیر نەکن بو بکن شیني هەر سال
کوزرین گولێت چیایا نێرگزێت شەنگو شەپال

رستەکێت شەنقێ بو ڤەدان جان فیدایێت راستيیێ
چون سەر سێدارو قنارا هەوارە لکوردينيیێ
عزتو خەیريو قودسي مصطفا ئەو چار برا
روهنێیا چاڤو دلان هەرگەشن ئەو چارچرا
ئەو چرایت ملەتینە شەوق ڤەدان بومە لەوا
بلبلێت شەرمن دخونین کوردو دێ رابە ژخەوا
دەرگەهێ ژینو هیڤيیا گرتيیە دیسا چما ؟
ما ژ ژینا کورتەژین بت ما ژ عەمرێمە چ ما
زاناو نەزان هەر ئێکن کوردینو نابت ئەڤە
لەو ژ ئێشا ئەم دنالین هەر لە دونیا شەڤە
کاروانێت شەڤا دبورن لاوكو حەیران خوشن
رستەکێت ستێرا دسوژن بومە هادن لەو گەشن
گوهـ بدن دەنگێ بلیلان ئەو چەوا بومە دبسترن
خوشە لێ دەنگێ نارینان دلێمە تژي کولن
هەر ئەمین هەتا ئەڤ سالە خەونکە بشێن بژین
وەكهەميخەلکێتجیهانێوان سنویرا ژخو ڤەدین
خەونەکە بشێم ببینم دەڤرێ دلێ من خاست
نابتن بومە ببینین گێرو ژورا چەپو راست
نابتن بومە تەوافا ئەو جهێ لێ مەمو زین
یان براموسین ئەو جهێ لێ ژێیا فەرهادو شرین
نابتن بچم نك خاني بو ڤەکم دلێ بخوین
نابتن بچم دیرسیمێ بکەلێشم دلێ بئەڤین
دەرگەهي ژینو هیڤيیا گرتيیە دیسا چما ؟
ما ژ ژینا کورتە ژینبت ما ژ عەمرێ مە چ ما

سروود

## هەڵمەت بەرە

جلال مدحت خۆشناو

جەرخی ئیستا جەرخی هەڵمەت بردنە
کاتی هەولی بێ ووچان و خوێندنە
لاوی گەل پێویستیە گورج راپەڕێ
گیان فیدای جەنگاوەران نرخی شەرە
ئاوو خاکی زەوت کراوی ئێشتمان

تۆلەیی توندی دەوێتن بێگومان
دایکی شیرینە دەناڵێ دوای کەوە
بانگی مەردانە کورو فریای کەوە
روژی هێرش بردن و ماف سەندنە
کەنگی ئیمرو جەرخی داگیرکردنە !



ڕەووف بێگەرد

که ئەو چوار شەممەیە ، سەعات بووە حەوتی بەیانی و ، خۆر وەك بالایەکی بەرز بەسەر لووتکە کاندا هەڵکشا ، دەبوو - حەسەنی مام سلێمان - بکوژرایە . حەسەن خۆی دەیزانی لەسەرچی دەکوژرێت . کوژەرەکانیش ڕقێکی ڕەش و تیربوون . تەنیا سزای کوشتنیان پڕ بەپڕی تاوانەکەی حەسەن دەزانی ، بۆیە لە خۆ ئامادەکردنی تۆڵەدا شەویان دابووە دەم ڕۆژ ، ئامێرە ڕەق و دزێوەکان تەواو لەگەڵ دەست و پەنجەیاندا ئالوودە بوو بوون و ، لەگەڵ یەکەم چرکەدا مێشك و دڵی حەسەنیان لە جوولە دەخست ، کوشتنی حەسەن لەوە ئاسانتربوو نەخشەیەکی دی بۆ بکێشرێت ، کەچی نەکوژرا .

ئەوانەی بۆ کوشتنی هاتبوون لەگەڵ تاریك و ڕوونی بەیاندا گەیشتنە ناو شار ، چوونە ناو ئەو خانووە تەواو نەکراوەی لە سەرووی ماڵی حەسەنەوەیە ، خۆیان تیا حەشاردا ، دەیان زانی کات زۆری بەبەرەوە ماوەو ، حەسەنیش کەی لەماڵ دەردەچێت ، چوونە ژوورێکی تەریك و بە دڵنیایی دانیشتن ، کەوتنە جگەرەکێشان . دەمانچەکانیان دەرهێنا ، دەستە سڕەکانیان بەپشت و لوولە و دەسکیاندا هێناو ، زامنەو شانەیان تاقی کردەوە ، چەند جارێك لە ناو دەستیاندا هەڵیان سووڕاند ، لەسەرخۆ لەگەڵ یەکتردا کەوتنە قسە . ڕەشە ووتی : ئەم دووکەسیە بۆیە چاکە ، کە دەمانچەی یەکێکمان وەستا ئەوی تر دێتە دەست .

قالە وەڵامی دایەوە ئەی ئەگەر هەردووکیان وەستان ؟ ڕەشە ووتی ! تا ئێستا شتی وا ڕووی نەداوە ، بەتایبەتی بۆ تاوانبارێکی وەك حەسەن .

قالە بێ دەنگ بوو ، ڕەشە پێی ووت : لەوانەیە چەکی پێ بێت ، من پێش تۆ هەڵدەکوتمە سەری ، دەمێکە بیرم لە شوێنی کاریگەری کردۆتەوە .

لەگەڵ قسەکەیدا یەکەمین گوللەی ناو شانەی دەمانچەکەی دەرهێناو خستیە سەر لەپی دەستی ، بە قالەی ووت . تەماشای بکە ، لە تاریکیشدا هەر دەڵێی پشکۆیە ، ئەم گوللە جوانە لە ناو دڵیا دەتەقێنمەوە ، کە دڵ لە جوولە کەوت لەش وەك داری گەندەڵ هەرەس دێنێت . خۆت دەزانیت لەنیشان پێکاندا چۆنم و چەندین جار دەرزیم هەڵگرتووە .

قالە لەسەرخۆ ووتی : حەسەن بێتە دەست هەردووکمان دەکوژێت ، هاوڕێی خۆم بووەو چاکی دەناسم ، تۆ بەتفەنگ نیشانت پێکاوە ، پشتی دەمانچە شتێکی تڕەو بێ لێدانی گرانە . بۆ منی بەجێ بهێڵە ، ئەی نازانیت ئەوانەی خۆیان دەکوژن بۆ گوللە بەسەر یانەوە دەنێن ؟ تا جارێکی دی چاو بەژیاندا هەڵنەهێننەوە . گوللەکەی تۆ هەر بەئەندازەی موویەك ئەم لاو ئەولا بکات لەوانە یە نەیکوژێت .

ڕەشە ووتی : دەستی من هەرگیز هەڵەناکات ، ئەزانیت چەنداغ لەدڵیم ! حەسەن لەدوژمنی باوك کوشتەم تاوانبارترە .

قالە سەری باداو لەسەر خۆ پێی ووت : دوژمنی هەردوو لامانە ، خونچە ژنی تۆیە ، بەلام خوشکی منە ، ڕەنگە منیش لە پێشتربم بۆ یەکەمین گوللە . حەسەن هاوڕێم بوو ، ئەو دوو جار ناپاکی لەگەڵ مندا کردووە ، ئەو کەسەی هاوڕێیەتی پێ شێل بکات شیاوی نەفرەت لێ کردنە .

ڕەشە ووتی : من وام پێ خۆشە لەپێشدا دەست بکەمەوە ، چونکە پەڵەیەکی گەورەو تاریکی خستۆتە سەر ژیانم ، کە گەڕاینەوە لێم دەپرسن : یەکەمین گوللەت بەکوێوەی نا ؟ دەڵێم : گوللەیەکی گەلێك سوور بوو ، کە دەمنایە سەر دەستم لەپشکۆی ناو ژوورێکی تاریکی دەکرد ، ئەو گوللەیەم کردە دیاریی دڵی .

قالە ووتی : نەء ... من وا هەست دەکەم بەشداری ئەولەکەیەی سەر ژیانی تۆم کردبێت ، چونکە هاوڕێی حەسەن بووم ، بۆ ئەوەی ئەو بارە گرانە لەسەر ویژدانی خۆم لابەرم دەبێت یەکەمین جار من دەست بەکاربم ، تۆش دوای ئەوە چەندی پێوەدەنێیت و بەکوێوەی دەنێیت ئارەزووتە .

چاوەکانی ڕەشە کرانەوەو ڕەنگی داگیرسا ، دەنگی هەڵبڕی ، قالە پێی ووت : لەسەر خۆ ، بێئەوەی هیچمان کردبێت ئاشکرامان مەکە . ڕەشە دەنگی نەوی کردو ووتی : ئەم قسانەی تۆ سەیرن !

برام بەکوردی و کورتی ئەم کابرایە ژنی منی هەڵگرتووە ، ـــ بوومەتە جێگای تانەو تەشەری خەڵکی ، چاوم لە ئاستی کەـ هەڵنایەت ، تەنانەت ژنم نادەنێ . بەهەموو یاسایەك ـحێت سەربەرزی و ناموسی خۆم بکڕمەوە . نایشمەوێت پێم ـ کەسێ تریش من ئەو تۆڵەیەی سەندووە . بەهەزار دەردی ـ ی پەی جۆری دوژمنەکەمم کردووە ، دوو ساڵە بەدوایدا ـ . خۆ ئەگەر من پێم نەوتیتایە تۆ هەر نەتدەزانی .

قالە وتی : کەواتە من خاوەن هەقنیم ! هەرگیز لەم ـسەلەیەدا بۆ پارێزگاری تۆ نەهاتووم ، من خاوەنی ـستەقینەم ، بڕیارت دەدەمێ تاقە گوللەیەك و بەس . شەویش ـحەو بە تەوێلی حەسەنەوە دەبینم ، یەکەمین گوللە من نەبم دڵم ـو ناخواتەوە ، نیشانەی ناو چاوی لەلای من وەك ـوو ـەرهێنانی ناو ماست وایە .

رەشە لەپێستی خۆی دەرچوو ، کێشای بەناوچاوی حوێداو خەریك بوو پڕ بەدەم هاوار بکات .

ئەوکاتە تیشکی خۆر بەهێوری بەرەو دەمارەکانی شار ـزەی کرد ، ئاسمانێکی گەش و جیهانێکی کڕی تازە لەخەو هەستاو بوو ، دەنگی ئافرەتێك لەدوورو تەقەی دەرگایەکیش ـەم لاتر دەهات ، میلی سەعات تەواو لەسەر حەوت جووت بوو ـو ، ئەمان بەدەم بوڵەو هەڕەشەوە هاتنە هوڵەکەو کەوتنە ـاوەچاو . دەرگای ماڵی حەسەن کرایەوە ، حەسەن ـەتەدەری و وەستا ، سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی کردو ـەدرێژایی ڕێگاکەی ڕوانی ، خونچە لەپاڵیا هەستی ڕاگرتبوو ، ئەویش چاوی دەگێڕا ، کچە بچکۆلەکەیانی بەباوەشەوە بوو ، حەسەن ئاوڕی لێدایەوە ، دەستی بەسەروو چاویا هێنا ، ـەنجە ووردەکانی لەناودەستیا بەهێمنی گوشی ، ئەو خۆی هەڵدایە ئامێزی ، گرتی و ڕوومەتەکانی ماچ کرد ، پاشان ـایەوە خونچەو پشتی لێهەڵکردن .

قالە واتێیان ڕامابوو دەتووت لەبەردەم شانۆگەریەکی تراژیدیەو ، کارەساتە سامناك و ئاڵۆزەکان لەوپەڕی تەشەنەکردن و سەرکەشیدان ، قارەمانەکەیش کە هەموو هیوایەکی پێوە بەستراوە ، هاکا لەلووتکەیەکی هەرە بڵندەوە هەڵدێراو ، خەنجەری بەردی تیژو زەق و زۆپەکانی چیا لەشیان ئەنجن کرد . قالە لەجیهانە تایبەتیەکەی دابڕابوو ، تەماشای دەکردو لەگەڵ هەنگاوەکانی حەسەندا پێبەپێ چاوی دەگوێزایەوە . کەحەسەن گەیشتە ئەوجێگایەی دڵ و تەوێڵی کەوتە بەر نیشان ، ئەمان دەمانچە ڕووتەکانیان هێنایە سەرێ ، بەڵام لەتەماشاکردنێکی کوت وپڕی یەکتریدا هەردووکیان سڵەمینەوە ، دەتووت هەریەکەیان ئەوی تری گرتوە ، کەسیان لەوە دڵنیا نەبوون ئەوی تر ڕێگای ئەدات دەست پێشکەری بکات ، هەریەکەیان ترسێکی ناوەخت بوون و داچۆڕینە دەروونی ئەوی دیەوە . دیوارێك کەوتە نێوان ئەمان و حەسەنەوە ، چاویان تەنیا یەکتری دەبینی ، ماوەیەکی نێجگارکەم و حەسەن لەوشوێنە ترازا ، ئەمان هەر چەقی بوون ، هەنگاویان هەڵنەدەهات بکەونەدوای ، لەگەرداوی مەبەست و لێکدانەوە تایبەتیەکانیاندا هەڵدەکشان و دادەهاتنەوە خوارێ ، ئەگەرچی لەسیمادا مات و هێور بوون .

بەسەر سامیەوە بەسەرو چاوی یەکتردا هەڵیان ڕوانیەوە ، پاشان قالە رووی بۆلای دواپێچی ڕێگاکە گوێزایەوە کە خەریك بوو حەسەنی لێ ئاوادەبوو . برووسکەیەك لەمێشکیدا ، هەموو یادگارەکانی منداڵی و لاویەتی هەردووکیانی هاتەوە بەرچاو ، وای هەستکرد کەحەسەن هەر ـ میری لاوان ـ ەکەی جارانەو ، تاکو تەنیا بەناو کۆڵانی گوندەکەیاندا تێ دەپەڕێت ، هەناسەیەکی هەڵکێشا ، چاوی بۆلای دەرگاکەیان گوێزایەوە ، هێشتا خونچە ڕاوەستابوو ، کچەکەی لەباوەشداو بۆ لای حەسەنی دەڕوانی ، پێش ئەوەی حەسەن لەچاو وون بێت ئاوڕی بۆدواوە دایەوە ، دەستێکی ڕاوەشاند ، خونچەیش دەستی نازەی کچی بۆهەڵبڕی و ، ئەنجا چووە ژوورێ .

گوللەی بەر لوولەکانیان ڕەواندەوە ، دەمانچەکانیان پێچایەوەو خستیاننە بەرۆکیان ، ئەمەندەیان بۆژێر پشتێنەکانیان داخزاند لەڕۆیشتندا هەستیان پێنەدەکرا ، ماوەیەکی کەم بێدەنگ مانەوە ، هیچیان لەگەڵ یەکدا نەووت ، ڕقێکی خەست دەی کرۆشتن ، بەوو دوا هاتنە دەرێ ، بە ناو کۆڵانە تەریك و تەنگەبەرەکاندا بەرەو دەرەوەی شار دەرچوون ، بەڵام جووت نەکەوتنەوە ، هەریەکەیان بە خولیای خۆیەوە ڕێگایەکی دی لەبەر گرت .



ئەبوو سەعات حەوتی بەیانی ئەو چوار شەممەیە حەسەنی مام سلێمان بکوژرایە ، کەچی نەکوژرا .

حەسەن لاوێکی کەڵەگەت و چوارشانەی گەنم ڕەنگ بوو ، چاوەکانی ڕەشی تێرو لە قووڵاییدا نیشتوو بوون ، لووتی بەرانیی و قژە پڕەکەی تاسەر تەوێڵی دەهات . تەمەنی لەبیست و پێنج ساڵیدابوو ، لەبەر قۆزیی و لەسەرخۆیی کیژی گوندەکە ناویان لێنابوو ـ میری لاوان ـ تادوو ساڵ لەوەوبەر لەهەمان گوندی قالەو ڕەشەدا دەژیا ، هەر لەوێ لەدایك بووبوو ، دوای تەواوکردنی قوتابخانەی سەرەتایی بە تەنیا هاتە شارو لە ماڵی خزمێکی مایەوە تاخوێندن تەواو بکات ، پاش سێ ساڵ باری شاری لێئاڵۆزا ، بە ناچاری دەستی لەخوێندن هەڵگرت و گەڕایەوە گوندەکەی ، لەگەڵ باوکیدا شانی دایەبەر کار ، لەکێڵگەکەیاندا بەدەم جووت و تۆو وەشاندنەوە گۆرانیی بۆیادگارەکانی قوتابخانەو گوندەکەی دەووت . ساڵ و ڕۆژ تێپەڕین و گۆرانیی حەسەن بوونە فریشتەی سپی و بەسەر چاوەکانی خونچەوە نیشتنەوە . ئەگەرچی حەسەن هاوڕێی گیانی بەگیانی قالەی برای خونچە بوو ، بەلام چەندی کرد نەیتوانی لەبەر شەپۆلی نیگا قووڵەکانی خونچەدا خۆی بگرێت ، لە سەرەتایشەوە بنیاتی خۆشەویستیەکەی لەسەر پاکی و جوامێری دانا ، تەنیا ئاواتی خواستنی بوو . پاڵ درەخت و سەرکانی نەما نەبێتە جێ ژوانیان ، باڵای خۆشەویستییان لەو درەختە بەرزو چڕگەلایانە دەچوو کەهەموو درەختەکانی تر لە خوارەوە تێیان دەڕوانین . کەهاتە سەر داواکردنیشی باوکی خونچە چووە سەر کەلی شەیتان ، ئەو خونچەی بۆژن بەژن دانابوو ، ژن بۆ قالەی کوڕی،قالەیش نە دەستی هێنایە ڕێگای باوکی و نەکۆی لەسەر زەنشتی ویژدانی کرد . کەس لەو گوندەدا نەبوو بەو خۆشەویستیە گەورە بێ نەزانێت ، کەچی هەموویان بەردێکی بێهەست و هۆش بوون . کەس نەیدایە پاڵ ئەو دوو دڵەمەزنە . حەسەن بێخوشك و برابوو ، گوندەکەی لەبەرچاوەکانی خونچە خۆش دەویست ، کە باوکی خونچە ئەو بڕیارەیدا ، دنیا لەپێش چاوی حەسەن ڕەش بوو ، وای هەستکرد تاقە مرۆڤێکە لە گێژەنی دەریایەکدا بەرەو خنکان دەچێت ، کێ هەیە چاوی لێنەبێت ؟ کەچی یەکێك دەستی بۆ درێژناکات ، تەنانەت هاوڕێکەیشی .

دواجار بوو کە لە تاریکە شەوێکی ئەنگوستەچاودا لەگەڵ خونچەدا ژوانیان گرت ، بەچرپە کەوتنە دوان ، خونچە ووتی :

- دوابڕیارت چیە ؟

- زۆرم بیر لێکردۆتەوە ، جارێك دەڵێم باوکت یان ڕەشە بکوژم و هەڵبێم ، پاشان پەشیمان دەبمەوە ، چونکە چاری ئەم گرفتە نیەو دەبێت بەپێی خۆم ڕوو لە بەندیخانە بکەم و تیایدا بڕزێم ، هەرچەندە لەسەر هەقیشم ، کەچی دەبێت بڵێم تاوانبارم ، کوشتنیش ڕێگایەکی دزێوو گرانە .

- حەسەن بیر لەڕێگای تر بکەرەوە ، ئەمەیان ترسناکەو منیش دەکرێمە قوربانی .

- هەڵت دەگرم ، هەرگیز نەمدەویست گوندەکەمان بەجێ بهێڵم بەلام ئەوەتای چاوم کردۆتەوە دەیانی وەك خۆم و تۆم بینیوە بەیەك نەگەیشتوون ، وەك ئاژەڵ دراونەتەبەر و ملیان بۆ ئەم ڕووداوە گەندەڵانە شۆڕ کردووە ، ئەنجامیش خێزانێکی بێخێر دەرچوون ، من نامەوێت وابژیم .

- بۆ کوێ بڕۆین ؟

- بەرەو شوێنێکی دوور لە ئێرە ، بەرەو شارێکی تەریك .

- کەی ؟

- پەلەت نەبێت ، دوای مارە کردنت .

- بۆدوای مارەکردن ؟

- ئەمەوێت ببیتە ژنی شەرعی ڕەشە ، تا داخ و ئازارەکەی لە خەمی قالەی برات کەمتر نەبێت .

- حەسەن ئەترسم دەرفەتمان دەست گیر نەبێت و زوو بمگوێزنەوە .

- من ناترسم ، ئەو ڕۆژەی مارەت دەکەن بۆشەوێ هەر لەم کاتەدا لێرە ئامادەبە ، با ئەم پەڵەی شەرم و ڕسواییە بەناوچاوی هەردوو خێزانەکەوە بنێین .

★★★

جاران گوندی مێرگوڵان و ناوی حەسەنی مام سلێمان وەك ڕەگ و قەدی درەختێك وابوون ، ئێستا حەسەن بۆتە گیاندارێکی تەریکە وولات ، کە بەیانی لێدەهات تاپڕەکەی دەکردە شان و دەیدایە چیاو لێڕەوار ، دەیویست بە تەنیابێت ، تەنیاییەکی هێمن و کڕ ، لەبن هەر دارێکدا سکاڵای دەکردو ، لە پاڵ هەرتاشە بەردێکدا یادگارو خەمەکانی خۆی دەگێڕایەوە ، وەك دواجاری بێت ڕێی بکەوێتە ئەو مەڵبەندانە ، لە قەدی دارا نەخشی دەکردو بەسەر بەردەکانەوە ناوی خۆی و خونچەی هەڵدەکەند ، تا ڕووناکیی بەسەر گوندەوە بمایە نەدەهاتەوە ، شەوانیش جگەرەی دەکێشاو بیری هەتەر دەبوو . شەوێك

- یکی بی ی ووب :
- کوڕم .. خونچە لە هەموو کارێکی کردوویت ، تەنانەت ـەمەتی باوکیشت نادەیت ، جاران بێ قالە هەڵت نەدەکرد !
- هۆوریێوا بۆ ئەوە چاکە شەرمەزارو سەرنەوی لای خەیمن کریت .
- کچ لەوولات نەبڕاوە ، تۆیش لاوێکی بێچارەو نابووت نیت کەس پێت‌رازی نەبێت . با پێش مردنم چاوم بەکچو کوڕت کەوێت .
- ڕاست دەکەیت دایە ، خۆیشم بیرم لێ کردوتەوە ، خوا یکت بەدڵی ئێوە ئەبێت .

هەندێك جار لەتەنگی ئێوارەدا حەسەن دەپەڕیە سەر حیژەکەو بۆ ڕێی کانی چاوی هەڵدەخست ، کەخونچەی حبینی دەگەشایەوە ، وای هەست دەکرد دوو مەلی پەڕو باڵ سپن و بەهەوادا دەفڕن ، زۆر لە بەرزیەوە تەماشای ناو گوندەکەیان دەکەن ، دیمەنێکی تەماوی بەر چاویان دەگرێت ، پشان دەدەنەوە شەقەی باڵ بەرەو ئاسۆ رەو دەکەن ، لەوێوە ـەرەو دنیایەکی بێ کۆتایی دەڕۆن ، تا لە باوەشی پاکی سروشتا ـەست لە گەردنی یەکتر دەکەن . خونچەیش کە ئەمی دەبینی نیستی دەکردو گۆزەکەی سەر شانی دادەنا ، چاوی تێ دەبڕی ، ئاگای لەدەوروبەری خۆی نەدەما . خونچە ـرزەکیویەکی سرك و سۆڵە ، تەنیا دەستەمۆی حەسەنەو بەهەر کەسێکی‌تر نامۆیە . لەچکەکەی لەسەری دەکردەوەو کەزی ڕەشەکەی وەك بەندیەکی ئازاد کراو تا کەمەری ـەکشا ، خونچە دەیزانی حەسەن چەندی لەو قژە خۆش دێت ، گەلێك جار بۆی هۆنیوەتەوە ، یان وەك مندال سەرو چاوی خۆی تیا شاردۆتەوەو بەسەر شان و ملیا هاتۆتە خواریێ ، یان پەلکەکانی کردۆتە سەرین و خەوی خۆش بردوویەتیەوە . خونچە لەخۆی بێ ئاگا ئەبوو ، کیژێکی هاوریێی لە پەنایەوە تێهەدەخوڕیو دەیهێنایەوە سەر خۆی ، ئەوسا گۆزەکەی هەڵدەگرتەوە ، دەکەوتەوە ڕێ ، بەلام چاو و هۆشی هەر لای حەسەن بوو .

بەیانیەك گوند شڵەقا ، چرپە کەوتە ناو خەڵك و هات و چۆ کردن گەری تێکەوت ، حەسەن و خونچە نەمابوون . هەموو خەڵکی گوند دەیانزانی چیان لێ‌هاتووە ، لێویان دەکرۆشت و چیای ڕقیان بەسەر خۆیاندا دەباراند ، وایان هەست دەکرد نامووسی گوند لەکەدار کراوە . دەبوو حەسەن و خونچە بۆ یەکتر بوونایە ، چونکە خۆشەویستیەکەیان گەورەو پاکژ بوو ، کەچی کەئێستا بە یەکتر براون نەفرەتیان لێ‌دەکەن . حەسەن و خونچە بوونە بەردی بن گۆم ، کەس نەی زانی بۆ کوێ سەری خۆیان هەڵگرتووە .

★★★

شەوانی قالە ڕێبوارێکی شەکەتن و هەنگاوی سست دەنێن ڕۆژیش تاوێرێکی قورسەو بەناوشانیەوە بەستراوە . لەشی ماندووی خەوە ، کەچی خەو پەی بە چاوەکانی نابات ، کاروانی لێکدانەوەکانی قالە بەرەوەژ و هەڵدێرا سەر دەکەون و دادەگەڕێنەوە ، شەپۆلەکان دەیبەن و دەیهێنن ، بەرەو گەرداو ڕای دەدەن ، پەل دەهاوێ و ماسوولکەو دەمارەکانی گرژدەبن ، دەڕوات ، هەناسەی سوار دەبێت و لەوەدایە بخنکێت ، لە پڕا ڕای دەدەنەوە کەنار ، لێدانی دڵە ئەسرەوتەکەی هێور دەبێتەوە ، خۆی دەکێشێتە ووشکانی ، بڕ بە سیەکانی هەناسەی قوول دەدات ، کەم کەم دەحەسێتەوە ، پەنا دەباتەوە بەر پێلوە شەکەتەکانی ، دەیەوێت هەدایەك بدات ، جارێکی‌تر دیمەنەکانی لێ‌دەوروژێن ، دیمەنەکان سوپای ئەسرەوتن ، بەرەو مێشك و دەروونی هێرش دێنن ، دەبنە ئازارێکی چنگ و پل ئەستوورو بەهەموو لەشیا دەگەڕێن ، ماندوو دەبێت ، ڕوو لەچیاکەی بەرانبەری دەکات ، حەسەن و خونچە دەستیان لە گەردنی یەکدایە ، کیژەبچووکەکەیان لەپێشیانەوە هەنگاوی کورت دەنێت ، جار جار دەخزێت ، حەسەن پەلیکی و خونچە ئەوی تری دەگرێت . حەسەن هەر لاوە خوێن گەرمەکەی جارانە ، ڕادەوەستێ و دەست بە گۆرانی دەکات ، دەنگە سازەکەی هەڵدەبڕێت ، چیا دەنگ دەداتەوەو ، وەك زرەی باڵی پۆلە کەوێك بەهەوادا و بەرەو پێ‌دەشت سەر دەکێشێت ، دەبێتە سۆزێکی خودایی و جیهانە ماتەکە دەلەرزێنێت ، پاشان هێدی هێدی کەرۆیشکە بەهەموو گوێچکەو دەروونێك دەکات و کر دەبێت .

خونچەش کەوێکی بەخەت و خاڵە ، بە دەوری حەسەندا دەگەڕێت ، پاش و پێشی لێ دەکات ، دەست دەخاتە ناو دەستی ، ئاوازەکان لەگەرووی حەسەندا خۆشتر دەبن ، کە لە دوورەوە ئەم دەبینن حەسەن هاواری لێ دەکات : قالەی هاوڕێم ، تۆ برای خونچەو خالی ئەم کیژە بچووکەمیت ، من و تۆ هاوڕێ و خۆشەویستی یەکدی بووین ، کام بن دارو سەرکانی

هەیە راومان تیا نەکردبێت ، کام ماڵی گوند ماوە شەومان بەیاری و گۆڵەزتیا نەکردبێتەوە ؟ ئای کە هاورێیەکی بێ پەیمان دەرچوویت ، ئێستا دەتەوێت بمکوژیت ؟ !

ئەو هەفتەیە قالە شەوو ڕۆژی لێ بوو بووە یەك ، جێگای بەخۆی نەدەگرت ، وای هەست دەکرد تاوانبارەو دەیەوێت چیای تاوانێکی تریش لە ئەستۆی بنێت ، ئەگەر ژن بەژنی لەگەڵ ڕەشەدا نەکردایە تووشی ئەم چارە نووسە نەدەهات .

ئەم خوشکی لە دەست چوو ژنیشی پێنەبرا ، لە گوندە کەی تەرە بوو ، لەگەڵ کوشتنی حەسەندا دەبێتە خاوەن ژن و ماڵی خۆی ، ئەمە پەیمانی ڕەشەیە ، بەڵام لەکۆست و مەینەتی ی کەسانی ترەوە ئەمە دێتەدی . ڕوو بە ڕووی کارەساتێکە لەرێگای هات و نەهات دەچێت ، نامووس گرانەو حەسەن شەرمەزاری کردووە ، شەرمەزاریەك کە لەراستیدا ئەم خۆی دەستی تێدا هەیەو دەیتوانی نەهێڵێت ڕووبدات ، حەسەن دەکوژرێت ، بەڵام دەبێت تامردن نەفرەت لەخۆی بکات ، نەفرەتێکی سەرومر ، منداڵەکانیش دەبنە بێچوە گورگ و هەتا هەتایە چەشەی تاوان و نامەردی دەبن .

قالە سەری کاس بوو ، پەنجە تیژەکانی تاوان وەك زەردەواڵە ورووژانە سەرمێشك و دەروونی ، چاوی تووند نووقاند ، هەردوو لەپی دەستی لە لاجانگی گیر کردو پەنجەکانیشی بەرەو تەوقە سەری درێژ بوون ، سەری گوێی ، زیاتر گوێی ، تاتەواوی کارەساتەکان لەبەرچاوی وون بوون ، ئەوسا سەرە قورسەکەی بەشەکەتی کەوتە سەر مەچەکی و ئەژنۆکانی لەنگەریان ڕاگرت ، تا بێئاگایی وەك شەپۆل دایە بەرو ، بەرەو گەردلوی دی سەری پێهەڵگرت .

* * *

سەعات حەوتی بەیانی ی ڕۆژی چوار شەممەی ئایندە دەبوو حەسەنی مام سلێمان بکوژرایە ، کەچی نەکوژرا .

ڕۆژانی چوارشەممە وەك لەباوك و باپیریانەوە بۆیان مابووەوە ڕۆژی تۆڵەی گوند بوو ، هەموو نەخشەیەکی تۆڵە کە لەو ڕۆژەدا بکێشرایە سەری دەگرت .

ڕەشە زۆر زوو خۆی گەیاندەوە خانووە تەواو نەکراوەکەی سەرووی ماڵی حەسەن ، لەهەمان جێگای هەفتەی پێشوویاندا دەستی بەجگەرەکێشان کردەوە ، دەمانچەکەی دەرهێنا ، ئەم دەست و ئەو دەستی پێکرد ، چاکتر لە جاری پێشوو تێ ی ڕاما ، خانە پڕو دیارەکانی لەچاوی نزیك خستەوە ، دڵی حەسەنی هێنایە بەر لولکەو گوللە سوورەکەی نایە سەر ، بە خۆی ووت : (تەنیایی زۆر چاکترە ، ئەگەر شەریك باش بوایە خوا یەکێکی بۆ خۆی دادەنا ، لە سەرەتاوە هەڵەم کرد بە قالەم ووت ، کێ دەڵێ بەزەیی بە خوشکەکەیدا نایەتەوە ؟

یان هاورێیەتی حەسەن پەشیمانی نەکردوتەوە ؟ ئەی کەوایە ئەم شەڕی دەست پێشکەرییەی بۆ لەگەڵدا کردم ؟ . کاشکی بەجووتەو لەیەك کاتدا دەستڕێژمان لێبکردایە ، ئێستا هەفتەیەك بوو لەم مۆتەکەی ڕق و بێزاریە ڕزگار بوو بووم ، نەچوە بچێت ، ئەمڕۆ هەمووشت لێك دەبێتەوە) .

لێکدانەوەکانی ڕەشە وەك گۆماوێکی لیخن شڵەقا ، کاتێ کەیەکێکی تر زۆر بە پەلە خۆی بە خانووەکەدا کرد ، دیار بوو لە دەمێکەوە بەرێگاوەیە بۆیە هانکە هانکیەتی ، خۆی کوتایە ژووری و ئارەقەی ناو چاوو لاملی سری ، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا ، جگەرەیەکی داگیرساندو بەرەو ژوورەکەی پشتەوە چوو ، کە ڕەشەی بینی سڵەمیەوەو وەستا ، ڕەشە پێ ی ووت .

- ئەوە بۆ هاتوویتەوە ؟ جاری پێشوو لێت تێکدام ، ئێستا چیت دەوێت ؟

قالە وەك لەبەردەم بڕیارێکی گەورەدا دەستەوەستان وەستابێت بێدەنگ بوو ، پاشان وتی :

- پەشیمانم .

- زۆرچاکە قالە گیان ، دەمزانی هەر هەق دەدەیتەوە دەست من ، کەمێك دەترسام ، چاکت‌کرد هاتیت .

- نە ڕەشە ، ئەمەی کەکرا تاوانی هەردووکمانی تیایە ، تۆش چاك دەتزانی ئەوەدوانە دڵداری یەکترین و پێویستە بۆ یەکترین ، کەچی لات خەوش نەبوو بیخوازیت ، لات گران نەبوو نامەردیەك بەرانبەر بەحەسەنی هاوڕێمان بکەیت . ئێستاش دەمانەوێت باری تاوانەکە زیاتر لەسەر خۆمان گران بکەین .

- مەبەستت چیە ؟ .

- دەڵێم با ئەم کارە نەکەین ، من واز لەخوشکت دێنم بۆخۆت بیدەرەوە بەژن ، با ئەم لۆمەیە بەسەرشانی منەوە بێت ، دێمە شارو گوێ لەکەس ناگرم .

- تۆ ترسنۆکیت ، نامووس لای تۆ وەك پەڕۆ وایە ، باوو

حەوسەڵەی نەفرەتت لێ دەکەن .

قاڵە وەك خەنجەرێك بەناو دڵیا بچەقێت وای لێهات ، تیکی خەست هێزی بۆهێنا ، گرژبوو ، دەستی بەناوچاویەوە گرت و لەسەرخۆ ووتی :

- من ناتوانم ، تۆ جانەوەرێکی بێ ڕەوشتیت .

ڕەشە بێدەنگ چاوی تێبڕی ، چاوەکانی لەکلێەی گرە دەچوون بەرەو پاوانێکی ووشك بووهێرش بەرێت . نەی ..مر چی بکات ، ویستی گوللە سوورەکە بەرەو دڵی ئەو ..کەوە ، کەمێك ڕاما ، لەوکاتەدا خۆرەکە لە بەرانبەریانەوە ..سەر لووتکەکانـدا هەڵکشا ، تیشکە زەردباوەکەی کردە ..ەکەی گەڕەکی شار ، ئەوکاتە سەعات حەوتی تەواو بوو ، ..ەکەی ماڵی حەسەن کرایەوەو هاتەدەرێ ، قاڵە سەری ..ەوە وەك جاران هاتەوە بەرچاوی . خونچەیش وەك جاری ..ەوە بەمندالەکەیەوە لەپاڵیا وەستاو هەستی ڕاگرت ، حەسەن بەدرێژایی ڕێگاکەی ڕوانیی ، ئەوسا کچەکەی ماچ ..ەوە پەنجەووردیلەکانی لە ناودەستیا گوشی . دیمەنی ئەو ..ە لەبەر چاوی قاڵەدا درەختێکی قەد ئەستووری پڕ لە ..ندکەڵا بوو ، کە هەرئێستا لەبنەڕەتەوە هەڵدەتەکێنرێن .

..ماشاکردنێکی ترسناك نیگای ڕەشەو قاڵەی بەیەکتر ..یاند ، نیگای قاڵە پڕلە بەزەیی و پاڕانەوە بوو ، وەك بڵێت : با ..م تاوانە نەکەین . چاوی ڕەشە سوور داگەڕابوون و ڕەنگو ..ی لە دڕندەیەکی مەترسیداری دەکرد ، قاڵە ووتی :

- ڕەشە وادیارە ناگەینە ئەنجام ، بابیخەینە هەفتەیەکی تر .

- نەء .. لەدەست خۆمی نادەم .

- هەر دەتەوێت بیکوژیت ؟ .

- بێگومان ، وەك تۆ ترسنۆك و بوودەڵە نیم .

ڕەشە دەمانچەکەی هێنایە سەرپێ ، قاڵەیش لەسەرخۆ بە نابەدڵی گوللەکەی لەبەرنا ، حەسەن گەیشتە ئەوشوێنەی ..تەوێڵ کەوتە بەرنیشان ، قاڵە چاوی لەڕەشە بڕی ، هەرکە دەستی بەرزکردەوە ئەم بواری ئەوەی نەدا پەنجە بە پەلەپیتکەدا بنێ ، نالەیەك هات و ، ئەو تاقە گوللەیەی هەفتەی ..شوو بۆ حەسەنی دانابوو بەرەو تەوێڵی ڕەشەی ڕادا ، تەنیا هاوارێك و ڕەشە بە پشتا ڕەهێڵ بوو ، قاڵە دەمانچەکەی ..بەرباخەڵی ناو بەرەو پشتەوەی خانووەکە هەڵات ، حەسەن بە پەشۆکاویەوە خۆی دایە پاڵ دیوارێك ، کەوتە چاوە چاوو بەناو پاسار ، خونچەیش هاواری لێ هەستاو کچەکەی لەدەست بەڕێ بەڕاکردن بەرەو لای حەسەن هات . چەند کەسێکی تریش بەرەو لای خانووەکە هاتن و پێکەوە چوونە ژوورێ ، حەسەن لە دوایانەوە بوو ، کەلاشەی بەردەم دەرگاکەی بینی بڕوای بەچاوی نەکرد ، بەسەرسامیەوە زیاتر لێی نزیك کەوتەوەو چاکتر تێی ڕوانی ، چاوی کوژراوەکە بەئەبلەقی بەبن میچی دیوارەکەوە ڕوا بوون ، خوێن بە سەرو چاویا هاتبووە خوارێ و لە لاملیەوە بۆناو ووردە بەردەکان داچۆڕا بوو . کە خونچە لاشەکەی بینی لەوەدابوو هاواربکات ، بەلام حەسەن دایە پێشی و هێنایە دەرەوە ، بە هەنگاوی گورج بەرەو ماڵەوە هاتن ، لەڕێگادا نەکەسیان تەماشای ئەوی تری دەکردو نە پرسیاریان بەرەو ڕووی یەکدی ئەکردەوە . کچەکەیان بەگاگۆڵکێ و گریان بەرەو لایان دەهات ، حەسەن هەڵیگرت و چوونە ژوورێ . هەرکە دانیشتن خونچە لە دەرگای بێ دەنگیەکەی داو ووتی :

- حەسەن ئەمە چیە ؟ . خۆ ئەوە ڕەشەبوو ! .

- دەزانم .

وەك هیچ پرسیارێکی ترنەمابێت چاویان لەیەکدی بڕی و بێدەنگ بوون ، کەمێك و خونچە پرسیەوە :

- تۆبڵێی حەسەن بۆتۆ دانەنیشتبێت ؟ .

- بۆنا !

- ئەی ئەمە چی بوو ؟ .

- نازانم ، تەنیا گوللەیەك و هیچی دی ، دەمانچەکەی ڕەشەش لەسەرپێ بوو ، لەوە دەچێت فریا نەکەوتبێت .

- ئەی کێ ئەمەی کردبێت ؟ .

- پاش تەقەکە گوێم لەدەنگی ڕاکردنی یەکێك بوو لەپشت خانووەکەوە ، لە دواوە بینیم ، بە بالاو قەلافەتیا لە قالەی برات دەچوو .

خونچە بەتاسەوە چوو ، تەواو ڕەنگی هەڵبزرکاو لەوەدابوو بکەوێتە سەرزەویەکە . حەسەن پێی ووت :

- مەترسە ، کاتی پەشۆکان و داماوی نیە ، دیارە ئەو درکەزیانەی ئاگرمان پێوەنا خەریکە بلێسەکەی خۆشتر دەبێت .

- ئەی ئێمە چی بکەین ؟ .

- ماڵ کۆکەرەوە ، دەڕۆین بۆ شارێکی تر .

«1982»




● ریڤەبەرێ قشلێ کارێن خو بدویماهی ئینان و هێڤ کری دەمێ چونا مالە .. دەستێ خو بجلکێن خودا ئیناو زڤڕی چاڤێ وی ب (سیسو)ی کەفت هێشتا ملێ وی پێ ب دیواری ڤە هەچکو ب وێری ڤە پەچرویمە بوی .. !
گازی کرە جەندرمەکی :

- وەرە ڤی کوڕکی دگەل خو ببە مال و خارنێ بدێ هەتا سوبەهی‌دا بزانین کا دێ چ رێ بو بینین ..
- بەلێ ئەزبەنی ، دەستێ خو بلندکرو سلاڤەك بو ریڤەبەری وەرگرت ،

دەستێ زاروکی راکێشا ببەری خو ئێخست و ژ قشلێ دەرکەڤت ب پرتە پرت ڤەدگو :

- بەلێ دێ پەلاڤ و کادا دەمێ .. ئەڤە چ بەلابو خودێ بو من ئینای . ؟ ئەز دترسم ب مینتە لسەر گوهێن من ، هندی حالێ من پێ خوشە ، من چ نینە ئەز بخوم ، ڤێجا وەرە ئەزێ چارسێویا ب خودانێ دکەم ئەڤەژی ب هێتە سەر ئەڤە پێنج .. ئان هندی روژانێن من گەلەکن جەنابێ ریڤەبەر ، دێ بلا تە دگەل خو بربا مال ، تویێ گوشت و مریشکا

ب سەر سەرێ خوڤە د هاڤێژی ، هەما ئەو بەرتیل بەسێ ئەوێن تو هەرو رادکێشیە مال .. !! گاڤەکێ تورمبێلەکا مەزن دیاربوو هات ، رویێ جەندرمەی گەش‌بوو گورتژی و چاڤێن وی تەیسین دەستێ خو لێ‌هژاندو گوتە (سیسو)ی سویاربە خالو ئەڤە دێ تە بەتە مال .. دەرگەهێ تورمبێلێ لێ‌پێڤەداو لسەر پێ خو زڤڕی‌ڤە قەستا کولانێ کر ..

- کی دزانیت ، سوبەهی دێ بێژمە ریڤەبەری ئەزبەنی رەڤی مالا من ژی دزی و چو چ کون نەمان ئەز لێ نەگەڕییم ..

(سیسو)ی ژی خو کرە قورمك دنیڤا تورمبێلێ‌دا هەچکو دەهبەی داعویرای و چاڤێن خو ژ خەلکێ وەرگێڕان نەدهێلا چاڤێن وی ب چاڤێن کەسێ ب کەڤن ..
نێ چاڤن بەر پەنێن دلی ئاشکرا دکەن .. هەبوو نەبوویێن مروڤی تێرا دبرسقن .. وی‌ژی نەدڤیا کەس چ ژێ بزانیت ژ هەمی جیهانێ دترسیا هەمی لبەر چاڤا ببونە جەندرمە ببونە ژن‌ماما وی ، شوفێری گازی کرێ بینە پارێن خو ..

- ها .. پارە .. پارە .. !! (سیسو)ی سەرێ خو بچوکێن خو ڤەنان گەرماتیەك ب لەشی داهات .. پارە .. پارە .. !!
- خو خشیم نەکە ئەز هەوە هەمیا دنیاسم چ فێل‌بازن ، دێ پارێ خو دەی ئان تە بینمە خارێ .. ؟

نەهەرێ (سیسو)ی گوهێن خو کرنە بەرك و ب سەر خو دادان

- برا دێ ژێ‌ڤەبە کانێ چ خولی سەرە ما دێ پارێ وی بوتە بیتە چ .. ؟ ئەڤە سەد فلسێ وی ئەز دێ دەم .. پیرە مێرەکێ دەستێ خودا بەریکا خو ...

(سیسو)ی بێهنا خو هەلکێشاو دبن چاڤێن خوڕا هێڤ کرە پیرەمێری هەچکو دبێژتێ تو بتنێ گورگ نینی ، تو وەکی بابێ منی ..
چاڤێن خو نەقاندن و هەمی مویێن لەشێ وی دکو ئەزێ بتنێ مە من دگەل خو ببە ... لێ پیرەمێری هایژ ڤی حالی نەبو .. لناڤ بازارێ تورمبێلێ خەلك رامالشتن ، هەر ئێك بخو چو (سیسو) تێ نەبیت ، وەکی مێرویا ژ رێزا خو بەرزە بوی هێڤە هات و وێڤە چو ، چاڤێ وی ما زل ل دوکانەکێ شویشەکێ مەزن پێ تژی (خوشاف) پێ لبەر دەری تشتکێ تێدا دزڤڕیت تڕارێ تژی دبن و خەلکێ ب سەر دەڤێ خو داوکەن قورچەك ل گەویا خوداو چاڤێن خوی ب

شویشەی ڤەنان ، دەستێ خو یێ پەق پەق بكراسێ خو یێ قرێژیدا ئینا هەتا گەهشتیە بەریكێ خودێیە بەلكی پارەك تێدا زابیت ، هەرچەندە وی چ جارا پارە د بەریكا خودا نەدیتینە لێ خەلك یێ وەدكەن دەستێن خو دبەنە بەریكێن خوو خش خش یێ پارا دئینە دەر .
خودانێ دوكانێ لێ هەیتاند :
ویڤە هەرە كورو ، رێكا خەلكێ بكە ، چییە وەكی مێشا شڕ تو ب وێرێڤە نویسیای ؟ سڤك رێكا خو گرتو بدویر كەڤت .. لێ كیڤە ... ؟ نزا .. !! جەندرمەی گوتێ دێ چییە سال ، كیش مالێ .. ؟ ! وی چ جارا ئەڤ جهە ، ئەڤ شیشلتا مروڤا نەدیتیە .. !!
دخوزی ئەو دوكانا هەنێ ئەوا یارییێ بجویكا دفروشیت مالامن با ، شوینا وی زك مەزنێ لبەر بابێ من لبەربا كانێ تو بابو .. كا بابو ..» ؟
روندكەك ژ چاڤێ وی یێ كی گرتی ڤەڕەست وەكی ستێرا رژیای ئێكا دێ دا دویڤ ..
كەڤتە ناڤ قەیسریا بازاڕی هندی چەپەكێ دچیت دزانیت قورجەكێ لیمێ بەرزە تر دبیت ...
بوچی مامێ من گوهێ خودا وێ هرچێ ئەوا ژنماما من .. ئەز هوسا بەرزە كرم .. دەنگێ مامێ وی دگوهیدا دەنگ ڤەدا :
جەنابێ رێڤەبەر ، ئەز نەشێم بخودان كەم بدلێ ژنكا من نینە ، من ژی نەهـ زاڕو هەنە ، ژیان ژی یا ب زەحمەتەو ئەزێ دەست كورتم ..
ئەز بەنی من دل نەدا بەدەمە كولانا من ئینا ڤێرێ بەلكی خێرخازەك بیەت بخودان كەت ..
پا كەس و كارێن وی ژبلی تە .. ؟
قوربان بابێ وی نەمایە ، كەسی نزانیت چەوا .. !! دایك ژی یا گۆری حازرا بوی و كەسێ دی نینە ...
نە .. نە .. بابێ من نەمرییە .. !! بیرا من دهێت بەرێ سپێدێ دایكا من نان بو كرە جانتكێ و جوخێ وی دا ڤێ و گوتە من هش بە بنڤە ، دێ بابێ تە چیت بەرِوی و گوپهشكا ئینیت .. دێ هێتەڤە .. دێ هێتەڤە .. هـەكە من زانیبا بخوینم دا زانم نوكە ل كیڤەیە دا كاغەزەكێ بو هنێرم بێژمێ وەرە بێژە ڤانا هێشتا تو یێ ساخی ... نێ ئـەوێن دزانن بخوینن و بنڤیسن هەمی تشتا دزانن نوكە رێڤەبەرێ قشلێ ژی دزانیت ، نێ پێ نڤیس د دەستادا بو ، بوچی بابێ من نیشا من نەدا .. ؟؟
گەهشتە لێڤا جادەكا مەزن پێین وی خاف بون و وەستیا پالا خـو دا دیـوارێ و خـو بـەردا عـەردی .. ڤێجـا كیڤـە بچیت .. ؟ !
ل ڤی بازێڕێ هندێ بەرفرهە چ كولك نینن خەون و هیڤێن وی بحەوینن .. هندە بو تاری .. ل ڤی بازارێ هزار رەنگێن خارنێ لێ چ تشت نینن زكێ وی یێ برسی تێر كەن ..
ل ناڤ ڤێ كونزڤیركا مروڤا چ سینگ نینن سەرێ خو پێ ڤەنیت .. چ دەنگ نینن لایێ لایێ دبـەرا ب سترینن ، . بلورینن .. ڤەلەرزینا هەستێن وی یێن زراف و بێ هێز و تژی ترسی راوستینن ...
بێهنا خو هەلكێشا ، بێهنەكا گەلە خوش هاتێ .. وەستیان و ترس ژبیر كرن راست رابو سەر خو ، وەكی كێتكێ دڤنا خو كرە ستێرك و ل دویڤ چو .. دیت ، ئەوێ هەنێ زەلامەك یێ لبەر هندە پەلێت گەش ل رەخێ دێ یێ جادێ .. كریسك یێ ژ ئاگری دفڕن و كزێنا گوشتیە لسەر .. چاڤێ وی ما ل پشكا ، كزێنا وان و یا دلێ وی تێك هەلبون و ئاڤ بدەڤیدا هاتە خوار ، چەندێ برسییـە ئەڤـە دوهی نیڤرو فـراڤێن خاری ..
جیهان ژی تێر تاری ببو ئێك جار روناهیا پەلا گەش ببوو ددا وارا ... بەزی و چاڤێ وی یێ ل پەلێن گەش :
- مروڤێ هەنێ یێ دیارە وەكی هەمیا نینە من نادەرێخێت یێ دكەنیت .. سەرو چاڤێن وی دبێ ئێشـك و كوریشكن دێ دەتە من .. یێ دكەنیت یێ دكەل من دكەنیت .. دوو سێ پێنگـاڤا چـو ، شرپ ، تـرەب و قورمێنـەك هـات خـەلك داجریان و بو چیرێنا ڤرڤرێن تورمبێلا ، ئێكی پرسی :
- برا ئەو چییە ؟ !
- بخـودێ نزا یێ دبێـژن لوریـا هـەنێ ل زاڕوكـەكی داو پەرچڤاند ، كەسی ژی نزانیت كوڕێ كێیە ..
كوڕێ كێیە .. ؟ كوڕێ كێیە ؟؟ خەلكی ژ ئێكو دو دپرسی ، هەر ئێك دترسیا نەكو كوڕێ وی بیت .. !!
بـابێ (سیسو)ی تێ نـەبیت چنكو ل چ شـوینا یێ دیـار نەبو ...

## چیرۆکی منداڵان



جوزا عولی ئەمین

« پێشکەشە بە پیرێژنە گوڵ فرۆشەکانی هەندەران »

نەنە ئامە پیرێژنێکی پیرو نوورانی بوو .. لە دووکانێکی تەختەدا .. رۆژ هەتا ئێواریٚ بە دەوری گوڵاندا دەهات .. ئاوی دەدان و بژاری دەکردن .. سبەینانەش گوڵەکانی چەپك چەپك دەکردن و لە دوکانەکەیدا دایدەنان .. منداڵی دەرو دراوسیٚ زۆریان خۆش دەویست .. زوو دەهاتنە لای و ئەگەر ئیشی هەبوایە بۆیان دەکرد .

رۆژیٚ لە رۆژان کۆمەڵێ منداڵ لە دوکانەکەیدا دانیشتبوون و سەیری گوڵانیان دەکرد .. ناو بە ناویش لووتیان دەنا بە گوڵانەوە .

نەنە ئامە بە منداڵەکانی وت :

- حەز دەکەم ئەو گوڵانە تێر تێر بۆن کەن .. بیرتان نەچیٚ هەموو رەنگەکان .

ئەوانیش بە قسەی نەنەیان کردو بەکوڵ و دڵەوە بۆنی گوڵانیان هەڵ دەمژی .

ئەوساش نەنە پێی وتن :

ئەوانە کامیان بۆنی لە هەموویان خۆشترە ؟

یەکیٚ وتی :

- ئەو گوڵە سوورە .

ئەوی دیکە هەڵی دایە :

- نەتزانی : پەمەییەکەیە :

- گەر لەمن دەپرسن دەڵێم گوڵی زەرد .

منداڵێ سەری هەڵبڕی :

- نا ، نا هەڵتان نەهێنا : ئەو گوڵە مۆرە بۆنی هەر تەواو نابیٚ .

نەنە بە دەمیانەوە پیٚکەنی :

- ئێستاش بە وردو خوردی بڕواننە رەنگی ئەو گوڵانە .. ئینجا پێم بڵێن ئاخۆ کام رەنگە جوانە ؟

منالان تاویٚ ڕوانیانە گوڵان و لەبەر خۆیانەوە کەوتنە چپە چپ .

- سپی .

- نا .. سوور .

- هیچیان نا ، شین :

نەنە ئامە بە منالانی وت :

- رۆڵەکانم دەگێڕنەوە دەڵێن رەنگ و بۆنیان جۆرێك بووە تا خوا حەز بکا ناشیرین ، بەڵام هەر یەکە بە جۆریٚ گەیشتە رەنگیٚ کە خۆی بە دڵی بیٚ .. .. ـەینیٚ یەکیٚ لەو رەنگانەتان بۆ دەگێڕمەوە .. ئەم وەختانە وەرنەوە .. بەڵام دوامەکەون .

* *

نەنە ئامە لەناو گوڵاندا دانیشتبوو ، مند.. ـیش لەکاتی خۆیدا گەیشتن .. گویٚ قولاغی چیرۆکی رەنگی گوڵان بوون . نەنە

حيكى بە ناودا گێران و پێی وتن :
- هەموو هاتوونەوە ؟
ـلان وتیان :
- کێ بێ دڵی بێ چیرۆك بەجێ بێڵێ ،
ـیێ ئەوەمان گێڕایەوە ، وتمان گوڵان ڕەنگ و بۆنیان وەك یەك جوە .. ئەوانیش هەر تاقمە ویستوویەتی ڕەنگ و بۆنی بۆ خۆی جیی .

لە ناو گوڵاندا بووبە مقۆ مقۆ :
- من دەمەوێ بە دوای ڕەنگ و بۆنێکی تایبەتیدا بگەڕێم .. کێ ـێ بڕۆین ؟
گوێ وەرامی دایەوە :
- من دێم بەڵام چۆن بچین ؟
ئەویش ڕووی تێکرد :
- بێ بەڵابێ دەڵێی ون بین .
- نا .. وا ناڵێم ، بەڵام ویستم بپرسم ئاخۆ لەکام ڕێگاوە خۆش و ڕێت و بێ ترسە .. با لەوێوە بچین .
- دڵ لەدڵ مەدە .. ناتەوێ ببینە خاوەنی ڕەنگی سەربەخۆی خۆمان .
- کەی بڕۆین ؟
- سبەینێ پێش هەتاو کەوتن .

* *

یەکێ لە مناڵەکان کەگوێی لە دەمی نەنــەوە نزیـك بوو وتی :
- نەنە گیان لەبەرت مرم .. ڕەنگ و بۆنیان بۆ پەیدا بوو یان نا ؟
نەنە وەرامی دایەوە :
- ئا باوانەکەم بەڵام پەلەت نەبێ .. ئەرێ گەیشتینە کـوێ ؟
ئێستا هاتەوە بیرم .. گوڵەکان ، ئەو دووگوڵەی وتمان بـەیانی سەر لەزوو ڕۆیشتن ، چەند چۆڵ و بیابانیان بڕی تا گەیشتنە سەر ڕووبارێکی سوور .. لەو بەرەوە مرۆڤێك ڕاوەستابوو بانگی کردن :
- ئەگەر دەتانەوێ ڕەنگتان سوور بێ لەم ڕووبارە بدەن و وەرنە ئێرە .. ئەگەر لە بۆنی خۆش دەگەڕێن لەم ڕووبارە بپەڕنەوە .
ئەو گوڵەی هەوەڵ جار وتی بـابچین ڕەنـگ و بۆن بـدۆزینەوە بۆخۆمان بەکابرای وت :

- دەبێ ڕووبارەکە زۆر قووڵ نەبێ
پیاوەکە وەرامی دایەوە :
هەر ئەوەتا گەیشتیە شەپۆلێك ئیدی شەپۆل دەتداتــە دەست شەپۆل .
گوڵەکە خۆی بە ڕووبارەکەدا دا .. شەپۆلەکانی بڕی و ئاوڕی لە گوڵەکەی هاوەڵی دایەوە و پێیوت :
- زۆر قووڵ نیە مەترسە .. دوامکەوە .
گوڵی دووەم هاتە کەنار و پەلەکانی تەڕ بوو ، ترسا نقوم بێ . گەڕایەوە .. دیتی هەر گوڵی سوورە و بەسەر ئاوەکەوە دەڕواو دەشتی کەنار ڕووبارەکە بـوّتە بـاخێکی سوور .. لەنـاویانـا گوڵەکەی هاوڕێی لە هەمـوویان بـاڵابەرزتـرە ئەمیش شــەرم دایگرت و ڕەنگی زەرد هەڵ گەڕا .
منداڵینە دەڵێن ئێستاش ئەمو ئەوکە دەترسێن و ڕەنگیان هەڵ دەبزرکێ ، دەیانەوێ یادی ئەو گوڵە زەردە بکەنەوە .

* *

بۆ سبەینێ ئێوارە منداڵان لە دووکانەکەی نەنــە دانیشبوون چاوەڕێ بوون ئاخۆ کەی نەنە دەست پێدەکا . نەنەش زمانی بەلێوەکانیدا هێناو وتی :
- ئێی نازدارەکانم : حەز دەکەن ئیمڕۆ لە کام ڕەنگە بدوێین ؟
مناڵێ وتی :
- ئەمشەو خەوم بە گوڵی سپییەوە بینی .. بەڵام بەیانی کاتێ وەئاگا هاتم نەمتوانی خەوەکە بگێڕمەوە .
بۆیە پێم خۆشە چیرۆکی ڕەنگ و بۆنی گوڵی سپی بزانین .
نەنە بە مناڵانی وت :
- ئێوە دەڵێن چی ؟
هەموو بەیەك دەنگ وەرامیان دایەوە :
- با ئارەزووی تۆ بێ .
نەنە ڕوانییە گوڵەکان و دەستی بەسەر گوڵی سپیدا هێناو وتی :
- ئەو دوو گوڵانەی ڕەنگ و بۆنی خۆیان دەستکەوت ، شەماڵ ڕۆژێ چووە لایان : گوڵی زەرد ڕووی نەهات باسی ڕەنگەکەی خۆی بگێڕێتەوە ... لە گوڵی سووری پرسی ، ئەویش لەنووکەوە هەمووی گێڕایەوە . بەڵام ئەوەشی پێوت : بە گوڵان بڵێ ڕێگاو شوێنی دیکە هەڵبژێرن تا ڕەنگ و بۆنیان وەك هی ئێمە نەبێ :
شەماڵ باڵی گرت و لای گوڵەکان لایدا .. بـاسی گوڵە سـوورو

زەردی گێرایەوە ..
یەکێ لە گوڵەکان وتی :
- سبەینێ دەڕۆم تا ڕەنگو بۆن بۆ خۆم پەیدا کەم . بۆ سبەینێ ڕۆیشت ، گەیشتە دەشتاییەك .. وردە وردە زەوی بەرزتر دەبۆوە ، ئەمیش ماندووتر دەبوو . جاروبار بەدڵیدا دەهات :
« هەی یاران چیم کرد بەخۆم ، نازانم بگەڕێمەوە یان نا ؟ »
هەر بۆ خۆیشی وەرامی دەدایەوە :
« نا ، سەرێکەو هێناومە .. ئەگەر بگەڕێمەوە چی بە گوڵان بڵێم .. دەزانم هەر لەدوورەوە پێ دەکەنن و بەتەوسەوە دەڵێن :
- بەهــ .. بەهـ لەو ڕەنگە جوانە ، کت و مت هەر لەخۆت دێ ، ئەی ئەو بۆنە خۆشە بۆ ناڵێی دنیای پڕ کردووە . کەواتە وا چاکە بڕۆم ، ناو بەناوێ پشوو دەدەمو تاو تاویش دەڕۆم ، قابیلە ڕەنگو بۆن بڕابێ و بەشی من نەمابێ ؟ ..

* *

گوڵەکە گەیشتە گردۆڵکەو بەرزایی .. هەرکاتێ ماندوو بووایە لە ژێر سێبەرێکدا پشووی دەدا ... لە دامێنی چیایەك نزیك بۆوە ، ماندوویی و شەکەتی برستیان لێ بڕی . لەسەر کانی و ئاوێك خەوی لێکەوت .. لە خەونیدا : پێیان وت :
« هەستە گوڵەکە .. بەکێودا هەڵگەڕێ .. دەزانم دەڵێی ڕێ ناخۆشە بەڵام بە کۆڵ نەدان ماندوویيت لە لەش دەردەچێ .. بڕۆ تا دەگەیە سەر لوتکە بەفر بەسەرتا دەبارێ ، لەوانەیە دات بپۆشێ ، سەرما تینت بۆ دێنێ .
لەوانەیە خۆرەتاو فریات کەوێ بەفری سەردەمو چاوت دەتوێتەوە .. بەڵام توێ توێ کراسی پیسی و چڵکنی لە بەفرەکەدا جێ دێڵی سەر دەردێنی ، ڕەنگێکی سپی و بێگەردت دەبێ .. بەفراویش جواناوی تۆ بۆ شیوو دۆڵان دەبا . ئەو ڕێ و بانەی پیایدا هاتووی هەمووی گوڵی سپی لێ دێتە دەرێ .. هەستە بەس بخەوە : » گوڵەکە لە خەو ڕاپەڕی سەیرێکی ڕەنگو رووی خۆی کردو وتی :

« هەر ئێستا بەرەو لوتکەی چیا دەڕۆم »
گوڵەکە ڕۆیی ، ڕێگاوبان هەروا هەورازترو ناخۆشتر دەبوو . بەڵام ئەویش هەروا دەڕۆیی .. گەیشتە لوتکە لە ناکاو دنیا بووبە هەورو هەلاو هەواش تا بڵێی سارد بوو .. بەفر گوڵەکەی داپۆشی .. بەڵام ئەم لەناو بەفرەوە چاوەڕێی ڕۆژبوو تا لەو سەرمایە ڕزگاری کا . لە خەوەکەدا هێندەی سەرما نەبوو . لەناو بەفرەکەوە ورتە ورتی بوو :
« دەبێ ددان بە خۆمدا بگرم .. هەر تاوێکە ، ئەگەر ڕەق نەبمەوە ئەوە هەتاو پەیدا دەبێ و گەرم دەبمەوە .. ئەگەریش سەرما بـردمی ئەوە گـوڵێکی دیکە .. دووانیکـە ڕێم دەگرن و رووی خۆیان و منیش سپی دەکەنەوە . بـا جارێ خـۆم لەبەفـرەکە بسووم » دەیدی وا چڵك توێ توێ لێی دەبێتەوە ، هەستی کرد هەرچی پیسی هەیە بەفرەکە لێی ستاندووە . لەباتی ئەوە سپی سپی بووە دەتوت بووکە .
بـەفر خـۆشی کردەوە . هـەتاو دەرکـەوت ، وردە وردە بەفـر توایەوە . تاوای لێهات گـوڵەکە دەرکـەوت ئەوسـاش ڕوانی پەلکەکانی سپی و جوانن .. بـۆنێکی خۆشی لێدێ .. شـەماڵ پیرۆزبایی لە گوڵەسپی کردو بەفریش جواناوی گوڵی بۆ شیوو دۆڵان برد . شەماڵ وتی :
- بڕوانە : بڕوانە : ها .. ها . ئەو ڕێیە دەبینی سپی دەچێتەوە . ئەوە جێ پێی تۆیە .. شاخەکەش یەکپارچە لەدامێنەوە سپی یە .
گوڵەکە بە دەم زەردەخەنەوە ئاوڕی لە گوڵە سپییەکان دایەوە .

* *

منالانی گەڕەك بۆ بەیانی ڕووەو لای نەنە ئامە وەڕێ کەوتن ، لەبەر خۆیانەوە دەدوان :
- ئیمڕۆ دەبێ باسی چ ڕەنگێکمان بۆ بکا ؟ .
- لەوانەیە لە گوڵی وەنەوشەیی بدوێ .
- ئەی بۆ پەمەیی نەبێ ؟
- ئەو پەلە پەلەی ناوێ .. کەسێ نەمرێ وا نزیك کەوتینەوە .
منـالان چاك و خـۆشی یان لە نـەنە ئـامە کـردو ئەویش وتی :
- ڕموون . ئاواش دەستی پێکرد :
.. کاتێ شەماڵ چیرۆکی گوڵی سپی بۆ گوڵە بێڕەنگو بۆنەکان دەگێڕایەوە بۆ بەیانی گوڵێ لە گوڵەکان لە خەو هەستـاو ڕێی گرتە بەر . دوای ئەوەی چەند دەشت و دەری بڕی لە دوورەوە دەهۆڵ وزوڕنای هاتە بەرگوێ ، بەرەو دەنگەکە چوو .. تا تەواو لێی نزیك کەوتەوە . دیتی وا کچ و کوڕ هەڵدەپەڕن ، بەڵام کەس

...

... رەنگو بۆنەکەش ، لەبەر خۆیەوە وتی : « با کەمێ ... بۆ بلێم ، ئەگەر پێیان خۆش بوو ئەوە تا شایی تەواو ... جێیان ناهێڵمو دەبمە ستران بێژی شایی .

... دەنگی منیان بەدڵ نیە ئەوا لە کورتی دەبیرمەوە ... گۆرانی یەکەمی تەواو نەکرد دیتی کوڕو کچ باشتر هەڵ ...و دەڵین :

- ... جاوەکەم بی تێی چریکێنە ، هیچمان لە دەنگی خۆمان ... بووین بۆیە شاییەکەمان سارد بوو . کاتێ لە هەڵپەڕین ... کچان بە نۆرە گوڵەکەیان خستە چنگی خۆیانەوە دوای ... چەند هەناسەیەکیان بە سەر گوڵەکەدا هات و چوو تێر تێر ... کرد . گوڵەکە رەنگی ماچەکەی لێبوو بە نەخش .. وردە ... رەنگی پەمەیی گرت بە خۆیەوە . ئەوساش هەر پەلکەی ... گوڵێکو وەك تەوقە لە قژی هەموو کچانی ناو شایی درا . ... نەکەیبوونە سەر چەمو ئاوی نزیك ماڵان روانییان گوڵە ... یەکان لەو قەراغ ئاوەی نزیك ئاوایی رواون ! . ... گوڵە باخ و ژاڵەو ئەرخەوان و گوڵەهەنار ئاوا رەنگیان گرت و ... دا بلاو بوونەوە .

... یێ دەمە دەمی ئێوارە بوو ، مناڵان پێکەوە رووەو دووکانی ... نامە وەرێکەوتن .. کاتێ نزیك بوونەوە ، دیتیان ... کەنەکەی داخراوە .. هەموو سەرسام مان .. هەر یەکە ... تێکی دەوت :

- ... مێ نەنە نەخۆش بێ ؟ .. خوا نەکا .
- ... شە ئەی بۆ نەهاتووە ؟!.
- ... شە با بچینە ماڵێ سەری لێبدەین .
- ... ور باشە فەرموون .

... لان رووەو ماڵی نەنە ئامە رۆشتن ، گەیشتنە بەر دەرگا بینیان ... کێکی گەورە بە دەرگاکەوەیە .. لە دەرو دراوسێیان پرسی :

- نەنە بۆ کوێ چووە ؟

یەکێ پێی وتن :

- منداڵە خۆشەویستەکانم ، نەنە ئامە .. ئێوە خۆش .

... الان حەپەسانو روویان گرژکردو بێئەوە ورتەیان لە دەم ... تە دەرێ گەرانەوە .

... یش ئەوەی بلاوەی لێبکەن یەکێکیان وتی :

- منداڵینە با سبەینێ بە فێنکی بچینە سەر گۆڕەکەی و گوڵی بۆ بەرین .

هەموو لە سەر ئەوە رێککەوتن ، بەیانی رووەو گۆڕەکەی نەنە ئامە چوون .. گۆڕەکەی لە دوورەوە یەکپارچە بۆتە گوڵە سپی .. دەورو بەرەکەشی گوڵی سوورە .. تەنانەت کێڵەکانیشی بوونە دوو گوڵی پەمەیی بالابەرز .. تەماشای دەستی یەکتریان کرد .. مناڵانیش تێکرا گوڵی سوورو سپیو پەمەییان بۆ سەر گۆڕی نەنە هێنابوو دایان نان .

مناڵێ بە ئەسپایی وتی :

- نەنە بۆ بەجێت هێشتین ؟
- کێ رەنگی گوڵەکانمان پێبڵێ ؟ لە کێ بپرسین ؟
- نەنە .. وەنەوشە بۆ مۆرە ؟
- ئەی گوڵە سەوەزەکان چۆن سەوز بوون ؟

یەکێکی دیکە بەدەم هەنسکەوە وتی :

- نەنە کێ بێ چیرۆکی رەنگو بۆنی گوڵەکانی دیکەمان پێ بڵێ ؟ تا بچینە لای ؟

دەنگێك لە گۆڕەکەوە دەهاتە بەر گوێ :

« تا رۆڵەکانم ، بچنە لای باخەوانان ،گوڵ فرۆشان ئەوان نهێنی رەنگو بۆنی گوڵان دەزانن .. پێمخۆش بوو گوڵی زەردتان نەهێناوە .. »

مناڵان تەماشای یەکتریان دەکردو دەیانوت :

- ئەرێ دەنگی خۆی نەبوو ..
- با ، نەنە ، بوو ، دەیناسمەوە .

کاتێ رووەو ماڵ دەبوونەوە . باخەوانێکیان دی ، ماندوو نەبوونییان لێکرد .

مناڵێ پرسی :

- ئەرێ خاڵە کە چیرۆکی رەنگی گوڵان دەزانی ؟
- بەڵێ کەسی خاڵی .
- باشە ، بێینە لات بۆمان دەگێڕیتەوە ؟
- بە چاوان .

مناڵان بە قسەی خاڵەی باخەوان دڵیان کرایەوە . بڕیاریان دا ئەو گوڵانەی رەنگەکانیان نەدەزانین لە باخەوانی بپرسن .

بەلای خانووی نەنە ئامەدا رۆشتن .. دیتیان خانووەکەی لە گوڵی سوورو سپیو پەمەییدا ون بووە . تەنانەت قفڵی دەرگاکەش بۆتە گوڵێکی پەمەیی گەورە .

نووسینی: عزیز نەسین
وەرگێڕانی: سعید یحیی

# ئەوەش شێت بوو!

سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوانی چاو لە بن چاویلکە زیت.. دووای یەك دوو ئحم.. دەستی پێ کرد:
- برادەران.. بە وردی بیر بکەنەوە.. ئەم جۆرە کارانە بە پەلە ناکرێن.. ئێمە دەبێ شت بە تەواوی هەڵسەنگێنین.
ئەندامێکی لاوی ئەنجومەن سەددەقی لە فەرمایشتەکانی سەرۆك داو گوتی:
- بەڵێ پێویستە فکرێکی باشی بۆ بکەینەوە.. ئەگینا کارمان ئاڵۆزە!.
سەرۆکی ئەنجومەن بە دڵنیاییەوە درێژەی بە قسەکانیدا:
- سەرۆکی شارەوانی شێت بووە.. ئیدی کەڵکی بەڕێوەبردنی شارەوانی نادات.

هەموویان تێکرا گوتیان:
- بەڵێ شێت بووە!
ئەندامێکی دەموچاو ئاوڵەیی گوتی:
- ئێمە نابێ دووبارە شێتێك هەڵبژێرین.
ئەندامە لاوەکە وەڵامی دایەوە:
- هەوەڵ پیاوێکی باش‌بوو، هەرکە ڕای خۆمان دایە شێت بوو!
ئەندامێکی پیرەی چرچ ولەڕ، کە دەمی دەجوولاندەوە ددانە دەستکردەکانی سەمایان دەکرد، گوتی:
- نازانم ئەمە چ بەدبەختی‌یەکە.. ئەوەی دێت و شێت دەبێ!. لەوەتی من ئەندامی ئەم ئەنجومەنەم سەرۆکێکی ئاقلم نەدیووە!.
سەرۆکی ئەنجومەن قسەکانی بڕی و گوتی:
- برادەران.. ئێستا دەبێ سەرۆکێك بۆ شارەوانی پەیدا بکەین.
ئیدی هەر ئەندامەو ناوی دووسێ کەسی دەهێنا.. وەکو باویشە، ئەوانی دیکە هەزارو یەك عەیب و ناتۆریان لێ دۆزیەوە. سەرۆکی ئەنجومەن وەك ئیلهامی بۆ هاتبێ، قیژاندی:
- سەبرکەن.. دۆزیمەوە.. مەبەستم (نەسیم بەگ)ە ئەرێ وەڵلا (نەسیم بەگ).. ئێوە دەڵێن چی؟!
- بەخوا پیاوی باشە.
- بەشەرەفەو خوێندیشی بەرزە.
- زۆر زۆر باشە.
- ئای کە دڵسۆزە، ئای کە بە ئەخلاقە.
- پیاوێکی ئیشکەرو لەسەر خۆیە.
هەر بابایەو بە بەژن و باڵای (نەسیم بەگ) هەڵدەڵێ.
ئەندامە پیرەکە گوتی:
- من باوەڕ ناکەم بیکات!.
ئەوانی دیکەش بەدووای ئەودا گوتیان:
- راست دەکەی.. زەحمەتە رازی بێ.
- منیش هەروا دەڵێم.
- من سی ساڵە دۆستی ئەوم.. چاکی دەناسم لەم جۆرە کەسانە نیە.
سەرۆکی ئەنجومەن بە نادڵی‌یەوە پرسیاری کرد:
- ئەی باشە چی بکەین؟.. ئەوەتا یەکێکی لایەقمان دۆزیەوە، کەچی دەڵێن نایکات!.
پاشان، بڕیاردرا چەند ئەندامێکی ئەنجومەن سەردانێکی (نەسیم بەگ) بکەن. لەبەر ئەوەی (نەسیم) بەگ] بە تەواوی ئاگاداری مەسەلەیەو دەزانێ لە پشت پەردەدا چ هەرایە، پێشنیاری ئەنجومەنی پەسەند نەکرد و گوتی:
- دەتانەوێ، منیش شێت بکەن؟.
- ئەستەغفیرەڵلا.. بابە شێت و مێتی چی.. تکامان وایە قسەمان نەشکێنی.
- ناتوانم!.
- قوربان، ئەم ئەرکە پێویستی‌ی سەرشانەو پێوەندی بە خزمەتی گەلەوە هەیە.. ناتوانی خۆتی لێ لادەی.. ئێمە دڵنیاین کە جەنابتان تەنیا کەسە بتوانێ ئەم هەموو گێرەو بەرەڵلایی‌یەی شارەوانی چارەسەر بکات.
بەهەر زەحمەت.. (نەسیم بەگ) یان ڕازی کرد:
- چاکە.. قەبووڵی دەکەم.. بە مەرجێ..
- فەرموو.. فەرموو هەر چ مەرجت هەن بیانڵێ..

- بەم مەرجەی دەست لە کلکەلەقێو مووزمانیو چەنـابازی هەلگرن.. دەعوەتو دەعوەت کاریش نەمێنێ.. چاوەڕێی کردەوەی ناعەقیش لە من مەکەن.
- قەبووڵمانە.

بـەڕای گشتی «نەسیم بـەگ» هـەڵبـژێـردراو کـرایـە بەڕێوەبەری شارەوانی. ئەو ڕۆژەی چووە گوێی کار، زیاتر لە سەد دانە بروسکەی پیرۆزبانی بێ گەیشت..زەرفێکی شکاندو بروسکەی خوێندەوە:

«بەڕێوەبەری بەڕێز.. ئەی ڕۆڵەی گەلو نیشتمان....»

ئیدی ئەوانی دیکەشی خستە ناو تەنەکەی زبڵ بێ ئەوەی هیچیان بخوێنێتەوە و دەستی بە پاڕانەوە کرد:
- خوایە بەگەورەیی خۆت بمپارێزی.

ئەوەندەی نەبرد سەرۆکی ئەنجـومەنی شـارەوانی بە چەپکە گوڵێکی ڕازاوەوە خۆی بەژووردا کرد:
- جەنابی بەڕێوەبەر.. ئەی قارەمانی گەورە..

«نـەسیم بەگ» وەك هـەموو کـەرەستەی ژوورەکـەی بەسەردا بکەن، ئەوەندەی نەما یەخەی دادڕێ.. بەوە کەیف سازبوو کە لە ناکـاو دەرگا کـرایەوە.. بـەڵام چی؟. ئەنـدامە پیرەکەی ئـەنجومـەن، چـەپکـە گـوڵێکی لە ژێـر بـاڵدایـەو دارعـەسایەك لە دەست، بەرەو مێـزی بەڕێـوەبەر هـەنگاو دەنێت..کە گوڵەکانی دانا خۆی چەماندەوە دەستی ماچ بکات.. «نەسیم بەگ» بازێکی داو کشایەوە.

لەو کاتەدا، چەند ئەندامێکی ئەنجومەن بە تێکڕا هاتنە ژوورەوە. «نەسیم بەگ» وەك چۆلەکەی چاوی بە هەڵۆ بکەوێ.. ترسی لێ نیشت:
- خوایە هۆشو گیانم بپارێزی!.

سکرتێری ئەنجومەن، دووای پیرۆزبـایـیو دەربڕینی خۆشحاڵی، ئاگاداری کردن کە:

«ئەمشەو لە سـەر شەرەفی جـەنابتـان، دەعوەتێـك لە سالۆنی شارەوانیدا ساز دەکرێت».

(نەسیم بەگ) سوور هەڵگەڕا.. گوتی:
- کارم بەم جۆرە دەعوەتانە نیە..

بەهەر حاڵ، ڕازیان کرد.. چۆن دەعوەتێ؟. نەسـەری نیوەڕۆنەبێ.. بەرلەوەی دەست لە خواردن هەڵگرن، سەرۆکی ئەنجومەن دەستی پێ کرد:
- برادەران.. ئەمشەو لە شەرەفی ئەم پیاوە بە شەرەفەی خۆی قیدا کرد سووکانی کەشتی بەدەستـەوە بگرێت، ئـاهەنـگ دەگێڕین.

«نەسیم بەگ» لەقینا، دەستی کردە پێکەنینی.. ئەندامە چرچەکەی ئەنجومەن نەڕاندی:
- بژی بەڕێوەبەری نوێی شارەوانی.

ئەوانی دیکەش بە دووایەوە.
- بەڕێوەبەری شارەوانی ئێمە.. لە هەموو دونیادا تاکی نیە.. دەبێ شانازی پێوە بکەن.

ئیدی کرایە چەپڵە ڕێزانو تەقەی فلاشو کامێرا..دووای پارشێو.. چوونە سالۆنێکی دیکەو دەستەیەك سەمایان دەکرد. لە نێو بەزمی خواردنەوەو بێهۆشی، سەرۆکی ئەنجومەن، سەری بردە بن گوێی بەڕێوەبەر:
- ئیجازە دەفەرمـوون، سبەینێ سـەر لە زوو بێمە خـزمەت جەنابتان؟.

بەڕێوەبەر ئاوڕێکی لێ دایەوەو پرسیاری کرد:
- دەربارەی چی؟.
- ئەگەر ماوەی قەسابەکان بدەیت بۆ خۆیان مەڕو گوێرەکـە سەربڕن، ئەوە ئامادەن پارە بدەن..
- چی دیکە؟.
- نانەواکانیش ئامادەن..

ئیـدی «نەسیم بـەگ» تاقـەتی گوێ دانـە قسـەکـانی سەرۆکی ئەنجومەنی نەماو هاواری کرد:
- ئیستقالە دەدەم.. نایکەم.. لاچن لەبەر چاوم.. نایکەم..

هەر بەر تووڕەیی‌یەوە بۆی دەرچوو..

ئـەنـدامـانـی ئـەنـجـومـەن، دەوری سـەرۆکـی ئەنجومەنیان داو سکرتێر گوتی:

مەسەلە چی بوو؟
- سـەرۆکی ئەنجـومەن بـەوپەڕی خـوێن ساردیوبێ‌بـاکی وەلامی دایەوە:
- هیچ.. ئەویش شێت بوو..

وەك ئەم ڕوونکردنەوەیەش بەشی ئەندامان بێت.. پیرە گوتی:
- کوڕینە.. باکاتمان بەفیڕۆ نەدەین.. کۆبوونـەوەیەك سـاز بکەنو بەزوویی بەڕێوەبەرێکی ئاقڵ هەڵبژێرین!.



# بەفرسارانی خۆشەویستی

چیرۆکی . سەمەدی بەهرەنگی

وەرگێرانی : گوشاد حەمە سەعید

- 1 -

ڕۆژێك لەڕۆژان پاشایەك هەبوو کچێکی شــەش حەوت سالانی هەبوو . ئەم کچە کەنیزەو کارەکەرێکی زۆری هەبوو ، نۆکەرێکی تۆزێك لەخۆی گەورەتریشی هەبوو ناوی «قووچ عەلی» بوو .

ئەگەر دەسمالی کچەکە لەوەختی نانخواردندا بکەوتبایە سەر ئەرز قووچ عەلی دەیدایەوە دەستی ، ئەگەر تـۆپەکـەی لەوەختی یــاریکـردنــدا دوورکــەوتبــایــەوە قــووچ عــەلی بۆیدەهێنایەوە . کاتێکیش کە کچی پاشا لەملیۆنان ئەسبابی یاریکردن بێزاردەبوو هەوەسی یاری «پەلیکانێ»ی دەکـرد . دارو پەلیکی پاشا لەزێڕو زیـو بوو . هــەر جاری یــەکەم کــە هەوەسی چووە سەر یاری پەلیکانێ پاشا هەموو زێڕینگەرەکانی شاری کۆکردەوەو فرمانیدا تا ســەعاتێکی دیکــە دەبێ دارو پەلیکی لەزێڕو زیو بۆکچەکەی دروستبکرێ . ئەم دارو پەلیکە لەسەد هەزار تومانی زیاتر تێچوو . زێڕینگرێکیش لەسەر بــە کوشتن چوو لەبەرئەوەی ووتبووی کە کـاری هەیـەو

ئەتوانێ بێت و بۆ کچە تازە لە دایک بووەکەی خۆی گوارەی دروست دەکرد .

هەر کاتێك کە کچی پاشا ئارەزووی پەلیکبازی دەکرد ـ قووچ عەلی تۆزێك لەولای ئەوەوە ڕادەوەستاو چاوەڕوان دەبوو کچی پاشا پارچە زیوە کورتەکە (یەعنی پەلیکەکەی) لەسەر زەوی دادەناو بە پارچە تەختە زێڕینەکەش واتە دارەکە سەری ئەوی‌تری دەداو فڕێی دەدایە ئاسمان ، قووچ عەلی ئیشی ئەوەبوو بەدوایدا ڕابکاو بیهێنێتەوە لەبەردەمی کچی پاشای دانێ کچە بەتوندی لێی‌دەدایەوەو بۆ دوورتری فڕێ‌دەدا قووچ عەلی دیسان دەڕۆیشتەوەو دەیهێنایەوە لەلای کچەکەی دادەناوە ، کچە وەختێك ماندوو دەبوو قووچ عەلی دەچوو بەردەست و کارەکەرەکانی ئاگادار دەکردەوەو دەهاتن کچەیان لەسەر تەخت بەنەرمە ڕۆیشتن بەرەو کۆشك و تەلارەکەی بردەوە . وەهەروەها قووچ عەلی دەچوو پاسەوانی خەزێنەی تایبەتی ئەسبابەکانی یاری کچەی ئاگادار دەکردەوە تاکو بێت دارو پەلیکە زێڕینەکەی بباتەوەو لەشوێنی خۆی لەلای ئەو ملیۆنان ئەسبابی‌یاریانەی دیکە دایینێتەوە ، پاشان قووچ عەلی دەچووە کن‌پاسەوانی خەزێنەی جلەکانی کچی پاشا تاکو بەرگی تایبەتی نانخواردن بۆ کچە بیبات و جل‌وبەرگە تایبەتی‌یەکانی یاری پەلیکانێ بباتەوەو لەشوێنی خۆی دایبنێتەوە . لەدوایی‌دا قووچ عەلی دەچوو چێشت لێنەری تایبەتی کچی پاشای ئاگادار دەکرد تاکو خواردنی پاش یاری پەلیکانێی بۆ بێنێت . کچی پاشا لەدوای هەر یاری‌یەك خۆراکی تایبەتی دەخوارد . قووچ عەلی هەموو دەم بەدوای ئەم جۆرە کارانەوە بوو ، وەختێك کچەکە دەنووست ئەو دەبوایە لەپشت دەرگا بوەستایە تاکو کەنیزەو کارەکەرو نۆکەرەکان بزانن خانم نووستوەو هیچ نەڵێن و نەپرسن .

کچی پاشا هەر فرمانێکی هەبوایە قووچ عەلی بە تاسەوە بەدوای‌دا دەڕۆیشت و کارەکانی ئەوەها چاك ئەنجام دەدا کە کچی پاشا هەرگیز دەستی بەڕووی ئەودا بڵندنەکردبوو قووچ عەلی عاشقی کچی پاشابوو بێ‌غەل و غەش خۆشی دەویست ، بەبیری خۆشی هیچ عەیب و شورەیی‌یەك لە ئیشەکەی دڵنەبوو هەر لەبەر ئەوەش ڕۆژێکیان ڕازی دڵی خۆی بۆ کچی پاشا درکاند . ئەو ڕۆژە کچی پاشا لە باغچەدا پەپوولەی دەگرت ، قووچ عەلیش لەژێر دارێك ڕاوەستابوو تەماشای ئەوەی دەکرد کاتێکیش پەپوولەیەك دەچووە سەر درەختێك دەنیشتەوە دەبوایە قووچ عەلی بچێتە سەر درەختەکەو هەڵی‌فڕێنێ .

جارێك کچە پەپوولەیەکی گەورەی دیت بانگی قووچ عەلی کردو ووتی : قووچ عەلی وەرە تۆ ئەمەیان بگرە من لێی دەترسێم .

قووچ عەلی بەخێرایی ڕای‌کرد پەپوولەکەی گرت و خستیە ناو زەمبیلە تۆڕینەکەوە ، کاتێك سەری بڵندکرد دیتی کچە ڕووبەڕووی ڕاوەستاوە بەساف و سادەیی پێی‌ووت : شاهزادە خانم ، من دڵداری تۆمە تکات لێ‌دەکەم کاتێك کە هەردووکمان گەورەبووین ببیتە ژنی‌من . بەلام هێشتا لەقسەکەی نەبیبۆوە کە کچی پاشا زللەیەکی لەبن‌گوێی‌داو قیژاندی : نۆکەری بێ ڕێ‌و جێ ، تۆ چ هەقی ئەوەت هەیە عاشقی من بیت ؟ مەگەر لەبیرت چووە من شازادە خانم‌و تۆش نۆکەری منی ، تۆ کەڵکی دەرگەوانی سەگەکەی منیشت نی‌یە . تو لەسەگە لەبەرچاوم ون‌بە .. برۆ بەکارەکەرەکانم بڵێ بێن بمبەنەوە تۆش بەدەرنێن ئیدی نامەوێ چاوە پیسەکانت من ببینێ .

قووچ عەلی ڕۆیشت و کارەکەرەکانی ئاگادارکرد . کارەکەرەکان بەتەختەوە هاتن دیتیان کچی پاشا بێهۆش کەوتووە ، پژانە سەرسەری قووچ عەلی کوڕە چیت لە کچی پاشا کردووە ؟ قووچ عەلی وتی : من هیچم لێ‌نەکردووە خۆی توڕەبوو لێی‌دام‌و بێهۆش‌بوو ، بەکێ‌و بەکێ سوێند دەخۆم بەلام کێ باوەڕی دەکرد گوڵاوو شەربەتیان هێنا کچەیان هێناوە سەرەخۆو لەسەر تەختیان داناو بردیانەوە کۆشك‌و باڵەخانەی خۆی کچی پاشا فرمانی‌دا ووتی : بە باوکم بڵێن گوێی ئەم نۆکەرە بێ‌ئەمەکە چەپەڵە بگرێت وەك سەگ لێرە دەری‌بکا . نامەوێ چاوە پیسەکانی من ببینێ .

پاشا هەر هەمان‌دەقە فەرمانی دەرکرد، لە ڕاستیشدا قووچ عەلیان وەك سەگ بەدەرنا . کچی پاشا چەند ڕۆژێك نەخۆش‌بوو ، هەر ڕۆژەی چەند حەکیمێك بەسەر سەریەوە ئێشکیان دەگرت .

لەدوایی‌دا خۆی وتی کە ئیدی زۆر چاك بووەو حەکیمەکانی ئیزندا .

- 2 -

ساڵان تێدەپەڕین و کچی پاشا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ساڵ لەدوای ساڵ زیاتر خۆپەرست دەبوو ، کەسی بەسەگیش دانەدەنا . ئەو کاتەی تەمەنی گەیشتە حەڤدە هەژدە ساڵان ، فرمانی دا کە کەس مافی ئەوەی نی یە سەیری بکاو لەشی پاک و بێگەردی بەتەماشای پیس بکا . ئەگەر کەسێك لەکارەکەرو نۆکەرەکانی بە سەهو سەیری ئەوی کردبا شەق و شولاقی دەخوارد ، ئەگەر ورتەشی لێوەدەهات بەزیندوویی فڕێیان دەدایە بەردەمی گورگە برسیەکان کە کچی پاشا بۆ ڕابواردنی خۆی لەناو باخچەکە ڕای گرتبوون . هەر لەبەر خاتری ئەو کارانەش پاشا کچەکەی زۆر خۆش دەویست . هەمیشە بە کچەکەی دەووت : تۆ لاسایی خودی من دەکەیەوە ، تۆم خۆش دەوێ .

کچی پاشا وای لێهاتبوو هەمیشە بە تەنیا لەناو باغچەدا پیاسەی دەکردو قسەی لەگەڵ کەس نەدەکردو دەیووت : کەس شیاوی قسەکردنی نی یە لەگەڵ مندا . دوو حەوزی گەورەشیان لەناوەراستی چیمەنەکەدا دروستکردبوو ، هەمووەم یەکێکیان پڕی شیری تازەبوو ئەوی دیکەشیان پڕ گوڵاوو عەتری گوڵی سوورو یاسەمین بوو . دوو کەنیزەی لاوی ناسکیش ئیشیان ئەوەبوو لەکاتی خۆی دا سەریان لەبەرخۆیان بنێن و تا ڕۆخی حەوزەکە بێن و کچە لەناو حەوزی شیرەکە دەربهێنن و بچێتە ناو حەوزی گوڵاوەکەو بێتە دەرەوەو خۆی لەپەشتەماڵ بپێچی .

کارەکەرەکان مافی ئەوەیان نەبوو دەست لە لەشی بدەن هەتا ئەگەر سەری پەنجەی کەسێك بەپێست یان موی ئەو بکەوتایە ، هەر ئەو ڕۆژە دەدرا دەستی جەلادەکان تاکو دەستی یان پەنجەی ببڕنەوە . کچی پاشا ئەوەندە خەڵکەکەی لەخۆی دوورەکردەوە تاکو تەنیا دەمایەوەو نەیدەزانی چۆن کات بەسەر ببات لە پەپوولە گرتن و گوڵ چنین و خۆشوشتن لەناو شیرو گوڵاوو ئەسبابی یاری و خواردن و خواردنەوەو سەیرکردنی گورگانیش تێر دەبوو . ناچار دەبوو زۆربەی کاتەکانی دەنووست هەمیشە خەونی بە قووچ عەلیشەوە دەبینی . قووچ عەلی دەهات لەگەڵ کچی پاشا یاری بکا کچە یەکەمجار دڵخۆش دەبوو ، لەناکاو بەبیری دەهاتەوە کە کچی پاشایەو زۆری جیاوازی لەگەڵ خەڵکی دی دا هەیە .

ئەو کاتەی کە بەبیری دەهاتەوە کچی پاشایە قووچ عەلی لەخۆی دوورەکردەوە بەلام قووچ عەلی نەدەڕۆیشت دەیویست دەستی ئەو بگرێت ، کچە زۆری دەکرد تا دەستی بدزێتەوە بەلام لەدوایی دا خۆی دەدایە دەست و قووچ عەلی دەیتوانی دەستی بگری و پێکەوە دەستیان دەکرد بەیاری کردن و هەڵپەڕین و پەپوولە گرتن . قووچ عەلی لەگەرمەی یاری کردندا دەیووت : شازادە خانم ، من عاشقی تۆمە توخوا تکات لێدەکەم ئەگەر گەورەبووین دەبێ شو بەمن بکەی . لێرەوە دیسان کچی پاشا دەهاتەوە یادی کە ئەو کچی پاشایەو زللەی لە قووچ عەلی دەداو بەسەری دا دەیقیژاند . قووچ عەلی بە دەستی جەلادەکان دەسپاردو لەناکاو لەدەنگی هات و هاواری خۆی ڕادەپەڕی ....

هەمیشە ئەم خەوەی دەدیت نەیدەتوانی خەو بەوەڵلاش یاریەکی دیکەوە ببینێ ، تازە بەهەمان سەروسیمای تەمەنی ئەوکاتی خەونی بە قووچ (عەلی)یەوە دەبینی.کچی پاشا داخوازکەریشی هەبوو ، چەندان شازادە لە مەملەکەتی دوورەوە بۆ خوازبێنی هاتبوون بەلام بێ ئەوەی بیانبینێ ڕەتی کردبوونەوەو دەیووت : من جگە لەخۆم کەسی ترم خۆش ناوێ .

- 3 -

ڕۆژێك کچی پاشا لەناو حەوزەکەدا خۆی دەشوشت . کۆترێك هات و لەسەر لقی دار هەنارێك لەڕۆخی حەوزەکە نیشتەوەو ووتی : ئەی کیژی جوان و ناسکۆلە ، تۆ چ لەش و لارێکی قەشەنگت هەیە ! من عاشقی تۆ بوومە . تکات لێدەکەم لەناو شیر وەرەدەرەوە تاکو تێر تەماشات بکەم . کچی پاشا ووتی : ئەی پەلەوەری پیس ، پێت دەڵێم لێرە بڕۆ من شازادە خانمم . کەس مافی ئەوەی نی یە تەماشام بکات ، کەس شیاوی ئەوە نی یە قسەم لەگەڵ بکا . کۆترەکە زەردەخەنەیەکی گرت و ووتی : کچۆڵەی جوان ، من دەزانم دەمێکە تۆ هاودەمێکت نی یە ...

کچی پاشا لەبیری چووەوە کە کچە پاشایەو لەناکاو نەرم بوو ووتی : کۆتری قسە خۆش تکات لێدەکەم سەیری من مەکە باش نی یە . کۆتر ووتی : کیژۆڵەی ئێسك سووك بەدەست خۆم نی یە ناتوانم سەیرت نەکەم ، خۆشم دەوێیت . کچەکە

تی : کۆتری قسه خۆش من ناتوانم دڵداری لەگەڵ کۆترەیەك
ـەم ، ئـەگـەر عـاشقێکی ڕاستو دروسـتی لەپـێسـتت
رەدەرەوە تاکو منیش تەماشات بکەم . کۆتر وتی : من دڵم
ژیوکـە نی‌یە تـاکو حەزی لێبکەی . کچـە وتی : هـۆ
وترۆکەی قسە شیـرین هەرچییـەك دەخـوازی بخـوازە
تدەمێ . کۆتر ووتی : هۆ کیژۆڵەی جوان خەوت بدە من .
چۆلەکە وتی : هۆ کۆتری قسە خـۆش خەوی من چ دەوای
ردی تۆ دەدا ؟ کۆتر وتی : کچە نـەشمیلەکە ، لەپاشان
بینی خەوی تۆ چۆن دادم دەدا . کچە وتی : ئەی کۆتری
سە شیرین خەوی من بۆ تۆ .

لەوکاتەدا چرپەی پێی کارەکەرەکانی کچەکـە بیسترا
شتەماڵ بەدەست سەریان لەبەر خۆیان نابووو دەهاتن .
ـۆتـر وتی : ئـای کچـە ئـاسکـۆڵەکـە خـەوت بــووە هی
ن .کـارەکەرەکـانت ئـەوا دێن ، ئـەوا من ڕۆیشتم لەدوایی‌دا
یمەوە . من ناوم نای «کیژخان» . جوان نی‌یە کچێکی وەك تۆ
وان‌بێ ناوبێ .

کچی پاشا لەناکاو بـەبیری‌هـاتەوە کـە کچی پاشـایەو
یژاندی . حەیوانی چەپەڵ ، تۆ چ هەقێکت هەیە قسەم لەگەڵ
کەی ؟ خەوەکەم بدەوە دەنا دڵو قوڕ قوڕاگەت لەگەردەنتەوە
ەردەهێنم ، تۆ مافی ئەوەت نی‌یە بەم دەنووکە پیسەت ناو لەمن
نێیت . بـەڵام کۆتـرەکە دەمێـك بوو لەسـەر دار هەنـارەکە
ەڵفڕی‌بوو .

کچی پاشا هەر لەخۆڕا تـوڕە دەبوو جـەلادەکانی بـۆ
کۆمەك داوادەکرد .

- ٤ -

چەند هەفتەبوو کچی پاشا دەقەیـەکیش نەنـووستبوو
لەڕاستیدا خەو نەدەچووە چاوەکانی . یەکەم جـار بێ‌خەوی
وای‌لێ‌کردبوو هەموویان وایان دەزانی شێت بووە وەك سەگی
هـار لەژوورەکـەی‌دا دەهـاتو دەچـوو ، بـەدەرو دیـوار
هەڵدەشاخی‌و جوێنی بەهەموان دەدا . ڕێی کـەسی نەدەدا
بچێتە لای تاوەکو باوکیشی نەحەکیمـەکانیش . ڕۆژو شـەوان
تاکو تەنیابوو . لەئەنجامدا کەوت . ئەوساکەش خەو هەر
نەدەهاتـە چاوی بـەڵام نەقسـەی دەکردو نـەدەجوڵایـەوە .
وای‌لێ‌هات یەك لە دوای یەك حەکیمەکان لەسەر سەری بـێن

بچن ، هیچ حەکیمێك نەیتوانی خەو لەکچە بخا . پاشا فرمانیدا
بوو کەس مافی نی‌یە دەست لەلەشی بدات ئەمەش بووە هۆی
ئەوەی حەکیمەکان نەیاندەتوانی بزانن دەردی کچە چی‌یە .
ڕۆژێکیان حەکیمێکی پیـری غەریبـە هاتو ووتی : من بـەبێ
ئەوەی دەست بکەیـەنمە لەشی نـەخۆشـەکە دەتـوانم چاکی
بکەمەوەو دەرمانەکەشی بڵێم ، ئەگەر نەمتوانی لەسەرم بدەن .

پـاشا فـرمانی‌دا ببیـەنە لای کچـەکە ، حـەکیمی پـیر
مـاوەیەکی دریـژ لەتەنیشت کچـە دانیشتو تەمـاشای کـرد
لەدوایی‌دا ووتی : چـارەکـردنی تـەنیـا «ئـەفـسـانـەی
خۆشەویستی‌یە» . دەبێ یەکێك لەپشت سەری «ئەفسانـەی
خۆشەویستی» بـۆ بگێڕێتـەوە تاکـو چاك ببێتـەوەو بتوانی
بنوێ .

پاشا دەستوری‌دا جارچیـەکان لەچـوار گۆشـەی شار
جارپاندا کەوا هەر کەسێك ئەفسانەی خـۆشەویستي دەزانی
بێتن بـۆ کچی پاشـا بگێڕێتـەوە هەتـا پاشـا لەمـاڵی دنیـای
بێ‌منەت‌کا . زۆر کەس لەبەر تەماحی دنیا هاتن دەیـان‌ووت
«ئێمە ئەفسانەی خۆشەویستی دەزانین» بەڵام کە دەگەیشتنە
پشت پەردەی ژووری کیژەکە ناچـاردەبوون درۆی بـۆ بکەن
هەڵبەتە ئەمەش کاری لەکچی پاشا نەکردو پاشا هەمووی دانە
دەست جەلادەکان . ئیدی کەس نەیوێرا بچێتە پێش . چەند
ڕۆژێك ڕابورد دیسان حەکیمی غەریبەو پیر پەیدابۆوە بەپاشای
وت : ئەمە چ شـارێکە کـەس «ئەفسـانەی خـۆشەویستی»
نازانی ؟ لەفلانکە چیا شوانێکی لاو دەژی ، ئەو «ئەفسانەی
خۆشەویستی» چاك دەزانێ . بڕۆن ئەو بینن بەڵام پاشا ئەوە
بزانە ئەگەر خـۆت بەدوای دانـەچی هەرگیـز لەچیا نـایەتـە
خوارەوە . حەکیم هەستا ڕۆیشت . پاشا لەگەڵ چەند نەفەری
دی سواری ئەسپ‌بووو کەوتـە ڕێ ڕۆیشتن تا گـەیشتنە بن
چیاکە شوانەی لاویان بانگ‌کرد ، شوانە لەسەر چیاوە ووتی :
ئێوە کێنە ؟ چ کارێکتان پێمە ؟
پاشا ووتی : من پاشامە مەگەر نەتبیستووە کچەکەم نەخۆش
کـەوتووە ؟ دەمـەوێ بۆ لای ئـەو بێی .. پاشـا لەبیری
چووبوو حەکیمەکە چی وتبوو . شوانە بـەبیری هێنـایەوە :
«ئەفسانەی خۆشەویستی» یت دەوێ ؟
پـاشا ووتی : بـەڵێ ئەوەم دەوێ . حـەکیمێکی پیرو غـەریبە
وتی : تۆ ئەفسانەی خۆشەویستی چاك بەلەدی . شوانەی

لاوەوتی : بەڵێ شارەزاییم لێ‌یەهە .
پاشا وتی : ئەگەر کچەکەم چاکبکەیتەوە هەرچەندێک زێڕو زیوو سامان بخوازی دەتدەمێ .
شوانەکە کە لەچیا دەهاتە خوارەوە ووتی : ئەگەر نـاوی ماڵی دنیـا بهێنی نایـەم . «ئەفسـانەی خـۆشەویستی» تـەنیا بـۆ خـۆشەویستی دەگێـڕدرێتەوە . ئیـدی پاشـا هیچی نـەووت دەیویست ئەو شوانە فزولیە بداتە دەست جـەلادەکان بـەلام هیچی نە وت .

شوانەکە خۆی هەڵدا سەر زینی ئەسپی پاشاو کەوتنە ڕێ . کاتێ کە گەیشتنە کۆشك شوانەیان لەپشت پەردەیـەك داناو ووتیان : لێرەوە ئەفسانەی خۆشەویستی بـۆی بگێڕەوە نابێ چاوی بە ڕووی کچی پاشا بکەوێ .
شوانی لاو ووتی : ئەفسانەی خۆشەویستیش شتێك نی‌یە کە هەر کەسێك بتوانێ ، ئەگەر جگە لەمن و کچەکە کەسی‌دی لەم دەورو بەرانەبێ ئەفسانەکە بەتاڵ دەبێ‌و هیچ کارێکی نابێ . هەمووتان دورکەونەوە .

پاشا ناچار فرمانی‌دا کـۆشکی کچەیـان بەجێهێشت . کچەو شوانە بەتەنیا لەناو کۆشکەکە مانەوە ئەوساکە شوانـە پەردەکەی لاداو چووە ناو ژوورەکـەوە ، کچە بـەئارامیـەوە درێژببوو بێ‌ئەوەی بایەخ بەکەسێك یان شتێك بدا . شوانـە لەکن دەرگـا دانیشت‌و خـۆش خـۆش ووتی : ئـەی کچـی نـەشمیلە ، ئـەی «کیـژخـان» دەمـەوێ «ئـەفسـانـەی خۆشەویستیت» بۆ بگێڕمەوە گوێم لێدەگری ؟ ئەو کاتەی کچە دەنگێکی ئاشنایی بیست ملی سوراندوو چاوی لە شوانەی لاو بـڕی‌و وتی : بەڵێ گـوێ دەگرم بـڵێ . شوانـە دەستی‌کـرد بـەگێڕانـەوەی ئەفسـانەی خـۆشەویستی‌و وتی : «ڕۆژێـك لەڕۆژان پـاشایـەك هەبـوو کچێکی شەش حـەوت ساڵانـەی هـەبوو ، ئـەم کچە کـەنیزەو کـارەکەرێکی زۆری هـەبـوو ، نـۆکەرێکیشی هـەبوو تـۆزێـك لەخـۆی گـەورەتـربـوو نـاوی قووچ‌عەلی‌بوو . ئەگەر وەختێ نانخـواردن دەسماڵی کچـەکە بکەوتبایە خوارەوە قووچ‌عەلی دەیدایەوە دەستی ، کاتی یاری تۆپ‌تۆپێن ئەگەر تۆپەکە دوور بکـەوتبایـەوە قووچ‌عـەلی بۆی دەهێنایەوە ، کاتێ کچەکە هەوەسی یاری پەلیکـانێ‌ی دەکرد دارو پەلیکی ئەو لەزێڕو زیوبوو . کاتێك کە کچەکە دەنووست ئیشی قووچ‌عەلی ئەوەبوو لەپشت دەرگاوە بخەوێ تا کارەکەرو

بەردەست‌و نۆکەرەکانی بزانن خانم نووستووەو هیـچ نەڵێن‌و نەپرسن . کچی پـاشا هـەر فرمـانێکی هەبـوایە قـووچ‌عەلی بەتاسـەوە لەدواییدا دەڕۆیشت‌و ئیشـەکانی ئـەوها بـاش بۆ ئەنجام‌دەدا کە هەرگیز کچی پاشـا دەستی لەڕوی ئەو بلنـد نەکردبوو . قووچ‌عەلی دڵی بەکچی پاشادا چـوبوو ، سـاف‌و سادە خۆشی‌دەویست ، بەڕای خۆی هیچ عەیب‌و شـوورەییەك لەکارەکەی‌دا نەبوو . ئاخر دەبێ خۆشەویستی چ شوورەییەکی تێدابێ ؟ کاتێ لەناو باخچە پێکەوە بوون‌و کچی پاشا پەپوولەی دەگرت یان پەلیکانێ‌ی دەکرد ، قووچ‌عەلی خۆی ئەوەندە شادو لەش سوك دەدی کە هەر باسی ناکرێ ،هەرگیز لەسەیرکردنی تێر نەدەبوو دەیویست کچە ڕێگای بدا دەستی بگرێ‌و پێکەوە پیاسە بکەن‌و پەپوولە بگرن بـەلام کچی پاشـا کەسی پـەسند نەدەکرد بەکارەکەرو نۆکەرەکانی دەیووت سەگ ڕێ‌ی نەدەدان توخنی بکەون . قووچ‌عەلی بـەم شێوە سـادەو چالاك‌و لەش سوکانە دەژیا تا ڕۆژێکیان هەستی‌کرد ئیدی ناتوانێ ڕازی دڵی خۆی بۆ کچـە بەیـان نەکـا . ئەمـەبوو ڕۆژێکیـان لەوەختی پەپوولەگرتندا بەکچەی ووت : شازادە خانم ، من عاشقی تۆمە تکات‌لێ‌دەکەم کاتێك هەردووکمان گەورەبووین ببیتە ژنی من .
کچی پاشا لەم قسەیە ئەوەندە توڕەبوو زللەیەکی لە بناگوێی قووچ‌عەلی ئاگردا پـاشان وەك سـەگ لەپێشی خۆی‌دا . کچی پاشا قووچ‌عەلی بەدەرنا هەرگیز بیـری لەوە نەکـردەوە کە چ بـەلایەکی بـەسەردادێ . شـوانی لاو بێ دەنگ بـوو ، کچە ووتی : شوانە بڵێ پاشان چی ڕوی‌دا ؟ .
شوانە ووتی : کچی ناسکۆڵە ، تۆ چۆن بیری‌لێ‌دەکەیـەوە چ بەلایەك بەسەر قووچ‌عەلی داهات ؟
کچە ووتی : من هەرگیز بیرم‌نەکردۆتەوە کە چ بەلایەك بەسەر قـووچ‌عەلی داهـات . تۆ دەزانی لەدواییـدا قووچ‌عـەلی چی لێ‌هات ؟ وەرە پێشەوە بڵێ .

شوانەکە هەستاو لە تەنیشت تەختی کچەکە دانیشت‌و دەستی خستـە نـاو دەستی‌و پـاشمـاوەی «ئـەفسـانـەی خۆشەویستی» بەم شێوە بۆی گێڕایەوە .
- «باوکی قووچ‌عەلی شوانی دەکرد ، قووچ‌عەلی بە پیادەیی سەری بۆ بیابان هەڵگرت‌و ڕۆیشت باوکی لەسەر چیا دۆزیەوە . بـاوکی زۆر نەخـۆش بووو لە ئـەشکـەوتی مـەڕو بـەرخـان نـووستبوو . خـوشکی قووچ‌عـەلی کە لە تـەمەنی ئـەودابوو

بەرخەكانی بۆ لەوەر بردبوو ، باوكە بەبینینی كوڕەكەی گەلێ خۆشحاڵ بووو ووتی : قووچ عەلی لەشوێنی خۆیدا هـاتی من خەریكە دەمرم ، خوشكت بەتەنیـا بەجێمـەهێڵە ، تەنیـایی دەردێكی كوشندەیە . باوكە مرد . كوڕە هەر لەو شوێنە لەسەر چیا بەخاكی سپارد پاش نیوەڕۆ خوشكەكەی هاتەوە ، براكەی لەشوێن باوكي دادێت . پێكەوە زۆر بۆ باوكیان گریان و لەسەر گۆڕەكەی گوڵ و دارو درەختیان چاند . ڕۆژو هەفتەو مـانگ و ساڵان ڕابوردن . قووچ عەلی و خوشكەكەی گەیشتە تەمـەنی حـەڤدە هـەژدە ساڵان پێكـەوە دەشت و چیایـان ڕێ دەكردو بەرخەكانیان لەبەلەوەرترین شوێندا دەلەوەڕاند ، شەوانیـان لەدەركی ئەشكەوت‹لەگەڵ سەگـەكان دەبـردەسەر . تـەنیا لەكاتێ زستاندا دەهاتنە شار ، وەختێـك مەڕو مـاڵاتەكـە لە ئەشكەوت لەزستان زستانی دەبـوو دادەكرا وەختی بێكـاری بوو .

خوشكەكەی قووچ عەلی وەك هەوای بەهار سازگار بوو ، وەك هەتاوی هاوینان درەوشاوە بوو ، وەك میوەی پایزان بۆن خۆش و بەتام و دڵویست بوو ، وەك مـانگی شەوانی زستـان بێگەردو دڵگیر بـوو ، وەك لالەی دەشت و چیا سـوورو كێوی بوو . هەر لەبەر ئەوەش بوو قووچ عەلی بانگی دەكرد «لالە» . ڕۆژێكیان لەو وەختەی مەڕو ماڵاتیان دەهێنایەوە دیتی كە بزنێك لەمێگـەل دابڕاوەو بـزربووە . سـەگێكی لەگەڵ خـۆی بـردو بەدوای بزنەكەدا ڕۆیشت . چەند چیایەكیـان بڕی لەدوییدا بینیان لەسەر كـانییەك دانیشتـووەو دەگریـا وەك شۆڕەبی هەڵدەلەرزی . سەگەكە بزنەكەی دیت دەستی بەوەڕین كرد : بزنەكە ، مەگـریە واهـاتین . بـزنەكـە شادمـان بووو ووتی : دەترسام بەدوامدا نەیەن ، ببمە خۆراكی گورگان سوپاستان دەكەم . هەروا دەهات تاریك دەبوو قووچ عەلی سـەیریكـرد دیتی لەوبـەری چیاوە حـەفت ئەسپی سپی سـەردەكەون ، بزنەكەی بەسەگەكەی سپاردو بەڕێی كردن . خۆشی لەپشت بـەردێكەوە دانیشت و چـاوەڕێی كردن ئـەسپەكـان هـاتن و گەیشتنە سەر كانییـەك هەریـەكەیـان دێمكەیـەكی بەپشتی خۆیەوە هەڵدابوو لەكانیەكە پڕیانكرد ، كە ویستییان بگەڕێنەوە یەكێك لەئەسپەكان ووتی : من ئیدی ناتوانم بەتاقی تەنیا لەو باڵە خانوەدا بژیم ، یان لەوێ خۆم دەكوژم یان دەگـەڕێمەوە شارەكەی خۆمان ئێـوەش بگەڕێنـەوە لای كچانـانی مامـە .

ئەسپەكانیتر دڵنەواییان كردو لەدواییدا هەموویان بەیەكەوە گەڕانەوە . قووچ عەلیهەستا سەرپێوكەوتەدوای ئەسپەكان ڕۆیشتن ... ڕۆیشتن چـەند چیـایـان لەدوای خـۆیـان بـڕی گەیشتنە جەنگەڵێكی چۆڵ و كش ومات كە بچووكترین باڵنـدەو ئاژەڵ و زیندەوەرێكی تێدا نەبوو . حەفت بـاڵەخانـەی ڕازاوە دەبینـرا هەر یـەكێك لەئـەسپەكـان چوە نـاو خانـوێكـەوە . قووچ عەلی چاوەڕێبوو دیتی شەش كۆتری سپی لە ئاسمـان نەوی بوون هاتنە خـوارو هەر یـەكێكیان چـوە ناو یـەكێك لە باڵەخانوەكانـەوەو قووچ عـەلی دیسان چـاوەڕوانی كردەوە . دەنگی گریانی بەرگوێ كەوت ، یەك یەك سەری بە خانووەكان داكرت دیتی لەهەر خانووەك كچێكی وەك مانگ و كوڕێكی وەك هەتاو بەگەرمی قسـە دەكەن و پێـدەكەنن بـەلام لەقەسـری حـەفتەمـدا كوڕێكی وەك خـۆر تەنهـا دانیشتوە بـە پـارچـە گـەچێكەوە وێنـەی گوڵی لالە دەكێشێ و هـۆن هۆن فـرمێسـك دەڕێژێ و دەگریە ، گریانێك كە دڵی بەردی بۆ دەبوە كەباب .

قـووچ عەلی لێی بـەژوور كەوت سـڵاوی لێكردو پێی وت : ئەی لاو مەگریە دڵت برژاندم .

لاوە سەری بڵندكردو ووتی : تۆ كێی ؟ لەكوێوە هاتووی ؟

قووچ عەلی وتی : من شوانی كێوو شاخانم ناڵەی گریانت منی بۆ ئێرە ڕاكێشا .

لاوەكە وتی : بەیانی تۆم لەسەر چیاكەوە بینی ، چاكبوو هاتی وەرە دانیشە دڵم هاودەمێكی دەویست . قووچ عەلی دانیشت و ووتی : بۆچی وا دەگریای ؟

لاوەكـە ووتی : بەسـەرهاتی من نـەختێك درێـژە . ئـەگـەر حەوسەلەی گوێ گرتنت هەیە بۆت بگێڕمەوە ئینجا دەستیكرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی بەم جۆرە گێڕایەوە .

«ئێمە حەفت براین ، لەدوو ڕۆژ زیاترنییە بۆناو ئەم جەنگەڵ دارستانە هاتووین لەشاری خۆمـان ئاسنگـەریمان دەكـرد بـاوكێكی پیرمـان هەبـوو باشتـرین شمشـێر سازی شاربوو . بەڕۆژ ئاسنگەریمان دەكـردو شەوانیش بـەدزیەو لەژێرزەمیندا شمشێرمان دروست دەكرد .

پاشا چەك سازی یاساغ كردبوو ، بەلام لەبەرئـەوەی خەڵكی پێویستیان بە شمشێربوو ئێمە ناچار بووین شەوان ئە ئیشە بكەین . لە دوكاندا «سندانێكمان» هەبوو بیست هێندی سندانی ئاسایی بوو هەشت كەس دەورمان دەداو چەكوشمان

پیا دەکێشا . ڕۆژێکیان باوکمان پێی وتین : کوڕەکانم من وا لەسەر ڕۆخی مەرگم و خەریکە دەمرم بەلام ئێوە سالانێکی درێژ دەژیەن و پێویستیتان بەهاوڕێ و هاوسەر هەیە ، وەختی ژنهێنانیشتان هاتوە ئێوە پێویستیتان بە ژنێک هەیە کە وەکو خۆتان ئەنگوچکی هەلکاو چەکوش بوەشێنێ و شمشێر دروستبکا . کچەکانی مامتان دەتوانن ببنە ئەم جۆرە هاوسەرە بەلام بۆئەوەی ئێوەش لێهاتوویی و توانای خۆتان نیشانبدەن ، من و مامی خوا لێخۆشبووتان تاقیکردنەوەیەکمان بۆداناون . نیشانی ئامۆزاکانتانمان لەناو دلی ئەم «سندانە» داناوە پێویستە ئێوە شمشێرێکی ئەوەندە تیژ دروست بکەن تا بتوانن بەیەك شمشێر سندانەکە بکەنە دوو پارچە تا وەکو نیشانەی کچەکانی مامەتانیان لەناودا دەربهێنن .

باوکمان پاش چەند ڕۆژێك مرد . هەر حەفت برا دەستمان بە ئیشکرد ، زۆرترین وەختمان لەژێر زەمین لەگەل پۆلاو ئاسن و چەکوش دەبردە سەر بەلام هەر شمشێرێکی دروستمان دەکرد کاری لە سندانەکە نەدەکردو شمشێرەکە دەبوە دووپارچە لەدوایی‌دا شەوێکی تاریك و تنۆکی ساردی زستاندا شمشێرێك لەژێر دەستمان هاتەدەر سندانە قورسەکەی شکاند .. لەناو سندانەکە قوتویەکی چکۆلانە هاتەدەر ، لەناو قوتوەکە پارچە کاغەزێکی تێدابوو لەسەریان نووسیبوو : «ئامۆزا شمشێر سازەکان ، لەسەر شمشێری تیژتان گەڕێین ، بەزوترین وەخت بەدوا ماندا وەرن . دلمان بۆتان پەریشان بووە . بیابانی سوتاومان بەدارو درەخت بۆتان چاندوەو کردومانە بەدارستان و جەنگەل ئاومان بۆ ڕاکێشاوەو چاوەڕێی ئێوەین . ناونیشانی ئێمە لەیەکەمین نونوخشەی لالەی بەهار بپرسن . ئامۆزاکانی خۆتان .»

ئەم کاغەزە ئێمەی ئەوەندە بێقەرار کرد کەهەر باس ناکرێ . دەمانویست هەر بەو شەوە هەستین بەدوایاندا بڕۆین . بەلام نەڕێ و شوێنی ئەوانمان دەزانی و نەدەمانتوانی ئیش و کارەکەمان بەجێبهێلین .

شەڕکەرانی شارەکەمان ڕۆژی هەزار شمشێری ئاودارمان پێ‌سپاردبووین کە پێش ئەوەی زستان تەواوبێ بۆیان تەواوبکەین . وا ڕێککەوت زستانەکە درێژەی کێشاو بەهار درەنگ هات و ئێمەش ڕۆژ لەڕۆژ بێقەرارتر دەبووین ، بەفر ، تازە تازە توابۆوە لەسەر گردێك گولێکی لالەی سوری گەورەم بینی پەڕەکانی خال خالی ڕەشیان لەسەربوو . لە لالەم پرسی :ـ گولی لالە ، کچەکانی ماممان لەکوێنە ؟ ناونیشانیانم بۆهەلبدە . گولە لالەکەش قەدی ڕاست کردەوەو پێی وتم :ـ ئامۆزاکیان ، ماچم بکە تا پێت بلێم . منیش بۆی چەمامەوەو لالەم ماچکرد . ئەو وەختە لالە ووتی :ـ زستانی ئەم سال بەسەختی تێپەڕی و بەهاریش درەنگ هات ، ئامۆزاکانتان زۆر نیگەران و پەریشانن ، ئەوەندە بێقەرارن کە ئەگەر زۆر زوو بەدادیان نەگەن ، ڕەنگە خۆشیان بکوژن ، من فێرتان دەکەم کەچۆن جارێك بچنە ناو پێستی ئەسپ و ، جارێکیش بچنە ناو پێستی کۆترەوە تا وەکو زوتر بیان گەنێ .

گولی لالە ڕێنمایی کردن و تێی گەیاندن چۆن جارێك بچنە ناو پێستی کۆترو جارێکیش هی ئەسپەوە . دوا قسەیشی هەر لەگەل من بوو ، ووتی :ـ ئامۆزا . زۆرم حەز دەکرد کە تۆ منت بچنیبایەو لەگەل خۆت بتبردمایە بەلام ... بەلام چی بکەم هەرچی تۆوی لالە بوو زستان ووشکی کردو ئەگەر منیش نەبم ئیدی کەس جلی سوور لەبەر ئەم گردانە ناکا . ئامەوێ بمچنی تاوەکو تۆکە بەهەموو شوێنێکا بلاو بکەمەوەو دوبارە گردەکان پڕ لەگولی لالە بکەمەوە ، بەرگی سووریان بەبەردا بکەمەوە . گولی لالەمان بەجێهێشت . شمشێرەکانمان تەواو کردو چوینە ناو پێستی کۆترەوەو لە شەقەی بالمان‌دا . پاشان ، لە فڕە کەوتین و ماندو بووین و چوینە ناوپێستە ئەسپەوە . بە ناو دەریاو چیاو چول و بیاباندا ڕابوردین . لەدوایی‌دا دوێنێ پاش نیوەڕۆ گەیشتینە ئەم جەنگەلە خامۆش و خالی‌یە . کۆشکەکانمان بینی ، چەند تەختی نووستنیان دانابوو . دانیشتین و چاوەڕێ بووین . شەو ، شەش کۆتری سپی لە شەش لای دارستانەوە پەیدا بوون هەرکە ئێمەیان بینی دلشاد بوون . نیشتن و لە پێستی کۆتر هاتنە دەرەوەو بونە شەش کچی وەك مانگ ، وتیان :ـ ئامۆزاکانمان بەخێرهاتن !

پاشان سەیری منیان کردو وتیان :ـ ئامۆزای بچکۆلانە ، تۆش بەخێرهاتی ! لالە خانی خوشکە بچوکمان وتی دەبێ ئارامت هەبێ . زستانی ئەم سال سەخت و درێژبوو تۆوی هەرچی لالە بوو وشکی کرد . ئەگەر لالە ئەم کارەی نەکردبایە ئێوە ئێمەتان هەتا هەتایە ون دەکرد . چونکە تۆوەکی دیکە نەبوو شین بێتو گول بداو ناونیشانی ئێمەتان

پێکەیەنێ . ئەگەر لالەی خوشکمان خوێنی خۆی نەڕژتبایە سەر زەوی ، زەمین هەتا هەتایە گوڵی لالەی نەدەدیتەوەو ئیدی مرۆڤیش هەتا هەتایە گوڵی لالەی نەدەدیت .

بەبیستنی ئەم قسانە وام بە خەیاڵ داهات خەریکە شێت دەبم‌و هاوارم کرد ! کەواتە ئەو لالە سورەی سەرگردەکە لالەی من بوو ؟ .

خوشکەکان وتیان : بەلێ . ئەو لالە سورەی سەر گردەکە لالەی خوشکە بچوکی ئێمە بوو . ئەو نەیدەویست خەلکی بڕوا بکەن کە هەر بەجارێك گوڵی لالە لە دەشت‌و دەردا نەماوە ، دەیویست دیسان گردو تەپۆلکەکان سوورو پڕ لالە بکاتەوە . بەلێ ، بەلێ خۆشەویستی ئەو لەهی هەموومان زیاتر بوو . ئەو خۆی بە قوربانی ئێمەو زەوی کرد . هاتمە سەر ئەو خەیاڵەی بگەرێمەوە و لالە بچنم . بەلام فیداکاری لالە ئەوەندە گەورەبوو بێدەنگ بووم . کچە ئامۆزاکانم منیان بردە قەسرەکەی لالە کە چۆڵ‌و کش‌و مات بوو . دوێنێ شەو هەموومان لە کۆشکی لالە بووین ، هەر لێرە لەو خانوە . کچە ئامۆزاکانم وتیان لالە منی زۆر خۆش دەویست زۆر بەسەختیش کاری دەکرد بۆ دارو درەختەکانی ناو دارستان‌و لە کانی سەر چیاوە ئاوی دەهێنا ڕۆژی بوکێنی‌و زاوایی هەمووشیان دادێ . بەلام براکانم‌و کچەکانی مامم لەبەر خاتری من ئاهەنگی شەوی زەماوەندیان دوادەخەن . ناشهێڵن من بگەرێمەوە شار . ئیدی ئێمشەو تەنیایی زۆری بۆ هێنام‌و گریام . ویستم باری دڵم نەختێك سوك بکەم . سوپاسی تۆ دەکەم کە گوێت بۆ هەڵڕژتنی دەردی دڵم ڕاگرت .»

کاتێك لاوەکە سەرگوزشتەی خۆی تەواوکرد ، قوچ عەلی وتی : هەقتە بگریەی . منیش وەختێ عاشقی کچی پاشا بووم . بەلام ئەو منی لە کۆشکەکەی دەرکردو ئیدی بەدوایدا نەچومەوە . لاوەکە پرسی : ڕقت لێی بووە ؟ .
قووچ عەلی وتی :ـ نەء . ئێستاش ئەگەر بیبینم عاشقی دەبم . ئەوەندە جوانە لە وێنەی نییە . بەلام ئاکارو ڕەفتاری بەدو خۆ پەرستانەی هەیە . من تاڵە مووێکی لالەکەی تۆ بەهەزاران کچی وەك کچی پاشا نادەم .
پاشان لاوەکە وتی : قووچ عەلی ، ئەی تۆ بەتەنیا دەژیەیت ؟
قووچ عەلی ووتی :ـ نەخێر ، من لەگەڵ لالەی خوشکم دەژیەم .
لاوەکە وتی : وتت لالە ؟ ئەوکچەی کە لەگەڵ تۆ مەڕی دەلەوەڕاند ؟
قووچ عەلی وتی :ـ بەلێ : ئەوکچە ڕوسوورە کێویە غەمنکە . ئەوە خوشکمە .
کوڕەکە لە شوێنی خۆی ڕاست بووەو وتی : قووچ عەلی ، دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم بەلام دەترسم لێم توڕە بیت .
قووچ عەلی وتی : دەزانم کە داوای خوشکەکەم دەکەیت زۆر باشە هەڵسە هەرئێستا بڕۆین . ئەگەر ڕازی بوو لەگەڵ خۆت بیهێنە . بەتەنیاش بێ هەر دەتوانم مەڕەکان بلەوەڕێنم ئینجا لاوەکە قووچ عەلی فێر کرد چۆن بچێتەناو پێستی ئەسپ‌و کۆترەوە .

لالە خان لەناو ئەشکەوتەکە خەریکی داهێنانی مووی بزنەکان بوو . هەرکاتێك کەخەوی نەهاتبایەو بەتەنیا بوایە ، ئەم ئیشەی دەکرد . بزنەکان بەڕیز پاڵکەوتبون‌و گوێیان لە چیرۆکی لالە گرتبو . مەڕەکانیش گوێیان دەگرت . . .
هەندێکیشیان خەوتبون یان لەسەرەخۆ کاوێژیان دەکرد . سەگەکانیش لەبەر دەمی کونی ئەشکەوتەکە جریتانێ‌و حەمبازیان دەکرد . مانگی نیوە شەو لەسەر ئەشکەوتەکە چەمابووەو ناوەوەی ڕووناك دەکردەوەو سەیری دەکرد . پاش کەمێك مانگ بەلالەی وت : لالە ، هەستە ئاگر بکەوە . ئیدی من ناتوانم لەمە زیاتر بمێنمەوە . دەڕۆم .
لالە هەڵساو لە دەرکی ئەشکەوتەکە ئاگری کردەوە . مانگ لەسەرەخۆ لەبەردەمی ئەشکەوت بۆیکشاو ڕۆیشت . بەسەر هاتەکە تازە تەواو ببوو کە دوو کۆتر خۆیان بەئەشکەوتەکەدا کرد . یەکێکیان سپی سپی‌و ، ئەویدی سپی‌و خاڵی سووری لەسەر سینەیدا هەبوو . لالە وتی :ـ باڵدارەکان ، ڕێگاتان ون کردووە ؟ وەرنە بەردەمم . کۆترە سپیەکە سەیری کۆترە خاڵدارەکەی کردو ئینجا وتی :ـ بڕۆ لای مەترسە . کۆترە خاڵدارەکە چوو لە ناو لەپی هەر دوو دەستی لالە هەڵنیشت . لالە سەیرێکی کردو ماچی کرد ، کوترەکەی تریش هات‌و لەڕۆخ لالە نیشت . پاشان لالە هەردووکی لەسەر زەوی دانان‌و وتی : لێرەبن دەچم دانتان بۆ دەهێنم . چووە ناو ئەشکەوتەکەوە . بەردێکی لادا کونێك بە دیارکەوت ئەشکەوتێکی بچوکتر بوو . ڕۆیشتە ناویەوە ، کۆترەکان بە خێرایی لەپێستیان هاتنە دەرەوە سەگەکان بەدیتنی قووچ عەلی هاتن بەرانبەری دانیشتن ، لالە بە مشتی

پڕ لەگەنم هاتەوە بینی برایەکەی لەگەڵ لاوێکی ڕەعناو دلێر لە ناو ئەشکەوت دانیشتووەو کۆترەکان نەماون . وتی :ـ قووچ عەلی ، باشە تۆ بۆ کوێ چوو بوویت ؟ زۆر دواکەوتی !

قووچ عەلی وتی :ـ ئێستا وەرە ئەم دۆستە تازەیەم بناسە ، پاشان پێت دەڵێم . ئەم دۆستەم بەدوای تۆدا بۆ ئێرە هاتووە .

یەکەمجار لالە بێدەنگ بوو . پاشان وتی : کۆترەکانی منتان نەبینی بۆ کوێ چون ؟

قووچ عەلی وتی : کە ئێمە هاتین ، لەشەقەی باڵیان داو بۆ دەرەوە چوون . من دەرۆم بیان هێنمەوە . ناتوانن لێرە زیاتر دور کەونەوە . ئێوە دانیشن قسەکانتان بکەن .

قووچ عەلی ئەمەی وت و چووە دەرەوە ، لەسەر تاتە بەردێکی گەورەی ڕوو لەدەشت دانیشت . پاش کەمێك دیتی لالەخان و لاوە دلێرەکە دەستی یەکیان گرتووەو بۆ لای ئەودێن . وتی :ـ پیرۆز بێ .

کوڕە لاوەکە وتی :ـ هاورێ ، گەر هیچ قسەیەکت نەبێ من دەمەوێ هەر ئێستا لەگەڵ لالە بۆ دارستانەکە بڕۆم . تاکو ئامۆزاو براکانم نیگەران نەبن .

قووچ عەلی بەزەردەخەنەوە بەلالەی ووت :ـ لالە ، ناتەوێ کۆترەکانت بۆ بگرم ؟ .

لالە بەزەردخەنەوە وەڵامی داوە : بەسە ، قووچ عەلی . سەرت چاك لەسەرمدا . ئێمشەو تۆی قۆشمەکانت گوڵی دەرکردوە .

ئەو وەختە هەرسێکیان تریقانەوە . لاوە بە قوچ عەلی وت : سبەینێ پاش نیوەڕۆ چاوەڕێتین ، وەرە جەنگەلەکە بۆ زەماوەندی بوك گواستنەوەمان . پاشان چووە پێستی ئەسپێکی سپی سپی و لالەی لەسەر پشت هەڵگرت و بەڕێکەوت .

قووچ عەلی تابانگی کەڵەشێری بەیانیان لەسەر گابەردەکە بەبێداری دانیشت . پاشان چوو لەپاڵ مێگەلەکە نووست .

دوێنی شەو جەنگەڵ ئاوەدان و پڕ چاڕو جەنجاڵ بوو . پەلەوەرو ئاژەڵ بێشمار بەهەموو لایەك دەهاتن و دەخشین و لەسەر درەختان لە ژێر دارو دەوەن و لە خاك و زەوی هێلانەیان دروست دەکرد .

حەفت برای ئاسنگەر لەگەڵ دەسگیرانە لاوو شۆخ و خوانەکانیان لە دەوری مێزێکی گەورە دانیشتبوون ، شێوی شەوی زاواییان دەخوارد . «قووچ عەلی» یش لەوێ بوو . بڕیاریان دابوو نیوەشەو بوك و زاواکان دارستانەکە بەگیانەوەرەکان بسپێرن و بەرەو شار بگەڕێنەوە . دەیانویست قووچ عەلیش ببەن بەلام ڕازی نەبوو ووتی :ـ پێویستە من ئاگام لە مەڕو بزنەکان بێت .

لەنیوەی شەودا ، حەفت بوك و زاوا دەستی یەکیان گرت و چونە ناو پێستی کۆترەوەو لەشەقەی باڵیان داو ڕۆیشتن . قووچ عەلی کەمێك لەناو دارستانەکە مایەوە بەلام نەیتوانی خەمی تەنیایی کەم کاتەوە . لەدوایی لەژێر درەختێك دانیشت و گریا . کەنەختێك باری دڵی سوك بوو ، بۆلای مێگەل و ئەشکەوتەکە هاتەوە» .

شوانی لاو دیسان تۆزێك بێدەنگ بوو . چاوی لەناو چاوە جوانەکانی کچەکە بڕی . دەیویست کاری قسەکانی لەناو چاوی کچەکەدا ببینێ . کچەکە بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتی :ـ زیاتر بۆم بگێڕەوە ، بڵێ بزانم قووچ عەلی چی لێبەسەرهات ؟ شوانە ووتی :ـ

ـ «شەوێك دوای ئەم شەوە بوو کە قووچ عەلی دوبارە کەوتەوە یادی کچی پاشاو دیتی کەئێستاش لە قوڵایی دڵەوە خۆشی دەوێت .

بەخۆیوت :ـ شوانی کێو شاخان نیم ئەگەر نەتوانم بیهێنمەوە سەر عەقڵ و هۆش ، بیکەمە مرۆڤ . هەر خۆم دەزانم دەبێ کارێك بکەم تاکو کچی پاشا ئاکارو خوی حەیوانی خۆی بەلاوەبنێ . دەبێ هەر بە یەکجاری لەم جۆرە ژیانەیشی دور کەمەوە .

ئەو وەختە چوە ناو پێستی کۆترەوە بۆ باغی کچی پاشا فڕی . ئارامی گرت تاکچە هات و چوە ناو حەوزی شیرەکەوە . «قووچ عەلی» ش هات لە سەر درەختێکی هەنار لە ڕۆخ حەوزەکە نیشتەوەو ووتی :ـ هۆ کچە جوانەکە تۆ لەش و لارێکی چەند جوانت هەیە ! من عاشقی تۆبومە . تکات لێ دەکەم لەناو ئەم شیرە وەرە دەرەوە تاچاکت تەماشا بکەم . کچی پاشا لەسەرەتا وەك سەگی هار دەستی بەدادو فیغان کرد . جوێنیدا ، فرمانیدا ، بەلام لەدواییدا لەبیریچوو کە کچی پاشایە و وەك کچە میهرەبانەکان دڵنەرم بوو ووتی :ـ ئەی

کۆتری قسە شیرین ، تکات لێدەکەم سەیرم مەکە . باش نیە .
قوچ عەلی ووتی :ـ بە دەست خۆم نیە ناتوانم سەیرت نەکەم خۆشم دەوییت .

کچە ووتی :ـ ئەی کۆتری قسە شیرین ، من نـاتوانم دڵداری لەگەڵ کۆترێك بکەم . ئەگەر عاشقی بەراستی لەپێستت وەرە دەرەوە تا فیش تەماشات بکەم .

قوچ عەلی لە پێستەکەی نەهاتەدەر . کچی پاشـازازی بوو خەوی خۆی بە قوچ عەلی بدات ، تاکو ئەو لەپێستی خۆی بێتە دەرەوە .

قوچ عەلی خەوی کچەکەی وەرگرت و لە شەقەی باڵی داو فڕی .

لەو رۆژە بەدواوە، خەو لە چاوی کچەکە ناکەوێ . ئەوەنـدە بێخـەوی کێشا تـا نەخـۆش کـەوت و کـەوتـە نـاو جێگـا . حەکیمەکانی شار نەیان توانی دەردی تیمارکەن . لەبەر ئەوەی پاشا فرمانی دابوو هیچ حەکیمێك نابێ دەستی پیسی لە لەشی کچەکەبدات .

رۆژێك قوچ عەلی خۆی هێنا سەر شێوەی حەکیمێکی پیرو غەریبە ، چووەلای پاشاو پاشدان بۆلای کچەکە ووتی کەبەبێ ئەوەی دەست لەلەشی بدات چاکی بکاتەوە .

مـاوەیەك سـەیری کچـەکەی کـرد کە وەك ئـەوەی بیـەوێ نەخۆشییەکەی دەست نیشان بکاو چاکی بکاتەوە ، پاشـدان ووتی ئەگەر کچەکەتان گوێی لە «ئەفسانەی خۆشەویستی» بێ چـاك دەبێتەوە . هیـچ کەسێـك لەم شارە «ئـەفسـانـەی خۆشەویستی» نەدەزانی دیسان قووچ عەلی لەشێـوەی پیرو غەریبە هات بەپاشای ووت لە فیسارە چیا شوانێکی لاو دەژی «ئەفسانەی خۆشەویستی» زۆر چاك دەزانێ و ئەگەر پاشا خۆی بەدوای دابنێرێت ، دێتە لای کچەکە .»

شوانەکە دیسان بێدەنگ بوو بە چاوە حـەیرانـەکانی تەماشای کچەکەی کرد . پێکەنی و ووتی :ـ بەڵێ ، کیـژۆڵەی نازدار ، کیژخان ، وابوو رۆژێك باوکت وەك سەگ منی لە ماڵ بەدەرناو هاتە ناو چیاو منی هێنایە لای تۆ ، ئێستا چ دەڵێی ؟

«کیژ خان نەی توانی بەری گریانی بگرێ . ووتی :ـ قووچ عەلی ، ئێدی من هەتا هەتایە ئەوەم لە بیرچۆوە کەکچی پاشام . من تۆم دەوێ . من ئێستا تێدەگەم کە چەند پێویستیم بە خۆشەویستی تۆ هەبوو . لەگەڵ خۆتمببـە . دەمەوێ وەك هەموو خەڵکی بژیەم .

قووچ عەلی ووتی :ـ بۆ تۆکارێکی ئاسان نیە وەك هەموو خەڵکی بژیەیت . چونکە لە ناو نازو نیعمەت گەورە بوویت . بەلام ئەگەر خۆت بخوازی لەگەڵ ژیانی تازەشت رادێیت .

کیژ خان ووتی :ـ ئـەگەر لەگـەڵ تۆو خـەڵکی دیکەبم هەموو کارێك بۆ من ئاسانە ، لەگەڵ خۆتم ببە . کچخان تەنیا بەجێمەهێڵە .

قووچ عەلی فرمێسکی چاوەکـانی سرپـەوەو سێوێکی لە باخەڵی دەرهێناو ووتی :ـ ئێستا تۆ نەخۆشی . وەرە ئەم سێوە لەدەستی منەوە بخۆ ، پاشدان بەسۆراغت دادێمەوە . ئێدی هەتا هەتایە منت خۆش دەوێ دەزانم .

کچە نەشمیلەکە سێوەکەی وەرگرت و خواردی ، لەسەر پشت لێی راکشا ، ئەو وەختە بەرە بەرە چاوەکـانی لێك نـاو چووە ناو خەوێکی شیرینەوە .

قووچ عەلی هەستا ماچێکی لە کوڵی کچەکە کردو چووە دەرەوە . بەپاشای ووت :ـ خەوی کچەکەتم گەڕاندەوەو خەوم لێخستت . تا سێ رۆژان کەس پێ لەدەوروبەری قەسـرەکەی نەنێ تا نارەحەت نەبێ و خەوی نەزڕێ . رۆژی چوارەم بڕۆن بێداری کەنەوە .

بەیانی رۆژی دوەم ، پێش خۆر هەلاتن ، قووچ عەلی لە شێوەی کۆترێك هاتە لای «کیژخانم» و لە پێستەکەی هاتە دەرو گوڵێکی سوری بەبەر لوتی کچەکەوە نا . کچە چاوەکانی هەڵهێناو بەبێ دەنگی و بە نەرمی زەردەخەنەیەکی هێنا خۆی

قوچ عەلی ووتی :ـ بەئارامی نووستی .

کیژ خان ووتی ، خەوێکی شیرینم لێکەوت ، وەك قەندو هەنگوین . ئێستا لەگەڵ خۆتم دەبەی ؟

قوچ عەلی ووتی :ـ بەڵێ . هەڵستە بڕۆین لەناو باغەکە خـۆت بشۆو پاشدان بڕۆین .



تازە هەتاو هەلاتبوکە دوکـۆتری سپی لەسـەر لقی دار هەنارەکەی قەراخ حەوزەکە لە شەقەی باڵیان داو بەرزبوونەوە بەرەو خۆر فڕین .

(1) لەبەر نارێکی ماناى و دەور نەبونی ماناى ئـەم پەرەگـرافەم رەش کردەوە .



● د . نافع ئاكرەیی ●

# دەوروبەرو گیروگرفتەكانی لەشاری هەولێر

ماناو و مەبەست چی‌یە لە و شەی دەوروبەر .. ؟ لە هەمو جیهاندا .. .. لە سەر هەموو ئاستەكانا گرینگی‌یەكی تایبەتی پێدەدرێت .. بۆ .. ؟ دەوروبەر واتە « بیئە » یا « محیط » ئەو كومەڵە هۆیە سروشتی‌و دەستكردانەیە كە مرۆڤ تێیرا دەژی‌و كاردەكاتە سەر تەندروستی‌و بەرهەم‌هێنان‌و موچەكەی خۆی ... دەوروبەر رێكخراوێكی پر گرێ‌یە كە ژیانی كومەڵی تێدا نەشونەماو پەرەپێدەدرێت بە بێ‌راوەستانو لە ناو چارچێوەی بارو زروف گشتی سروشت لە سەر زەوی پەیكەردەگرێت و هەمو زیندەوەرەكان لە ناودا دەژین‌و نەشونەماو كار لە یەكتر دەكەن . هەر وەها تەئسیر لە سەر دەوروبەری بێ‌گیانیش دەكەن ... بە چاكی‌ئاشكرایە كارتێكردنی هۆیەكانی تایبەتی لە هەر دوو لایەوە بە سەر یەكتریانەوە و لە سەر ئەم كارتێكردنە دوو لایە هێندەك یاساو نەریت دروست دەبن بۆ رێكخستنی پەیوەندی نێوان هەر دوو لادا هەر وەكو ئالوگۆڕ كردنی ئێنرژی لە نێوان بەشەكانی زیندو و بێ‌گیانی سروشت‌دا .

ئەم نەریت‌و یاسایانە ، ئەوەی پەیوەندی نێوان دەوروبەرو زیندەوەرەكاندا رێكدێخێ و پەرەپێدەدا پێویست بە كۆكردنەوەی چەند هۆیەكەوە هەیە یان ژی گوڕانی شێوازەكانە تا زیندەوەران توانای خۆڕاگرتنیان هەبێ لە ژێر سایەی ئەو یاساو نەریت و هۆیانە بە ئاسانی ... بۆ نموونە پاوانەكانی بەهارو هیشكی و نەبوونی ئاو لە هاویناندا وا لە خێڵەكانی بەدووی عەرەب دەكەن كە ئەبێ لە ناو بیاباندا هات‌وچۆبكەن و بە دوای دەوروبەرێكی چاك بكەڕێن تا خۆیان و سامانیان بپارێزن .

هەر وەك دەزانین لە ئەزەلدا رۆژ هەر رۆژەكەی جارانەو خولی ئاو لە سروشتدا هەر خۆیەتی‌و نەگۆڕاوە ... هەمویان لە یاسایەكانی سروشتن‌و هیچ تێكچون لە سەر ئەم یاساونەریتانە نەكراوە ، بەلام كۆمەڵگانی مرۆڤ بە تایبەتی لە پەرەپێدانە دوایەكەی‌دا و پێشكەوتنی بەرەو چاكتر هەروەك دیارە لە زیرەكی‌و جم و جولیەكانی خوی‌و ئابوری مەزن و خەست .. چونكە بەرهەم هێنانی ئێنرژی و پیشەسازی و كشت‌و كاڵ‌و كیمیا و لقەكانی تری ئابوری و زانست ... ئەم هەموو شتانە وادەگەینن كە پێویستی نەشونەماو زیادبوونی پێویست بۆ

بەکارهێنانی کانە سروشتیەکان بە زۆری و ئەگەر ئەم بەکارهێنانە بەرێبازێکی ئاقلانە و بەکێشەکی چاك بە کارنەهێنرێن دوایەکەی دەبێتە هۆی دروست بوونی تەناقوزاتی ترسناك لە نێوان کۆمەلگای مرۆڤ و دەوروبەری‌دا و تێکچونی یاساو نەریت و قەواعیدی ناسراوی ئەزەلی لە نێوان دەوروبەرو مرۆڤ وسرۆشتدا .. بۆ نموونە ئالودە بوونی هەوا بە هۆی ئەو هەلمانەی لە دوکەلی کارگاندا دەردەچن ئالودەبوونی ئاو بە هۆی ئەو رێگا نە زانستیانەی لە ناو بردنی پاشماوەکانی پیشەسازی‌و کوربوونی ئاوی پیس‌و مەجاری بو سەر سەروچاوەکانی سەرەکی ئاوی روبارەکانەوە و گورانی خول‌و خاك بو سویریاتی لە بەر بە کارهێنانی کودی کیمیاوی‌و توزی لە گەل دوکەلی کارگاکاندا دەردەچێ ... ئەم هەمو شتانە کارتێکردنێکی کاریگەر لە سەر ژیانی زیندەوەران دەکا چ ئاژەل‌و مرۆڤ یان رەوەك‌و دارو درەخت ... مرۆڤیش پارچەیەکە لە هەر دووان ... ئاژەلێکی ئاخوتنکەرەو بو بەردەوامی ژیانی پالپشتی لە سەر رەوەك‌و دارو درەختە ... لە بەر ئەم هۆیە ئەتوانم بلێم کە گرینگی پێ‌دان بە دەوروبەر و دوورئێخستنی ئالودەکردنی ئاوو هەواو خواردەمەنی‌و لابردنی هۆیەکانی نەخوشی مرۆڤ هەموی بو بەختەوەری مرۆڤەو هەتا بتوانێت بە ئارامی بژیت‌و ئەوە ژی هیواو ئومێدی هەمو مرۆڤێکی مرۆڤ پەروەرە .

هەر لە سەر ئەم بناغەیە بو کو زەنگی خەتەر لە لای زانایەکانی خاوەن ئیختیساس لێدرا لە سالەکانی دوایی سەددەی پێشوو ئەم سەدەیەی ئێمە تێدا دەژین تا نهو ..

گرینگی پێدان بەم مەسەلەیە گەیشتە رادیەکی وا کە دەولەتەکانی دەزگای تایبەتی تەرخان بکەن بو لە ناو بردنی گیرو گرفتەکانی مەسەلەی دەوروبەر تا لە هیندەك وەلات‌دا گەیشتە رادەی دانانی وەزارەتی کاروباری دەوروبەر دیسان لە هیندەك ولاتی دیکەش‌دا جێگری سەرەك وەزیر هەیە بو کاروباری دەوروبەر .

ئاشکرایە گرینگی بەم مەسەلەیە تا چی سنورێکە لە بەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە کاریکی سەرەکی و هۆیەکی بەرامبەری‌یە بە سەر ژیان‌و تەمەنی مرۆڤ .. هەر وەها هەمیشە گەڤ لێ‌دەکات ئەگەر بە چاکی نەپارێزرێت .. لە بەر ئەوەو بە هوی ئەو راستی‌یانەی باسمکردن دەبا هەستی ئێمە بەرامبەر دەوروبەر بەرزببێتەوە و مەسەلەی پاکی و ئالودەیی دەوروبەر روون بکرێتەوە بو هەموو خەلك‌و ئەو شتانەی گەف لە ژیانی خوشیان دەکەن دەبێ ئاشکرا بکرێن‌و وایان تێبگەیێنن کە دەبێ گرینگی بەدەوروبەری خویان بدەن . چونکە دەوروبەر هەر وەك پروفیسوری نەرویجی « س . ویل » دەلێت و رێکخراوی یونسکو سەلماندویەتی : « دەوروبەر ئەو پارچە جیهانەیە کە تەئسیر لە سەر مرۆڤ دەکا و مرۆڤیش کاری لە سەر دەکا » واتە ئەو پارچەیە کە مرۆڤ بە کاری دێنێ وتەئسیر تێدەکاو لە گەلدا دەژێت دیسان بەم خالانەی خوارەوە شێ‌دەکرێتەوە :

1 — ئەو پارچە جیهانەی - توپی زەوی - کە کۆمەلگای مرۆڤ تێدا دەژی .

2 — ئەو پارچە جیهانەی کۆمەلگای مرۆڤ تێدا نەشونەماو پەرەپێ‌دەدرێت لە گەل بەردەوامی ئالوگورکردنی ئینرژی نێوان مرۆڤ‌و سروشتدا .

3 — یان ئەو پارچە جیهانەی کۆمەلگای مرۆڤ تێدا دەژێ ژیانێکی کۆمەلایەتی پەرەپێ‌دراو .

لێرەدا ئەتوانم بلێم دەوروبەر « بەرهەمێکی مێژوی پەیوەندی نێوان مرۆڤ‌و سروشت‌و مرۆڤ‌دایە لە هەمو قوناغەکانی ژیانی‌دا لە منالی‌یەوە تا پیری و لە هەموو جم‌و جولی و ئارامی و کارەکانی‌دا لە ناومال‌و لەو جێگایەی ژیانی تێدا دەباتە سەر یان خانەنشین دەبێ .. » لێرەداو پاش کە زانیمان دەوروبەر چی‌یە ... ئەبێ بزانین مەبەست لەو کەسەی دەوروبەر دەپارێزێ چی‌یەو ئەو کەس کی‌یە .. ؟ئەرێ هەر پزیشك‌و ئەوانەی لە مەیدانی تەندروستی‌دا کاردەکەن تەنها کەسن بەم کارە گرینگە هەلبستن ... ؟ دەزگایەکانی راپەراندن‌و خزمەتگوزاری‌و کارگێری یان هاوولاتیانیش ... ؟

ئاشکرایە مرۆڤ نازانێت و هەست بەو شتانە ناکات کە لە ناو دەوروبەری‌دا جم جول دەکەن ... جگە لەو کاتەی نەبێ کە هەست بە خەتەر دەکا ... لەو دەمەدا دەست بە بیرکردنەوە دەکات کە چۆن خوی لەم ئاستەنگ‌و تەنگافیەدا رزگاربکات ... هەر لە بەر ئەو چەندەبو کە ئێمە بیر لەخو و لە غەیری خو نەکەبن پێش مەسەلەکە ئەزنتر ببێت و خەتەرەکە دەرگاکانمان لێ‌بدەت و وەك ئامێری درونەوەی دەغل و دان گیانەکانمان بدروتەوە .

هەر لە بەر ئەوە ژی دوبارە دەپرسم کە کی‌یە لێپرسراوی پاراستنی دەوروبەرمان ... ئەوانەی بە کاری تەندروستی

هەڵدەستن یان ئەوانەی‌تر .. ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ڕێکخراوی تەندروستی جیهان « W.H.O » داوەتەوە لە کاتی لە سەر دەوروبەر دەدوێت و چەند پرسیارەك ئاراستە دەكات :

« چاكی دەوروبەر دەژمێرێت لە وەلامەكانی ئەم پرسیارانەدا :

1 — چەند مرۆڤ ئاوی پاك كە هێزای خواردنەوە بێت دەخونەوە .. ؟ئایا ئەم كارە كاری ئەوانەیە كە لە مەیدانی تەندروستی‌دا كار دەكەن . ؟ یان ژی چەند دەزگای مەزنی‌تر هەن‌و بەم كارە هەڵدەستن‌و بە مەلیونەها پارە لە سەریاندا سەرف دەكرێت ..

2 — چەند مرۆڤ بە چاكی لەناوبردنی پاشماوەكانی پیس و مەجاری هەیە بە وێنەیەكی زانستی و ڕاست‌و دروست .. ؟ ئەری ئەمە ژی كاری ئەوانەیە كە لە مەیدانی تەندروستی دا كاردەكەن .. ؟

3 — ئەری مرۆڤی لەو كومەڵگایەدا دەژی بە تەواوی خواردەمەنی‌یەكی چاك و پڕ لە هەمو پێویستیەكانی زەروری بۆ لەشی خۆی دەخوا .. ؟

4 — ئەو پارە و پولەی لو بودجەی گشتی‌دا تەرخان دەكرێت بو لە ناو بردن‌و پاراستن لە نەخۆشی‌یەكانی نیشتەجێ و ئەوانەی دیاردەبن كافی‌یە بۆ ئەم مەسەلەیە .. ؟

ئەم كارانەی باسمان‌كردن ئاشكرایە كە تەنها كاری ئەو كەسانە نی‌یە كە لە مەیدانی تەندروستیدا كاردەكەن ... لە بەر ئەوە ئەو بیرەی لە ناو خەڵكدا هەیە كە هەر كلتێ باسی دەوروبەركرا ... ناوی دەزگای تەندروستی دێتە گۆرێ ڕاست نی‌یە و دەبێ بۆ خەڵك روون بكرێتەوە تا بزانن راستی مەسەلەكە چی‌یە ... هەر چەندە دەزگای تەندروستی دەورێكی گرینگی هەیە لە راپەڕاندنی ئەم مەسەلانە هەر وەك لایەكان و دەزگایەكانی تر و هەمو میللەت‌و لێپرسراوەكان دەوریان‌هەیە لەم مەسەلەیەدا بەلام مەسەلەی پاراستن‌و بڵندكردنی هەستی دەوروبەری كاری دەزگای تەندروستی‌یە ، چونكە ئەوانەی لەم دەزگایەدا كاردەكەن لە هەموو كۆمەڵەكە زیاتر لەم مەسەلە تێدەگەن‌و دەزانن خەتەری ئالودەیی و تێكچونی دەوروبەر چۆنە‌و چی تشتێك دێتە ڕێگای كومەڵەوە لە پاشەڕۆژدا .

لە بەر ئەوەو لە نێوان ئەو خاڵانەی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی دیاری كردون ئەتوانین گیرو گرفتەكانی دەوروبەری شارەكەمان بینینە بەر چاو ئەو شارەی هەوایەكەی هەڵدەمژین و هیوامان وایە ژیانێكی بەختەوەر تێدا ببەینەسەر . شار هەر وەك هەمومان دەزانین گیان لەبەرێكە وەكو مرۆڤ ... چونكە شار دەژی‌و هەوا هەڵدەمژێ و نەخۆش دەبێ و چادەبێتەوە و بناغەی تەندروستی و ژیانەكەی هەموو مەرافیقەكانین هەر وەك زیندەوەر بە ئەندام و دەزگایەكانی خۆیەوە دەژێ ... دیارە زیندەوەر دروست دەبێ‌و نەشونەمادەكا و دەمرێ لە بەر نەخۆشی‌یەك دیسان شار ژی دروست دەبێ و نەشونەمادەكا و پەرەدەستێنێ و پاشان تێكدەچێ‌و دوور نی‌یە هەر نەمێنی لە بەر نەخۆشی‌یەك وگرینگترین نەخۆشی كە بە سەر شارەكدا دێت ئالودەیی ئاو و هەوایەكەی وزیاد بوونی پاشماوەكانی و زبڵ زۆری‌یە ... لە بەر ئەوە دەوروبەر ئەوە كو مرۆڤ تێدا دەژی‌و وكار لە تەندروستی‌و موچەو بەرهەمەكەی‌دا دەكا ... ئامانجی هەموو پروگرامەكانی پاراستن و راستكر دنەوەی دەوروبەر ئەوە كو كۆمەڵگا پەرە بسێنێ لە ماوەكانی پاراستنی كەسەكان و كومەڵەكان لە زەرەرو خەتەرەكانی دەوروبەری گشتی و تایبەت و پەرەپێدانیان بۆ وەدەست‌هێنانی ئاشتی و ئارامی و هێمنی بو مرۆڤ و یارمەتی‌دان بۆ نەشونەمای مرۆڤ‌و چاككردنی تەندروستی‌یەكەی و زیادكردنی توانای بەرهەمهێنانی لە ڕێگای بەكارهێنانی زانستە ناسراوەكان‌و ڕێبازەكانی ئەندازیاری چونكە ئەوەی لە پرۆگرامەكانی چاككردنی دەوروبەر وەدەست‌دێت زیاترە لە وەی كە لە زیرەكی و نەشاتەكانی خزمەتگوزارەكانی‌تر وەدەست‌دێت لە بەر ئەوەی كارێكی گرینگ دەكا تە سەر تەندروستی گشتی و بەختیاری مرۆڤ وبەرفرەهبوونی هۆو شێوازەكانی ئارامی بۆی . بێ گومان ئەم ئیشە تەئسیر لە سەر ئاستی زیادكردنی بەرهەم‌و زیادبوونی توانای داهێنان لە كارەكەدا دەكا ... بۆ نمونە ئەو كرێكارانەی لە گەرەكە كانی جیاوازدا دەژین ... وەك كرێكارەك كە لە ناو ئودەیەكدا دەژی لە گەڵ چوار نەفەری‌تر ـ ئەگەر نەڵێم زیاتر ـ بەشێك لە ئازادی خۆی لە دەست‌دەدا ئەمە ژی دەبێتە هوێ زیادبوونی گیرو گرفتەكانی و توش‌بوونی نەخۆشی و لە دوایی‌دا ئاستەنگ لە ڕێگای‌دا پەیدا دەبن و ڕێبازەكەی دوادەكەوێ ... و لە ناو بەربەرەكانیەكی توندا دەژی .. دژی هەڤاڵو لێپرسراوەكانی دەجولێتەوە و تەركیزی لە كاتی كاركردن‌دا كەم دەبێ و توشی زۆر گیرو گرفتی‌تر دەبێ لە دەرەوەو لە ناو كارگادا . دەوروبەری گشتی تەواوكەری دەوروبەری خانەو بەری ژیانی مرۆڤە ... وەك مەرافیقی گشتی

.. مەیدانەکانی یاریکردن و خزمەتگوزاری پێویست و باغو حەدیقە و چاندنی درەخت لەناو جاددەو ڕێگاکاندا و زیادکردنی شێوازی شادی بۆ هەموو کەس ... ئەم شتانە دانەیەکە لە تەغارێکدا و نمونەیەکی بەر چاوە ... وامان لێدێت ئەگەر هەستی دەوروبەرمان بڵند نەبێت و خەبات نەکەین بە هەمو لایەکەوە و بەتوندی بۆ ڕاپەڕاندنی گشت پروگرامەکانی پاراستنی دەوروبەرو نەگەهێنینە ئاستێکی چاك ... ئێمە و منالەکانمان توشی خەتەری پاشە ڕۆژی ئالودەیی دەوروبەر دەبین ...

گیر و گرفتەکانی دەوروبەر لە شارەکەماندا زۆرن و ئەمەوی برەك بە زیرەکی دەستنیشانیان بکەم و بیانخەمە بەر چاو تا هەوڵ بدەین نەهێڵین .

1 — گیرو گرفتی کەمی یا هەر نەبوونی هەستی دەوروبەری لە ناو شارەکە ماندا ... بۆ نمونە ئەگەر یەکەك لەوانەی هەست بەو خەتەرە دەکەن باسی ئەو بابەتە لە گەڵ هاوولاتی یەك بکا بە تایبەتی ڕۆشەنبیرەکان ئەم کەسە بابەتەکەی بە کەم دەزانێ و بەهای ناداتێ و وا دەزانی مەسەلەکە بەم وێنەیە نی یە .. بەلێ بێ گومان ئەگەر کەسەکە ئاگای لە دەوروبەری خوی هەبێ و بزانی چون ئالودە دەبێ و تەئسیر لە سەر ژیانی خۆی دەکا کەم بەهایی و بێقیمەتی بەم مەسەلەیە نادات لە بەر ئەوە گرینگی پێدانی زیادکردنی هەستی دەوروبەری لای هاوولاتیان شتێکی گەلەك گرینگە و دبێ بە هەمو هەولێکیەوە پالپشتی ئەم مەسەلەیە بکرێت وکور بوی بکرێت و ماموستایەکان هان بدرێن بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە بۆ قوتابیان شێبکەنەوەو و کوری کرێکارو جوتیار بو ئەم مەسەلەیە تەرخان بکرێن ، چونکە ئەگەر دەستو باسکمان لەو مەسەلەیە هەلنەکەین و چارە سەرێك نەدۆزینەوە پاشان دەست گەزتن بێ سودە .

2 — گیرو گرفتەکانی ئاو : ئەرێ ئەو ئاوەی دەخۆینەوە پاکە .. ؟ بە پێی مواسەفاتی جیهانی هێژای خواردنەوەیە ... ؟ لێرەدا بە شادی وشانازییەوە خەبەرێکی خۆش دەلێم کە لە پاش پێشکێش کردنی باسێکی زانستی لە سەر کانە ئاوەکانی عیراق کە لە کۆنگرەی 17 — 19 / 5 / 1983 دا پێش کێش کرا و تایبەتی بوو بۆ «چاککردنەوەی دەوروبەری عیراق » لە وەزارەتی تەختیط بەسترا وا ئاشکراکر کە ئاوی هەموو روبارەکانی عیراق ئالودەیە جگە لە ئاوی زێی بادینان نەبێ کە ئێمە دەخۆینەوە ئەمە ژی بە هۆی ئەو تەقینە مەزنەی پیشەسازی یە لە ولاتدا ... بەلام ئێمە زیاتر لە ئاوی زێی بادینان ئاوی بیرە ئیرتیوازیەکانیش دەخۆینەوەو ئاوی زێی ژی تا دەگاتە مالەکان بە چەند قۆناغدا تێدەپەرێت ... گواستنەوەو کۆکردن و بلاوکردنەوە بەسەر مالەکاندا و تێکهەلبوون لە گەڵ ئاوی بیرەکان ... ئایا لەم قۆناغانەدا توشی ئالودەیێ نابێت ... ؟ ئەمە ژی کاری دەزگای ئاوەو وا بزانم درێغی کەمە لەم بوارەدا ..

3 — گیرو گرفتەکانی خواردەمەنی : ئەرێ ئەو پارو نانەی دەکەوێتە دەممانەوە و ڕێگای دەزگای هەزمی دەگرێت و سودی لێ وەردەگرین لەو کاتەی دەگەرێنەوە بۆ ماڵ پاش ماندووبوونی سەختی کار هیچ زیانەك بە لەشمان دەگەینێ ... ؟

بابەتی خواردەمەنی و گەیشتنی بۆ سەر سفرەو گرتنی ملاك بەدەستەوە بە زۆر قۆناغدا تێدەپەرێ ... لە پەرێزو شوفی دەغل و دان وجێگای بە خێوکردنی مریشك و مەل و ئاژەلی خومالی تا دەگاتە جێگای سەربرین و پاککردنەوەو دوکانی قەساب و دوکانی فروشیاری تەرە و فروشیاری ماست و شیر و فرنی نانەوا و ساردەمەنی و چێشتخانەو جاددەو کولان و ئەو مالەی تێدا دەژین ... ئەم هەمو جێگایانە بەشدارن لە پێکهێنانی پاروەکەدا و هەر گیرو گرفتێك لە قوناغێك لەم قوناغانەدا هەبێت تەئسیر لە سەر مروڤ و دەوروبەری دەکات .. لە بەر ئەوە گرینگی پێدان بە چێشتخانەی ماڵ و لوقەنتەو جێگایەکانی فرۆشتنی خواردەمەنی وساردەمەنی کافی نی یە بو ئەوەی خواردنێکی چاك و پاك پێمان بکات لە بەر ئەوە دەبێ گرینگی بەم هەموو قوناغانە بدرێت تا ئالودەیی دەوروبەرمان دروست نەکەن و کار لە سەر تەندروستیمان نەکەن .

4 — هەوا : ئەرێ ئەو هەوایەی هەلدەمژین لە ئاسمانی شارەکەمان پاکەو بەخۆشیمان پێ نابەخشێت ... ؟

بێ گومان ئەو شتانەی بەشدارن لە گۆڕین و ئالودەبوونی هەوای هەر شارێك لە هەر کومەلگایەکدا لە جاددەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە کۆلان و مالەکان و مەرافیقە گشتی یەکان وەك باغەکانی گشتی و سینەما و شانو هەروەها جێگایەکانی کار چ لە جێگای تایبەتی یان لە کارگاکاندا ... ئەرێ کارگاکانی شارەکەمان کە ژمارەیێکی زۆری هاوولاتیان تێدا کار دەکەن و لە گەڵ خێزانەکانیاندا کومەلێکی زۆری کومەلگای شارەکەمان

تەشكیل دەكەن هەموو مەرجەكانی تەندروستی تێدا هەیەو تەئسیر لە سەر تەندروستی یان ناكا .. ؟
ئەری ئوتوماتیكیەتو بوون بە مەكینەیی گواستنەوەی شارستانی چی ئوتوموبیلی بچوك یان مەزن یان شەمەندەفر هەموو مەرجەكانی دەوروبەری تەواویان هەیە كە گازە پیسەكان فڕەنەدەنە ناو هەوای شارەكەدا لە پاش سوتانەوەی بانزینو گازوئیل لە ناومەكینە كاندا ... ئەری دەوروبەرو هەوای كارگایەكانو ئەو گازانەی لە مەكینەكانی كارگاكاندا دەردەچن كار لە سەر تەندروستی كرێكاران دەكا .. ؟ ئەم هەمو پرسیارانە پێویست بە وڵامی چاكو تەواویان هەیەو زیاتریش لەوە پێویست بە راوەستانێكی بیركردنەوەیی هەیەو دیسان پێویست بە دانانی دیراسات و باسی زانستی هەیە تا گیرو گرفتەكانی هەوای شارەكەمان روون بكرێنەوەو هەموومان هەوڵ بدەین ئەم گیرو گرفتانە لە ناو ببەین تا وەزعێكی هەوای چاكو دروست بێتە ئەنجام لە شارەكەماندا .

5– لە ناو بردنی پاشماوەو زبڵی شار .. مەبەست لێرەدا زبڵو پاشماوەكانی تاقە كەسو تاقەماڵێك نییە بەلكو ئەوەی مەبەستە لێرەدا : چون خومان رزگار بكەین لە زبڵ و پاشماوەكانی شارو كارگاكان و خەستەخانەكان و ماڵەكانیش و ئەگەر بتوانرێت سود لەو زبڵ و پاشماوە وەربگیرێت ... چونكە مەجاری و رزگاربوون لە زبڵ گیروگرفتی هەرە مەزنی شارەكەمانە ... چ كۆبونەوەی گۆمی ئاوی بۆگەنو پیس كە دەبێتە پەرێزێكی چاكی نەشونمای بەكتریا و مێشو مەگەس و دیارە لە جادەو كولانەكانی شارەكەماندا چی گیرو گرفتێكی مەزنە و . دەزگایە كانی لەم مەسەلەیەدا كاردەكەن تا سنوری توانا مژولی لە ناوبردنی‌نە ! ئەوگیروگرفتانەی گوتمان هەمویان بوینە ئاستەنگ لە رێگای جێ بە جێ كردنی پرۆگرامەكانی پاككردنی دەوروبەردا كە چی ئەگەر پێكەوە و بەوێنەی هاوكاری هەموومان دەستو باسك هەڵدەین و هەستی دەوروبەر لە ناو خەلكدا بەرز بكەینو ئەم هەمو كۆسپەو ئاستەنگ ئاسان دەبن و دەتوانین ئەم گیرو گرفتانە لابدەینو دەوروبەرێكی چاك بۆ خۆمان دروست كەین كە بە ئارامی و خۆشی هەوای پاك هەڵمژینو ئاوی بێنەخۆشی بخۆینەوە و خواردنی چاك و پاك بخۆین نە وەك شتەكان ئالۆزدەبنو دەبنە گیرو گرفتی ژیانمان و كۆمەڵەكەمان دوادەكەوێ و كار لە سەر سایكولوژیەتو بەرهەم هێنانمان دەكاتو بە تایبەتی لای ئابوری ولاتەكەمان تێك دەچێت .. لە بەر ئەوە پێویستیمان بە هەموو هەوڵو تەقەللایەك هەیە بۆ ئەوەی كۆمەڵەكەمان بگاتە ئاستی ئومێدو ئەم پێشنیازانە ژێ گرینگن : –

1– چاودێری بەردەوامی كانە ئاوەكان بە تایبەتی فیزیكی و كیمیاوی و بەكتریۆلوجی .. !

2– چاودێری بەردەوامی هەمیشەیی بە سەر جێگایەكانی سەربرین و لوقونتەكان و چایخانەكان و فرۆشیارەكانی خواردن و ساردەمەنی بەتایبەتی گەڕۆكەكان كە دەبێ قەدەغەبكرێن چونكە هۆی گەلەك گیرو گرفتن ..

3– لابردنی ئاژەلەكانی بێ خاوەن وقەدەغەكردنی مانەوەی ئاژەلی خومالی لە ناو مالەكاندا .

4– هاوكاری دەزگایەكانی راپەراندن بو دەزگایەكانی كاری دەوروبەر پەرێوە دەبن بو ئەوەی بریارەكانی ئەنجومەنی دەوروبەر جێ بە جێ بكرێن

5– بە كارهێنانی یاساكانی هاتوچون بۆ لابردنی پاشماوەكانی سوتاندنی گاز ئویڵ و بانزینی ئوتومبیلەكان دیسان قەدەغەكردنی هلێین لێدان .

6– لابردنی گۆمی ئاوی پیس كە لە ناو جادەو كولانەكان كۆبویتەوە بۆ ئەوەی مێش‌ومەگەس وبەكتریا تێدا لانەی نەكەن .

7– گرینگی پێدانی بڵندكردنی هەستی دەوروبەر لە ناو كومەڵدا بە رێگای كۆڕ گرتن و شیكردنەوەی مەسەلەی دەوروبەر بۆ هەمو هاوولاتیان وهەولدان بۆ ئەوەی هەمو كەسێك ئەبعادی دەوروبەو بزانیت تا هاوبەشی لە چێكردن و پاككردنەوەی دەوروبەر بكات .

8– دوبارە دەكەرێمەوەو دەلێم لە دوایی‌دا ئەبێ زیرەكی و جورئەتێك مان هەبێ بۆ جێبەجێ كردنی بریارەكانی ئەنجومەنی دەوروبەر و ئەوانەی لەو كارەدا بەشدارن بە تایبەتی ئەو بریارانەی سود و بەرژەوەندی گەلو دەوروبەری تێدایە و ئەبێ دووركەوینەوە لە تەئسیرو كارتێكردنی لابەلایی كە بەرژەوەندی هێندەك كەس دەپارێزێو ... نابێ بەرژەوەندی گشتی بە بەرژەوەندی تاقە كەسێكو هێندەك كەس بدەین و دەبێ نیشان و ئالامان هەر بەرزكردنی ئالای بەرژەوەندی كومەڵ بێت نەوەك شتی‌تر .

● امیره اسماعیل حسین ●

# کانی یەکانی عیراق و سیفەتی جیۆلۆجی و سوودیان

پێشەکی :

کانی یەکان یەکێکن لە هۆیە سەرەکی یەکانی نیشتەجێبوون ، بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە پێویستی یەکانی (ئامێرەکانی) بەدی هێنانی ئاوی ژێرزەمینی نەبێ یان بەدەگمەن بێ . جێگای سەرسوورمان نی یە کە لە دێر زمانەوە چەند گوندو شاری دەوروبەری کانی یەکان گەشەی کردووە .

کانی بریتی یە لە گەیشتنی ئاوی ژێر زەمین بۆسەر رووی زەمین بە رێگایەکی سروشتی و پێکهێنانی ڕووباری قەبارە هەمە چەشن . دانیشتوانی دەوروبەری کانی یەکان سەرنجی گەشەکردنی ئەم کانی یانەیان ئەدا بێ ئەوەی لە نەژادی بوونی ئەم کانی یانە یان شتێك دەربارەی هایدروجیۆلۆجی ئەم کانی یانە بزانن . خوێندنی زانستی یانەی کانی یەکان لە سەردەمی تازەوە دەستی پێ کردو پۆلێنیش (تصنیف) ئەوەستێتە سەر چەند سیفەتێکی دیاری کراو . چەند رێگایەك هەیە بۆ پۆلێنی کانی یەکان بۆ نموونە : ـ بە گوێرەی بوونی خوێ تواوەکانی ناو ئاو پۆلێن ئەکرێ بۆ کانی ئاوی سازگارو کانی ئاوی کانەکان یان (کانی دەرماناو) ( mineral water springs ) . بەلام بەگوێرەی پلەی گەرمی ئاو پۆلێن ئەکرێ بۆ کانی یە گەرمەکان و کانی یە ناگەرمەکان ( nonthermal springs ) و بە گوێرەی بەردەوامیان پۆلێن ئەکرێن بۆ کانی یە هەمیشەیی یەکان کە بەدرێژایی سال ئەمێنێتەوەو کانی یە پچراوەکان کە هەمیشە بەردەوام نی یەو ئەپچڕێ و ئەگەڕێتەوە بۆ کانی یە وەرزی یەکان بێجگە لەمانەش پۆلێنی تریشی هەیە .

کانی ئاوەکانی عیراق بە ژمارە زۆرن و لەسەدەها بەلکو لە هەزارەهاش زیاترن و بەسەر هەموو لایەکی وولات دابەش کراون بەلام بەشێوەیەکی سەرەکی لەناوچە شاخاوی یەکان و کەنار گردەکاندا هەن و هەروەها بە ژمارەیەکی کەم لە نزیك لای تەنیشتە رۆژهەلاتی ناوچە شاخاوی یەکان و تەنیشتە ڕۆژهەلاتی بیابانی رۆژ ئاواو هەروەها بە تەریبی بە درێژایی ڕووباری فوڕات دوا کۆمەلەی کانی یەکان ئەکشێتەوە بە بارستایی باکووری رۆژئاواو باشووری رۆژهەلات کە رێك ئەکەوێ لەگەل بارستایی گشتی ( faults ) ەکان لە عیراقدا پاشان بارستایی یەکەی تەریبی ئەبێ لەگەل ، تەوەری حەوزی میزۆپۆتامیا درێژی ئەم زنجیرە کانی یانە نزیکەی (500 کم) دەبێ کە لە باکووری رۆژئاوا لە نزیك « هیت » ەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ڕۆژهەلاتی شاری (ناصرية) لە باشووری رۆژئاواوە ( وێنەی ژمارە ــ 1 ــ ) .

بە شێوەیەکی گشتی کانی یەکانی عیراق دابەش دەکرێن بۆ کانی ئاوی سازگارو کانی ئاوە کانەکان ئاوی کانی یە سازگارەکان بە کاردەهێنرێ بۆ خواردنەوەو ئیش و کاری ناومال بەلام ئەگەر هاتوو ئاوەکە زۆربێ بۆ ئاودێریش بەکاردەهێنرێ باشترین نموونەش کانی سەرچنارە کە هەندێك لە پێویستی شاری سولەیمانی پڕ ئەکاتەوە وەکو پێویستی یەکانی ناو مال و ئاودێری باخچەو بێستانەکان نموونەی تریش بۆ ئەم جۆرە کانی یانە وەك کانی یەکانی سنجار ، سۆلاف ، سوارەتووکە ، کانی ماسی ، شەقلاوە ، بێخال ، جندیان ، حاجی هۆمەران و هەروەها کانی یەکانی گوێزان و کانی دۆشیکان کە دەکەونە بەشی رۆژهەلاتی شاری مەندەلی ... بەلام کانی یەکانی جۆری

## كانى‌يەكانى عيراق و سيفەتى جيۆلۆجى‌و سوودیان




THE LOCATIONS OF THE SPRINGS MENTIONED IN THE TEXT

Fig. 1

1 — كانى ماسى
2 — سوڵاڤ
3 — سەرسەنگ
4 — سوارەتووكە
5 — سنجار
6 — عين كبريت
7 — حمام العليل
8 — شقلاوة
9 — بێخال
10 — جنديان
11 — حاجى عمران
12 — سرچنار
13 — پێنجوين
14 — گوێزان
15 — دوشيگە
16 — هيت
17 — جبة
18 — رحالية
19 — شثاثة
20 — عين ربة
21 — عويد
22 — عين سعدون

دووەم كە كانی ئاوەكانەكانە ژمارەیـان كەمـە لە رووبەرێكی فراواندا ئەمەش كانی یەكانی ( حمام العليل ، عين كبـريت ، گەرماوی ، شثاثه (عين تـر) ، الرحالية ، عوميد ، عين سيد ، عين سعدون ) ئەگرێتەوەو هەندێكیان لەبەر سیفەتی كیمیاوی یان بەكار دەهێنرێن بۆ چارەسەركردنی هەندێ نەخۆشی پێست یان نەخۆشی یەكانی جومگە واتە (روماتيزم) .

ئەم كانی یـانە شـايانی ئـەوەن كە دەزگـاكانی میـری بەتەنگیانەوەبن لەبەر ئەو راستی یەی كە ئەم كانی یانە سیفەتی كیمیاوی دیاری كراویان هەیە گەر لێیان بكـۆلرێتەوە وپـولێن بكرێن ئەوە وەك سەرچاوەیەكی سروشتی ( مـورد طبيعي ) گـرنـگ بـۆ تـەنـدروستی و پێشكـەوتنی وولات سـوودیـان لێوەردەگیرێ .

● **كانی یەكانی حمام العليل یا ( كانی یە گەرمەكان ) :**

ئەم كانی یانە ئەكەونە باشووری موصل بە (26 كم) كە لە بەشی رۆژئاوای رووباری دجلە لەچەند بار ستایی یەكی جیاواز هەڵئەقوولێن و لەكاتی لافاودا زۆربەی ئەم كانی یانە نقوومی ژێر ئاوی رووباری دجلە ئەبن پلەی گەرمی ئاوی ئەم كانی یانە بە رێژەیەك بەرزە ( لە نێوان 35 وە تا 50 س° ) هەر لەبەر ئەم هۆیە نـاونراون بـە كانی یـە گەرمـەكـان وەگـازی هـایـدروجـین و سولفایدیش ($H_2S$) لە ئاوەكە بەرز ئەبێتەوە كە لە ماوەیەكی دوور هەستی پێ ئەكرێ . قیری لاستیكیش لەگەڵ ئاوەكە هەڵئەقوڵێ و ئەگاتە سەر رووی زەوی سولفەر لەسەر دیوارو بنكەی جۆگە ئاوەكانیش بابەتێك وەیا توخمێك دەنیشێتـەوە كە پێی دەڵێن « سولفەر » ، قوری دەوروبەری ئەم كانی یەش بە كاردەهێنرێ بۆ چارەسەركردنی نەخۆشی و ئازاری جومگەكان (روماتيزم ) .

**باری جیولوجی ئەو ناوچەیە :**

كانی یەكان لە ( allusium ) ەوە هەڵئەقوولێن كە قوروليتەی دەوروبەری رووباری دجلە پێكـدێنێ و ( allusim ) ئەو بـەردانە ئـەپـۆشێ كـە تـەمـەنـیـان ئـەگـەرێتـەوە بـۆ ( lower miocene ) بەشێوەیـەكی سەرەكی لە ( gypsum ) ئـەنوێنێ ، كـەتەمـەنی بەردەكانی حمام العليل لە نێوان ( lower miocene ) وە ( Becer t ) ە هەرچەندە كانی یـەكان لە چینـەكانی ( allusium ) ەوە بـە دیار ئەكەون بەلام لە بنچینەوە ئەگەرێنەوە بۆ ئـەو بەردانـەی كە ئەكەونە ژێر بەردەكانی كەتەمەنیان ( lower miocene ) ەولەوانەیە كۆنتریش بێ . كانی یە گەرمەكان لەو ( pault ) انە هەڵئەقوڵێن كە لە بەردەكانی lowermiocene دان وەچینەكانی lower Fars لە (حمـام العليل) لە limestone پێكدێ كە ئەستـووری (5.5 m) ەو دوایی چینی anhydrite كە (6ocm.) ەو ئینجا silty cloystone ( 25 cm. ) پاشان چینی limestone كە ئەستووری ( 120 cm. ) ەو بەردەكانی چینی lower fars بە شێوەیەكی ئاسۆیی یە ( طبقات افقية ) .

چینی ( allusium ) لە قومو خۆڵی زیخاوی و خۆڵی قوماوی و marl كە ( ئەمەیش جۆرێكە لە خۆڵ ) ، پێكهاتووە لە بەربوونی كانی یەكان لەسەر شێـوە هێڵێكی راست ئەمـەمان بـۆ روون دەبێتەوە كە (yault) هەیە لە بەردەكانی چینی ژێر چینی ( allusium ) ئـەمـەی دواییش ( واتـە allusium ) بـۆشـایی هـەیـە لە نێـو بەردەكانی و رێگا بە تێپەربوونی ئاوە گەرمەكە دەدات بۆ ئەوەی بە رێرەوێك سەر بكەوێتە سەر رووی زەمین بۆیەش كانی یەكان لەسەر هێڵێكی تەواو راستدا نین .

● **سیفەت و سوودیان :**

ئەم كانی یانە لەبەر گەرمی لە دێرزەمانەوە بەكار هێنراوە بۆ خۆشووشتن و بۆ چارەسەركـردنی نەخـۆشی دیاری كـراو ، هایدروجین و سەلفاید لە ناو ئاوی ئەم كانی یانەدا هەیە بوونی سولفەر لەناو ئاوەكە یارمەتی چارەسەركردنی نەخۆشی یەكانی پێست دەدا .

ئەوانەی كە بۆ ئەم كانی یـە رۆیشتوون دیـویانـە كەوا كاریگەری ئەو قیرەی كە لەگەڵ ئاوەكە هەڵئەقوڵێ وەك خاوێن كەرەوەیەكە . بێجگە لەمەش قیرەكە وەك ینیشت بەكاری دێنن جگە لە بەكارهێنانی ئاوی گەرمی ئەم كانی یانە بۆ خۆشووشتن نیشتووەكانی قوریش بەكاردێ بۆ داپۆشینی ئەو شوێنانـەی لەش كە تووشی نەخۆشی بووە بۆ مەبەستی چارەكردنی .

دەزگاكانی میری هەوڵی ئەوەیان داوە بۆ دروستكردنی گـەرماوی هـاوچەرخ لەسـەر ئەم كـانیاوانـە هـەروەك ئـەو گەرماوانەی كە لە دەوڵەتە پێش كەوتووەكاندا هەیە بۆ ئەوەی زیاتر سوود لەو كانی یانە وەربگیرێ .

● **كانی یەكانی عين كبريت :**

ئەمەش بریتی یە لە كانە كانی یەكان ( mineral springs ) كە لەشـاری مـوصـل دایـە ، ئـاوی ئـەم كـانی یـانـە لە خـوار بەرزایی یەكان بە دیار ئەكەوێ و كە ناری رۆژئاوای رووباری دجلە پێكدێنن ، لەسەر رووی بەرزایی یەكانیش ئاوە كانەكان

بەرەنگی زەردو سەوز بەرووی رووبارەوە بەدیار ئەکەوێو ئاوی رووبارەکەش بۆ ماوەیەك رەنگاو رەنگ ئەکا . ئەم کانییانە لە ئاستێکی جیاواز دان هەندێکیان لە خوار رووبارەوەن جا کە ئاستی ئاوی رووبار بەرز ئەبێتەوە لە زستانو بەهاردا زوربەی یاخود گشتی ئەم کانییانە ئەکەونە ژێر ئاوەوە تا ماوەیەك هەر لەبەر ئەم هۆیەیە ژمارەیەك لە کانییەکان نەزانراون لەبەر بوونیان لەژێر ئاوەوە .

**جیولۆجی ئەو ناوچەیە :**

کانە ئاوەکانی عەینکبریت لەبەردەکانی lower fars کە تەمەنی ( miocene ) ە بەرز ئەبێتەوە کە ئەمەش بریتییە لە چینەکانی ( limestone ) و ( shale ) یەك لە دوای یەك تا سەر رووی زەمین . ئاوی کانییەکان لە ( yaults ) ە کانەوە هەڵئەقوڵێ و ئەگاتە سەر رووی زەمین .

**● سیفەتو سوودیان :**

ئاوەکانەکانی ئەم کانییانە جیاوازیان هەیە لە گەڵ کانییەکانی (حمام العليل) لە بارەی پلەی گەرمیو بوونی قیری ناو ئاوەکە پلەی گەرمی ئاوەکە لە نێوان (23 28 سْ ) یە ئەمەش بەرزترە لە ریژەی پلەی گەرمی ئاوی ژێر زەمین کە 20 سْ بەلام ئاوی ئەم کانییانە هەروەکو ئاوی کانییەکانی (حمام العليل) گازی هایدروجین سەلفایدی تێدایە ئەم گازەش هەستی پێ ئەکرێ لە دووری زیاتر لە 1 کم . هەر لە زووەوە سوود لە ئاوی ئەم کانییانە وەرگیراوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پێست ، لەبەر ناهەمواری شوێنی ئەم کانییانە کە لە رۆخ بەرزاییەکانو نزیك رووبارەوەیە خانووی شیاوی بۆ دروستنەکراوە تەنها دوو حەوزی نیوە بازنەیی نەبێ کە دروستکراوە .

**کانییەکانی (شثاثە) یان (عين تمر) :**

ئەم کانییانە ئەکەونە « شثاثة » یان ( عين تمر ) کە لە بەشی رۆژهەلاتی بیابانی رۆژئاوا دایە کە 65 کم لە شاری کەربەلا دوورەو ژمارەیەکی زۆر کانی لێیەو لە 150 کانی زیاترە ، لەنێوان کانی بچووكو کانی گەورەدان کە چەند هەزارێك گاڵون ئاو دەردەکەن لە خولەکێکدا ئەمەش بۆ ئاو دێری گەلێ میوەو دارخورماو دەغڵ گەنمو جۆ بەکاردەهێنرێو مێرگێکی جوانی لێیە کە ژمارەی دانیشتوانی لە 7000 کەس پترە ..

**● باری جیۆلۆجی ئەو ناوچەیە :**

کانییەکان لە ( allusium ) ە وە هەڵئەقوڵێن کە بەتەواوی زەوی (شثاثە) ی پۆشیوە لە ژێر allusium چینەکانی lower miocene هەیە کە لە ( Euphrates limestone , marl , shale , limestone ) پێکهاتوون . کانییەکان لە (yaults) ە کانی ( Euphrates limestone ) ە وە هەڵئەقوڵێنە ئەم (yault) انەش تەریبین بۆ تەوەری حەوزی رووبارەکانو رێرەویشیان لە گەڵ رێرەوی گشتی (pault) ە کانی عیراقە دوایی بەناو بەردە یەکنەگرتووەکانی allusium ئەگەنە سەر رووی زەمین . کانییەکانی ( شثاثە) ئەڵقەیەکی زنجیرە کانییەك پێکدێنن کە لە (هيت) و لە باکووری رۆژ ئاوا دەست پێدەکات تا رۆژ ئاوای (ناصريه) لە باشووری رۆژهەلات .

چینەکانی (شثاثە) بە شێوەیەکی گشتی لە شێوەی ئاسۆیی دایە ، بنچینەی ( یان نەژادی ) کانییەکانیش لە چینەکانی (Euph lst) ە نزیك باکووری (هيت) بە دیار ئەکەوێ کە رووبەرێکی گەورەی پۆشیوە . بنچینەی ئەم کانییانەش لەو راستییە روون ئەبێتەوە کەوا رووباری فورات بەسەر ئەو بەردانە تێ ئەپەرێ ئاوی رووبارەکە بە رێگایەکی راستەوخۆ بەناو درزو کونو جۆگەکاندا ئەچێتە ژێر زەوی یانیش بە رێگایەکی ناراستەو خۆ بەهۆی دلۆپاندنو ( percolation ) بە ناو نیشتووەکانی سەر زەویدا ئەچێتە ژێر زەمینو ئەگەر هاتوو ئەو ئاوەی کە چووە ژێرزەمین گەیشتە سەر رووی زەمین لە خوار رووبارەوە بە هۆی پالەپەستۆی هایدروستاتیکی ( ئەم پالە پەستۆیەش دروستدەبێ لە ئەنجامی جیاوازی ئاستی ئاو لەو ناوچەیەی کە ئاوەکەی بۆ دێو ئەو ناوچەیەی کە ئاوەکە هەڵ ئەمژێ ) ( intake area ) ( discharge area ) بەم جۆرە نەژادی ئەو کانییانە روون ئەبێتەوە لەوانەشە بیابانی رۆژئاوا کە زەوییەکی گەورە پێکدێنێ سەرچاوەیەکی تری ئاوی ئەم کانییانەبێ . کانییەکان لە سەر رووی زەمینەوە بەدیار ئەکەون بە هۆی بەرزبوونەوەی بەرزترین ئاستی ئاوی ژێر زەمین بۆ نزمترین ئاستی ناوچەی کانییەکان لەوانەشە ئاوی ژێرزەمینی بیابانەکان پەیوەندی هەبێ لەگەڵ رووباری فوراتو هەردووکیان ببنە سەرچاوەیەکی ئاوی ئەو ریزە کانییەی کە لەسەرەوە باسمانکردن .

**● سیفەتو سوودی ئەم کانییانە :**

ئاوی ئەم کانی‌یانە هایدروجین سەلفایدی تێدایە کە لە دوورەوە هەستی پێ ئەکرێ پلەی گەرمیشی لە نێوان (23 وە 25 س°) دایە ڕەنگیشی شینە بۆیە کانی‌یەکیان ناونراوە بە کانی شین . ئەم ئاوەش سوودی لێ وەرئەگیرێ بۆ ئیش‌وکاری ناو ماڵو هەروەها بۆ مەڕو ماڵاتو ئاودێری بێجگە لەمانەش بۆ چارەسەرکردنی پزیشکی بەلام بەشێوەیەکی زۆر تەسك بەکاردەهێنرێ . جگە لە سیفەتی پزیشکی ئەم کانی‌یانە سەرنجی ئەو خەڵکە ڕائەکێشن کە بۆ بینینی (قصر الاخیضر) ئەچن کە نزیکی ئەم کانی‌یانەیە لە بەر گەلێ هۆی‌تر ئەم شوێنە بووە بە شوێنێکی سەرنج ڕاکێشەر .

● سەرئەنجام conclusion

لەو باسەی سەرەوە بۆمان دەر ئەکەوێ کە کانی‌یە گەرمەکانو کانە کانی یەکان لە عیراقدا هەن‌و کانی بە ناوبانگی تریش هەیە لە جیهاندا لە سیفەتدا لەم کانی‌یانە بچی ئەوەی شایانی باسە کانی‌یەکانی وولاتەکەمان پشت گوێ خراون‌و هەرچەندە زۆربەشیان ناسراون . ئەم کانی‌یانەی وولاتەکەمان بۆ چارەکردنی نەخۆشی‌یەکانی پێستو نەخۆشی تر بەکار هێنراون وەك ئەوانەی کە لە (الحما) دا هەیە لە سووریاو کانی‌یەکانی (مولای یعقوب) لە مەغریب و (بادن‌بادن) لە ئەڵمانیاو (بادن) و (leukerbad) لەسویدو (بورصة) لە ترکیاو (karlsbad) لە چیکۆسلۆڤاکیاو ئەو کانی‌یانەشی کە بۆ مەبەستی خواردنەوە بەکاردێ وەك (عین السیها) لە لوبنانو (sidi Harzim) لە مەغریب و (vichy) لە فەرەنساو (Eptinger) لە سویدو (wiesbaden and Baden weiler) لە ئەڵمانیا . ئەوەی شایانی باسە پێویستە تۆژینەوەیەکی گشتی هەموو ئەو کانی‌یانە بکرێ لەگەڵ خوێندنەوەیەکی زانستی‌یانە چونکە گەلێ کانی تر هەیە کە گەلێ سیفەتی دیاری‌کراوی بە کەڵکی تێدا هەیەو بەلام زانیاری‌مان زۆر کەمە دەربارەیان وەك ئەو کانی‌یانەی کە لە حاجی ئۆمەران و ئامێدیو ئەوانەی کە نزیك (سۆلاف) ن کاریگەرێکی باشیان هەیە لەسەر گیروگرفتەکانی گورچیلەو جومگەکانو ئاسانی هەرس‌کردن . دانیشتوانی ئەم ناوچانە بەو ئاوە ئەڵێن ئاوی سووك (light) چونکە یارمەتی هەرس‌کردنی خواردن ئەداو خەڵکی تریش ئەڵێن ئەم کانی‌یانە وەك یارمەتی دەرێکن بۆ ڕزگاربوون لەو بەردانەی کە لە گورچیلەدا ئەبن‌و دڵنیان لەوە کە ئاوی ئەم کانی‌یانە بەردەکانی گورچیلە ئەتاوێنێتەوە .

کانی‌یەکانی (حمام العلیل) ئەبێ بە شێوەیەکی فراوانتر سوودی لێ‌وەربگیرێ ئەمیش بەهۆی دابین‌کردنی ئامێری هاوچەرخ‌و دروست‌کردنی دەزگاو شوێنی تایبەتی‌و دەبێ لە ژێر چاودێری پزیشکی یەوە ئاوەکە بەکاربهێنرێ بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە :

1 — بۆ خواردنەوە .
2 — بۆ ڕشاندنی دەم‌و گەروو .
3 — بۆ خۆشووشتن .
4 — بەکارهێنانی نیشتووە قوڕەکانی لە ڕێگەی داپۆشینی ئەو بەشەی لەش کە تووشی نەخۆشی بووە .

ئەو کانەکانی یانەی کە لە وولاتەکانی تردا هەن بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر بەکارهێنراون . گەر هاتوو بەراوردیان بکەین لەگەڵ وولاتەکەماندا . ئەو کانی‌یانەش کە زۆر بەکەمی هایدروجین سولفایدی تێدایە لەو کانی‌یانەی وولاتەکەمان بە گەلی ڕێگای جیاوازو مەبەستی جیاواز سوودی لێ وەرگیراوە .

پێویستە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەیەکی زانستی‌یانە بکرێ بۆ زانینی سیفەت‌و سوودەکانی تری ئەم کانی‌یانەو دۆزینەوەی کانی‌یەکانی ترو گەشەپێدانی پیشەسازی لە دەوروبەری ئەم کانی‌یانەو لە حاڵەتی‌تردا ئەتوانرێ شووشە پڕ بکرێ بە ئاوی ئەم کانی‌یانەو بنێردرێ بۆ دەرەوەی وولاتو بفرۆشرێ هەروەك لوبنان کە ملیۆنەها دینارێ بۆ ئەگەڕێتەوە لە پڕکردنەوەی شووشەکان بە کانەئاوەکان . کانی‌یەکانی عیراقیش شیاوی ئەوەن کە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەیان لەبارەوە بکرێ .

سەرچاوەکان :

1 — مؤسسه البحث العلمی / معهد بحوث الموارد الطبیعیة
2 — الحلقة العلمیة فی المیاه الجوفیة 10 — 15 آذار 1973 الدکتور عباس احسان البغدادی ـ کلیة العلوم ـ جامعة بغداد .
3 — water springs in Irag their geological characteristes and utilization .
ینابیع المیاه فی العراق ، جیولوجیتها وخصائصها .

# ئامێدی و

## کاروانێ رۆشەنبیری‌یا کوردی

**پێش گوتن : ـ**

**ئەگەر ئەم پ دیرۆکو تورێ جیهانی دابچین خارێ دێ بینین هەر ملەتەکی دیرۆك و تورێ خوییی هەی ، ڤێجا ئەگەر ئەڤ ملەت سەربەست بیت ئان بن دەستو بێخودان بیت وەك ملەتێ کورد یێ کو گەلەك جارا کەتیەبن بارێ خەموژانو رۆژا رۆهن لێتاری بوی . ملەتێ کورد مینا هەمی ملەتێت جیهانێ تورو ئەدەبێ خوییێ هەی ، یا بێگومانە ژهندەك ملەتا سەرکەفتی‌تر بوویە ، گەلەك مروڤا دەست‌دایە پێنوسێ خو ب ریڤەبەریا هندەك لایا کری‌یە ژ دیرۆك ، تورو ئەدەب ، کاروبارێت ژینا ملەتێ کورد ... نفیسی‌نە ملەتێ کورد خودان دیروکە ، تورو ئەدەبە ، هەرێکی ژلایێ خوڤە دەست ب بەلاڤکرنا رۆژنامەو گوڤارا کری‌یە ژ ریڤە بنەمالا بەدرخانی یا رۆژناما « کوردستان » ل سالا (1898) یێ ل وەلاتێ (مصر) ێ چاپ دکرو بەلاڤ کر[1] .**

پشتی شورەشا چاردەی تەمموزێ ل ئیراقێ سەیدایی هێژا و ئاشق وئەڤیندار ، دل سوتی و هناف کوزری ، گەرۆکێ لدویف تورو ئەدەبێ کرمانجی ، ستێرا گەشا گەلاڤێژا سپێدەهی‌یا ، خو گوریکەرێ پەیڤا کوردی ، یێ هەمی دەما چاڤێت وی ب پەرتوکافە کانێ چ لسەر تورو ئەدەبێ کوردی نفیسی‌یە ، یێ هەمی دەما قەلەمێ وی ددەست دا ، یێ تێنی یێ پەیڤێت کوردی ئەمر ( صادق بهاء الدینێ ئامێدی ) یە . دەست دا قەلەمێ خو و هندەك بابەتێت جوان وبنرخ پێش کێشی مە کرن ، بەلێ ئەو بابەت هندی بێژی ب نرخ بون چنکی ئەو نەراستی و لەنگی یێت د پەرتوکێت دی دا بو مە رۆهن وئاشکرا کرن .

یا مەدڤێت بێژین ئامێدی و کاروانێ رۆشەنبیری‌یا کوردی چەند خالەکێت هویرن ژ کورتە ژینە نیگارو بزاڤا وی دگەل پێداچونەکا سڤك دناڤ پەرتوکێت وی‌دا .

کورتە ژینە نیگارا « ئامێدی » : ـ[2]

لبهارا (1918) ێ دەهەیڤا گولانێ لی ئامێدیی ژدای بویە ، بنەمالا وان ل ئامێدیێ ب ناڤێ (مالا کوتا) کوتا زادە ناڤدارە . بابێ وی مروڤەکێ ژخو شەرمکری‌و بەرخوڤە بویە ل دویف هێزو ڤەژە ناخو کریاری و فروتن کری‌یە . مالا خو ب سەرفەرازی خودان کری‌یە . دژیێ چار سالیێ دا سەیدایێ ئامێدی دەست ب خاندنا قورئانێ کری‌یە لنك بابێ خو دژیێ هەشت خاندنگەها ئامێدیێ خاندنا سەرەتایی ل سالا (1932) ێ ب دویماهی ئینا .

ژبەر دەست کورتیێ نەشیایە بەردەوام بیت لسەر خاندنا خو ، کو دچیتە مویسلێ ، چنکی وی دەمی پارە بێ دڤیا ، ژبەر هەژاری و فەقیری‌یا خو هێلا ب ریڤە . پشتی سێ سالا بهردەوام بو ل سەر خاندنا خو ، ل سالا (1933) ێ داخازی ژ خەلکێ ئامێدیی هاتە کرن دگەل گوندێت رەخ و روی بو ڤەکرنا رێکا تومبێلا ل مابەینا گوندێ (بێبادێ) کو ژ (8 — 10) کلیومەترا ژ (سویلاڤ) ێ دویرە . ئێك بو ژوان کەسێت پشکداری کری دڤەکرنا رێکێ دا ، پشتی ب دویماهیك هاتی ئەو رێك ( مەلك فەیسەلێ ئێکێ ـ ملك فیصل الاول ) هات ورێك ڤەکر ، ئێکی ژ مروڤێت وی ـ ئامێدی ـ ، کو ( محمد سلیم عبدالعزیزی ـ مامێ سەیدا عصمت کتانی ) یە گوتێ عەریزەکێ بو مەلکی بنڤیسە و تێدا بێژێ خاندنگەهەکا ناڤنجی لئامێدیی ڤەکە بووان کەسێت خاندنا خوب دویماهیك دئینن . « دیارە ، ئەڤ داخازە ب جهـ نەهاتی یە ـ ڎ . ڎ . م » .

**ل سالا (1935) ێ دەست داخاندنا خو ل مویسلێ ل « ئامادەیا مویسل » ، پێنج سالا ، پاشی ب دویماهیك ئینایە و چویە بو (بەغدا) ل کولیژا ( دار المعلمین العالیة ) بەشێ « الاجتماع » . گەلەك هاتی و چویە دناڤ بەشێت کولیژێ دا هەتا بنە جهـ بوی ، کو سالا (1940 — 1941) ێ بو . پشتی ئەو ژی ب دویماهی ئیناى ، بو سەیدا ل (کەرکوکێ) و رۆژا (23 / 9 / 1944) ێ دەست ب دەرس گوتنێ کر ، سێ هەیڤا پاشی رۆژا (15 / 12 / 1944) ێ بو سەیدایی ناڤنجی یا ( هەلەبجە ) و حەفت سالا ما لوێرێ . پاش ڤە گوهازتە ناڤنجی یا (زاخو) و سالەکێ ژی لوێری . دویماهی یێ بەرێ وی دا ( هیت ) کو جهێ دەست پێکرنا وی بویە ژلایێ ئەدەبی ڤە هەر وەك وی ب خو گوتی . سالەکێ ژی لوێری و پاش**

ڤەگوهازتە (بەغدا) ل ناڤنجی‌یا «الرصافة» سێ سالا، ژ سالا (1956 – 1957 – 1958) ێ. (ئامێدی) ل بەغدا هەڤدە سالا کار کری‌یە. دەرس گوتینە، پێنج سالا ل وەزارەتا زانستی‌یێ (وزارە التربیة) درێڤەبەریا خاندنا کوردی. باشی بو ئەندامێ لیژنا زمانێ کوردی ل ئەکادیمیا ئیراقی، ئو ل زانینگەها بەغدا شەش سالا دەرس گوتینە.

«ئامێدی» وبزاڤ :-

(ئامێدی) گەلەك پشکداری یاکری دبابەتێت روشەنبیری وجڤاکی، یێ پشکدار بوی تێدا مینا (یانەی سەکەوتن ورادیوا کوردی) ژ سالا (1956) ێ هەتا چویە بەر دلوڤانیا خودی. گەلەك گوتار و بابەت لسەر تورو ئەدەبێ کوردی، زمان وکارو بارێت کوردی د روژنامەو گوڤارا، د رادیوێ دا بەلاڤکرینە، مینا( برایی، برایەتی، هاوکاری، روژی نوێ، بەیان، روشنبیری نوێ، گوڤارا چیا، نوسەرێ کورد، روژی کوردستان، دەفتەری کوردەواری، روناهی و گوڤارا ئەکادیمیا کوردی).

سەیدایی (ئامێدی) دەمێ لرێزا دوێ ناڤنجی ل مویسلێ روژنامەك ب دەست خو ئێخست ب ناڤێ «ژیان» دەمێ (ئامێدی) ئەڤ روژنامە خاندی چ تێ‌نەگەهشت، چنکی هێش چ‌تام ژ خاندنا کوردی نەدزانی. پشتی خاندی رابو کاغەزەك بو رێڤەبەرێ روژنامێ فرێکر ب زمانێ عەرەبی دا بەردەوام بگەهتێ، ئو دراڤێ وێ روژنامێ بو فرێ بکەن. بەلێ رێڤەبەرێ روژنامێ بو فرێکر بێ‌ی دراڤ و سوپاسیا (ئامێدی) کر. ل رێزا سێ‌یێ دەست ب نڤیسینا کوردی‌کر، سالا (1958) ێ پشتی شورەشا چاردەی تەمموزێ دەست دا قەلەمێ خو وهندەك بابەت بو رادیوا کوردی نڤیسان و هندەك ژی ژ ئنگلیزی کرنە کوردی. دڤی ژی‌یێ کورت دا «64» سالا دا گەلەك ژ بەرهەمێت خو هێلانیە دجهدا ونەگەهشتی یە هەمیا بەلاڤ کەت، چنکی هەر سالێ پەرتوکەك چاپ دکر ژبلی بابەتێت د روژنامەو گوڤارا دا بەلاڤ کرین، ئەڤە ناڤێ چەند پەرتوکێت (ئامێدی) نە کوهێش نەهاتینە چاپکرن و چێ دبیت ب دویماهیك نە ئینا بن، هەر چەندە بزاڤەکا مەزن کری‌یە بەلێ پا نەگەهشتی یە هیڤی و ئومێدا خو، ژوان پەرتوکا :-

1) - رێزمانا کرمانجی‌و سورانی یا هەڤبەرکری. (وەك من گولی بوی ئەڤ پەرتوکە یادچاپێ دا، ڤێجا چاڤێ مەژی یێ لرێ).
2) - دیروکا تورێ کلاسیکی یێ کوردی.
3) - چیروکێت کوردی.
4) - سەرهاتی بێت کوردی.
5) - بابەتێت ڤەگوهازتینە سەر زمانێ کوردی.

ئەگەر بێین وبەرێ خو بدەینە گوتارو بەرهەمێت وی گەلەك خزمەتەکا مەزن یاکری ژبو ملەتێ کورد ژلایی ئەدەبێ کوردی «کرمانجی». چنکی گەلەك بابەت دتاریی دا مابون ئێخستنە بەر روناهی‌یێ، هندەك بشکوژ گەش کرن وکرنە گولەکا گەش کو مروڤ ژێ تێر نەبیت مینا گولەکا تێر بێهن. ڤی مروڤی (ئامێدی) گەلەك بەرهەم رێز کرینە، یێ بەردەوام بو دبەلاڤکرنا پەرتوکێت خودا بگرە ژ سالا (1973) ێ هەتا روژا چویە بەردلو ڤانیا خودێ.

دڤی ژی‌یێ کورت بزاڤا مەزن یا کو چ جارا ناهێتە ژبیرکرن پەرتوکێت وی‌نە، بێت کو هەمی وەکی گەلاڤێژەکا گەش دئەسمانێ تورێ کوردی دا. (ئامێدی) گەلەك کورتە ژین لسەر هوزانا، هوزانڤانا، پەرتوکا نڤیسینە مینا: (مەم و زینا ئەحمەدێ خانی) یاکو ل هەڤلێرێ چاپ بوی، دیوانا ئەحمەدێ نالبەند - پارتا ئێکێ یاکو ل دهوکێ چاپ بوی، دیوانا بشکوژەك ژ باخچێت کوردستانێ - دانەر محمد امین ئاغا ئاکرەیی، لسالا (1971) ێ ل دهوکێ یا چاپکری.

بزاڤا (ئامێدی) گەلەکا بەردەوام بو ژ نڤیسینا ژینا هوزانڤانا، ساخ کرنا دیوانێت پر بها وسیهی، دوێ بزاڤێ دا گەلەك پەرتوك ئێخستینە بەر دەست کو مروڤ ب چ رێ‌یا ژێ تێر نابیت هندی بخوینییت. (ئامێدی) بو شەمالکا گەش دهەمی بەرپەرادا. ژوێ بزاڤا وی ئەڤە چەند پەرتوکێت چاپکرینە کو دێ پێدا چونەکا سڤك دناڤ دا کەین :-

1 - ئیدیەمێت کوردی :- ل چاپخانا «الشعب» سالا (1973) ێ کوری زانیاری کورد چاپکری یە. ئەڤ پەرتوکە ب تیپا (ئا) دەست پێ دکەت و ب تیپا (ح) دویماهی پێ دهێت دگەل دویڤەلانەکێ بکورتاهی. ژچەند پەرتوکا سودێ وەرگرتی بێت کوردی‌و عەرەبی وبیانی. تێدا دبێژیت ل بەرپەرێ -4- ئەڤ

نفشته یامن پێش كێشى ئەكادیمیا كوردى كرى چارەسەریەكا لایەكێ زمانێ كوردى دكەت كو زاراف ئو ئیدیەمن دڤێ پەرتوكێدا ئیدیەم یا نفێسى پاشى رافا وێ ل دویڤرا رامان ب زمانێ عەرەبى ، « 160 » بەرپەرە د گەل دویڤەلانێ . براستى ئەڤە پەرتوكەكا جوانو بنرخە ژلایێ زمانێ ڤە چنكى ئەگەر زمانى هن‌دەك كێماسى تێدا هەبن مروڤ نەشێت نەپى باخڤێت نەژى بنڤێسیت . ئەگەر زمان یێ لەنگ بیت كەس دداخازا مروڤى ناگەهیت هەر وەكى (ئامێدى) دبێژیت : زمان كلیلا سەربەستى و ئازادیا هەمى مللەتانە بێ جودایى ، شوینە وارو روشەنبیریا مللەتى بزمانێ وى تێتە پارازتن . هەروەسا مللەت ب زمانێ ماكێ تێنە نیاسین و خودان سەنگ وبهانە ، ( نوبهارا سەیدایێ مەزن بپ «22» ) ڤێجا ئەڤ كارێ پیروز جهێ ڤالا یێ پركرىو بزاڤا ئێكێیە ژلایێ (ئامێدى) ڤە .

**2 – ریزمانا كوردى** : ـ سالا (1976) یێ ب رونیوێ هاتیيە نڤێسین . ئەز چ ژڤێ پەرتوكێ نزانم چنكى من نەدیتىيە !! .

**3 – دیوانا مەلایێ جزیرى** : ـ سالا (1977) یێ چاپ بویە لچاپخانا ئەكادیمیا كوردى ، ئەڤ دیوانە گرنگترین دیوانە ژ دیوانێت هوزانڤانێت كورد چنكى «جزیرى» سەركێشێ هوزانا كلاسیكىیا كوردى یە . ڤێ دیوانێ هندەك هوزانێت تێدا هەین مروڤ ب چ رەنگا ژێ تێر نابیت .. هند سپىو جوانن هەر وەك وانا نینن . ئەڤ دیوانە وەك بورجەكێیە دناڤ مللەتێ كوردا دا . (ئامێدى) دبێژیت : مەلایێ جزیرى شوینەوارەكا ئێكجار سپەهىو رەنگین هەیە تو خو دبێژى دورەكە یا گەوهەرەكا ئێكانەیە چو نرخ ژبو ناهێتە دانانو بچو بهاژى ناهێتە كرین . ئەڤ دورەیا گەوهەرە دستڤانكەكێ مەرجان ، دورو مرارى یێت خومالى دایە ، یێت كوب شەهرەزایى و هوستایى ژێ هاتیە ڤەهاندن وئێخستنە بەریك مروڤى مەندەهوش و شاشمى دكەت ، ئەڤ بەرهەم یا هند اژ رەنگ ب سەنگ وقەشەنگ دیوانا ویيە . ( هوزانڤانێت كورد بپ « 17 » ) .

ئەڤ دیوانە « 639 » بەرپەرە ، بریتىيە ژ « 122 » هوزانان یێت ژهەمى جورە و رەنگێت هنەرێ هوزانان ب عەرەبىو فارسى دگریت ولسەر ئەبجەدیا عەرەبى ژبلى ئەبجەدیا عەرەبى ژبلى رەنگى (ع و غ) نە بن . هەمى دەنگێت دى دویماهى بمالك ئێنایە . ( هوزانڤا ـ نێت كورد / بپ « 172» ) .

**4 – دیوانا پەرتویێ هەكارى** : ـ ئەڤ دیوانە سالا (1978) یێ یا چاپكرى ل چاپخانا ( دار الحریة للطباعة ) ، ژ بەلاڤكرنا دەزگەها روشنبیرى و بەلاڤكرنا كوردىيە . ڤێ دیوانێ «175» هوزان یێت تێدا ژهەمى رەنگا ، دیوانەكا پر بهایە وییت وەكى وێ دكێمن ژبلى ( دیوانا جزیرى و مەم و زینا خانى ) . (ئامێدى) دبێژیت : دسەرێ سەدێ نازدێ دیوانەكا درستو ب سەروبەر ، شەنگ ، پر رەنگ و قەشەنگ لسەر رێزو رەوشتێت هوزانڤانێت كەڤن یێت بەرى خو نفیسىیە ، كو ژرێڤە ناڤێ خودێو پێغەمبەرا ئینایە وەكى هوزانڤانێت ژ خودێ ترس و سوڤى ، ئانكو هەلبەست پێ ڤەهاندىنە پاشى ب پێترین جورێت هوزانێ هەلبەست لدوى ئەلیف بێیا عەرەبى ولسەر زانستێ عەروزا عەرەبى وەكى دەریا درێژو كورت ، پێنج مالكى ، چار مالكى و جورێ بناڤێ « مستزاد » ب ناڤ دكەن هوزان ڤەهاندىيە / بپ « 14 – 15 » .

**5 – نوبهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدێ خانى** : ـ

ئەڤ پەرتوكە ژبەلاڤكرنا ئەكادیمیا كوردى يەل سالا (1979) یێ یا چاپكرى ل چاپخانا ئەكادیمىیێ . ئەڤ پەرتوكە فەرهەنگەكە ژبو زارووێت كورد ڤەهاندى یە ب زمانێ كوردى و عەرەبى ، « 95 » بەرپەرە . ئەڤ فەرهەنگە وەكى گەوهەرەكێ يە پرە ژ زانیارىیا . ئەحمەدێ خانى تێدا دبێژیت : ـ

**ژ پاش حەمدو صەلەوا تان**
**ئەڤ چەند كلیمەنە ژ لوغاتان**
**ڤێك ئێخستن ئەحمەدێ خانى**
**ناڤێ نووبار ژ بو بچوكان لێ دانى**
**نە ژبو صاحب رەوا جان**
**بەلكە ژبو بچوكێت كرمانجان . / بپ « 29 » .**

**6 – هوزانڤانێت كورد** : ـ ئەڤ پەرتوكە مینا ئەم هەمى دزانین یا پربهایە چنكى یاپێك هاتى ژ نوزدە هوزانڤانا یێت كلاسیكى ب ژین و شعر ڤە . ڤێ پەرتوكێ جهێ خو دناڤ هەمى دلا دا یێ كرى چنكى هەر هوزانڤانێ تە بڤێت یێ تێدا هەى بێى بچى ل سەروكانىیا بگەرىى . یا چاپ بوى لسالا (1980) یێ ، ژ 624 بەر پەرا پێك هاتى یە هەلبەت ژ بەلاڤكرن و چاپكرنا ئەكادیمیا كوردىيە . ئەو هەر نوزدە هوزانڤان ئەڤە : ـ 1 – عبدالصمد بابەك ، 2 – مەلایێ جزیرى ، 3 – فەقێ تەیران ، 4 – عەلى حەریرى ، 5 – مەلا مەنصورێ گێرگاشى ، 6 – خالد ئاغایێ

ـيارىٔ ، 7 — مەلا حوسێنىٔ باتــەى ، 8 — ئەحمــەدىٔ خانى ، ؛ — پەرتوىٖى هەكارى ، 10 — بەكر بــەگىٔ ئەرزى ، 11 — شێــخ ـورالدينىٔ بريفكى ، 12 — شێخ طاهاىٖى مائى ، 13 — حوسنى‌ىٖى ـامەرنى ، 14 — شێخ غياث الدينىٔ نەقشەبــەندى ، 15 — مــەلا ـەنوەرىٔ مائى ، 16 — طاهرىٔ شوشى ، 17 — ئەحمەدىٔ نالبەند ، ۲٠ — طاهرىٔ روشدى ، 19 — شێخ مەمدوحىٔ بريفكى .

**7 — خان‌و مان** : ـ ئەڤ پەرتوكە ســالا (1981) ىٔ يا چــاپكرى ـ چاپخانا حەوادث ژبەلاڤكرنا دەزگەها روشنبيرى و بەلاڤكرنا كوردى‌يە . ياپێك هاتى ژچەند سەرهاتى وچيروكێت زارڤەكرنىٔ كو هەمى يێت هاتينە وەرگرتن ژ گوتن‌و سەرهاتى يێت كوردى ، مينا شێرهەر شێرە چ ژنە چ مێرە ، داڤدوزيا بەقالا ، كەڤنە واز دگەل گەلەكێت دى . « 264 » بەرپەرە و پێنج بەشە . (ئامێدى) دبێژيت : سالا (1963) ىٔ من دەرس دگوتنە شــاگردێت پشكــا كوردى لكوليژا ليتراتوراىٖى ل زا نينگەها بەغدا ، ئەز پێ‌تڤى بوسابوم كو بدەمە شا گردێت خو دگەل هوزانا كو بخوينن‌و هوى زارىٔ كرمانجى ببن نەمازە شاگــردێت بزارىٔ سورانى دخوێند و ئاخڤتن . من دەست ب‌نڤيسينا چەند چيروكێت كورت كر كو ددەرسىٔ دا بخوينين و شروڤە بكەين و چەندىٔ ژىٔ ژبەر كەين ..... / خان ومان ـ بپ « 3 » .

**8 — مەولويدا مەلاىٖى باتــەىٖى** : ـ دگەل عــەقيدا ئيمــانىٔ يا ســەيداىٖى مــەزن ئەحمــەدىٔ خانى : ســالا (1982) ىٔ كــەتــە بەردەست . ئەڤ پەرتوكە بتنىٔ ژبەلاڤكرنا ( ئەمانەتا گشتى‌يا روشە نبيريــا لاوان ) ە . ئەڤــە ژى وەك يێت دى‌يا هــاتى يە تويژاندن ژ چەندا ژێدەرا . مەولويدا باتەىٖى ژ « 5 » ژێدەرا و عەقيدا خانى ژ « 7 » ژێدەرا . هەر چەندە سەيداىٖى (ئامێدى) ئەڤ پەرتوكا خو نەديت بەلى وى تاما وىٔ‌يا زانى ، ياماى دڤێت ئەم‌ژى تام كەينىٔ . مەولويد ژ بەرپەر « 3 » دەست پێ‌دكەت هەتا دگەهتە بەرپەرىٔ « 50 » ىٔ ، ئو عەقيدا خانى ژ بەرپەر « 55 » هەتا دگەهتە بەرپەرىٔ « 74 » ىٔ . دگەل پاشگوتنەكىٔ ، پەرتوك هەمى « 76 » بەرپەرە . (ئامێدى) بو مەولويدىٔ دبێژيت : ـ شــوينەوارا مــەلاىٖى باتــەىٖى يا ژهــەميا بنــاڤ‌و دەنگتر مەولويدا وى يە . ئەڤ مەولويدە جارا يەكىٔ لستامبولىٔ سالا 1917 — 1918 ىٔ چــاپ بــويــەو جــارا دووىٔ ل روژا 13 / 9 / 1966 لهەڤليرىٔ چاپ بويە ، بپ « 8 » .

ژبــو عەقيــدا ئيمانىٔ دبێــژيت : باوەرينــاما ئيمــانىٔ يا سەيداىٖى مەزن نەمر ئەحمەدىٔ خانى وەكى دوڕ ومرارى يێت دى‌يێت سەيداىٖى خانى‌نە . ئەڤ دوڕو مرارى يــەنە ئــەڤێت ژێرى‌نە : ـ

1) — مەم وزينا سپەهى‌و رەنگينە . ئەو ڤند وخەتيرا هەميانە .

2) — پاشى وىٔ ئەلماسا ئێكانە نوبهارە يا كو نەخريا فەرهەنگێت كوردانە .

3) — دوڕو مرارى و گەوهەرا سىٔ ژى باوەريناما سەيداىٖى مەزن نەمر ئەحمەدىٔ خانى‌يە . بى گــومانــە ئەڤ بــاوەرينامــە بريتى‌يە ژبيرو باوەڕێت سەيداىٖى خانى دەربارەى يەزدانىٔ يەكتا .. ، بپ « 55 — 56 » .

**9 — جــەلادەت بەدرخــان** : ـ ئەڤــە گوتــارەكە دگــوڤارا ئەكاديميا كوردى ، بەرگىٔ « 7 » سالا (1980) ىٔ يا دبەرپەڕ « 255 » هەتا كو دگەهتە بەرپەرىٔ « 286 » گوتار « 31 » بەر ـ پەرە . (ئامێدى) دبێژيت : نەمر جەلادەت بەدرخــان ژ هەلكەڤتى و ڤيهرسێت بىٔ بەڤل يێت مللەتىٔ كوردە دسەدىٔ بيستىٔ زاينى‌دا . نەمازە دبزاڤ و خەباتا خوڕت و دژوار ياكو وى دكر ژبو ڤەبراندنا نــەزانينىٔ ب‌ڕێكا بــەلاڤكرنــا زانينىٔ ، بپ « 255 » .

ئەڤەبو كورتە ژينە نيكارو بزاڤ وپێداچونەكا سڤك دناڤ پەرتوكێت ســەيداىٖى هێــژاو زيرەك‌و چــەلەنگ ، د تــورو روشەنبيرىٔ كوردى دا خودىٔ ژىٔ ڕازىٔ بىٔ نەمر [ صادق بهاء الدينىٔ ئامێدى ] كو روژا (16 — 6 — 1982) ىٔ چــويە بەر دلوڤانيا خودىٔ . ئــەڤجا هيڤى دكــەين ژخودانىٔ ڤىٔ جيهانا مەزن جهىٔ وى خوش كەت ژوىٔ بزاڤا بو مللەتىٔ خوكرى ب چەند پەرتوكا . هزار سلاڤ لسەر گوڕىٔ وى‌بن دگەل قەفتەكا نێــرگز وسيسنێت بێهن گــرتى . هەلبــەت خودىٔ ژىٔ ڕازى ستوينەكا مــەزنە دنــاڤ تورو ئــەدەبىٔ كرمانجى‌دا ، چجارا ئەڤ ستێرا مەزن ناچيتە ئاڤاو هەرا گەشە دئەسمانىٔ تورىٔ كوردى دا .

سەروكانى : ـ

1 [redacted] ، بپ 255 .

2 — كورتە ژينە نيگارا وى ياهاتيە وەرگرتن ژڤان هەر دوسەروكانيا : ـ

ا ـ بەيان ـ ژمارە 44 سالى 1977 ، بپ 38 .

ب ـ دەمىٔ چــاڤپێكــەفتن دگــەل هــاتيــەكــرن لســەر تلفــزيــونىٔ روژا (10 — 1 — 1982) ىٔ .

نووسینی · سەمیر کەرەم
حەمەشوان وەری گێڕاوە

# هەرەسهێنانی فەلسەفەی بەدبینی

ئەمڕۆ مێژووی ئادەمیزاد زۆر بە هەڵەداوان بەرەو پێش ئەچێ . وەختێ خۆی مرۆڤایەتی تالەچەرخی بەردەوە گواستیەوە بۆچەرخی بەکارهێنانی تەوری ئاسن ، دەیان سەدەی ویست . تا گەیشتە ئەوەیش بتوانێ یەکەمین ئالەتی دەستی دروست بکا چەندین سەدەی تریویست ، کەچی لە سەرەتای شۆڕشی پیشەسازیی یەکەمیەوە تا شۆڕشی ئێستای کە شۆڕشی زانستییانەی تەکنەلۆژیی یە تەنها دوو سەدساڵو بەڵکو لەوەیش کەمتر تێپەڕیوە .
بەلام هەر لەم چەرخەشدا کە ئاسۆیەکی ئەوەندە بەربڵاوو بەدەرەتانی پێشکەوتنی زانستیو شورشی کۆمەلایەتیو گەشەکردنی سیاسی هەمەسەرە بۆ ئادەمیزاد کراوەتەوە ، تائیستا وێنەی نەبوە . دیاردەیەکی سەیرو سەمەرەیش هاتووەتە ئاراوە وەك ئاوازێکی ناساز ، بەلام بە دەنگێکی ماتەماویی بەرزگوێی مرۆڤایەتی پێ ئەکوترێتەوەو مێشکی پێکاس ئەکرێ ، ئەڵێی دەنگی دێوانە ، دەنگێکی ئەوتۆیە لە هەموو فەرهەنگی زمانو واتای بیردا لە مەرگو نەفرینو نەبوونیو هیچو پووچیو بێئایەو مایەیی بەولاوە هیچی ترنازانێ .
لەهەر لا کەسیستێمی سەرمایەدار هێشتا بژیو فەرمانرەوابێ، لەگەڵ ئەو هەموو هێزە مایەیی یەو ئەو هەموودامو دەزگاو چەكو جبەخانەی بەسامی جەنگەیش کەهەیەتی ، هەستی بەدبینیو بەرچاوتاریکی هەموو سووچ وکونو کەلەبەرێکی ئەم سیستەمەی گرتووەتەوەو بە پانیو درێژیدا باڵی بەسەر ئایدیای ئەم سیستەمەدا کێشاوەو ، هەرچی رووەکانی هەیە هەر لەئەدەبەوە بیگرە تا ئەگاتە هونەرو فەلسەفەو رەوشتو سیاسەت ، هەمووی بەرەنگی خۆی بۆیەکردووە . بەرێگای ئەم ئایدیولوژیی یە بەدبینەشدا لەسەرانسەری ولاتانی رۆژئاوادا ، بەرادەیەکی فراوان بیروباوەری وابووە بەباو ، ئەلێ ژیان هیچ ماقوولێیەتێکی تیانیەو بوون شتێکی بێهوودەو هیچو پووچەو « خاوەن بیر » ە بەدبینەکان هێرشی شێتو هارانە ئەبەنە سەر هەربیرێ باوەری بەبەرەو پێش چوونی ئادەمیزادو بەتایبەتی بەگەشەکردنی کۆمەلایەتی هەبێ .

هەر بۆیەیش هەندێ فەیلەسووف وەك شۆپەنهاوەرو هارتمانو نیشتە بوون بە سەرچاوەی بیری ئەم رۆشنبیرە رووخاوانەی رۆژاوا ، چونکە ئەوانە بوون بوو بوون بەدەسەچێلەی فەلسەفەی بەدبینی مرۆڤایەتی نەویست . ئەوەتا شۆپەنهاوەر لەکتێبی « جیهان خواستو بیرە » یدا ، وەك لە هەموو کتێبەکانیتریدا ، هەموو شیوەیەکی رێبازی عەقڵیو گەش بینی داوەتە دواوەو جاریداوە کەوا هەرچی هیوای هێنانەدی شتی باشترە ـ لەمەی ئێستا هەیە ـ لەئاواتی بۆشو خەیاڵ پلاو بەولاوە نییەو ، خەڵکیشی بۆبیری ئەوەبانگ ئەکرد کەوا « راستوپێویست ئەوەیە ژیان ویستی پێشێل بکرێو تێك بشکێنرێ » . لەکوێدا شۆپەنهاوەر ئەیبرێتەوە ، لەوێوە هارتمان دەستپێ ئەکاو سەرەتاڵەکەی لەدەست وەرئەگرێو رەخنەلەوە ئەگرێ کە ناوی ئەنێ « سێشتە پڕو پووچەکە » کەبریتین لە توانای هێنانەدی بەختەوەری بەسەر رووی زەوییەوە ، پێشکەوتنی کۆمەلایەتی ، بەختەوەری لەو دنیادا .

هارتمان ئەڵێ : گەشەکردنی ناهۆشیاری لەبنەڕەتی جیهاندا بەڕووخانی جیهان ئەگاتە چلە پۆپەکەی‌و دوائامانجی گەشەکردنی جیهان ڕزگاربوونە لەئازار کەپێوەندێکی ناچاریی بەبوونەوە هەیە .

بەلام نیتشە ، ئەوە ڕادەی ئەو پەڕی دەست درێژیکەری‌و مرۆ نەویستی داوە بەدەماری بەدبینی‌یەکەی . هەر بۆیەش فەلسەفەکەی داکۆکی‌یە لە سەرپان کردنەوەی دروندانەی هێزە شۆڕشگێڕەکان‌و بەکارهێنانی هێز لە دژی جەماوەر .

**پێشبڕکە بەرەو لای مەرگ** :

ئەمرۆ ، ڕەنگەبێ لە هەرسەردەمێکی ڕابوردوو پتر ، سەدان‌و هەزاران نووسراوو وتارو کتێب بەسەر ئەم جیهانەدا ئەبارێ « هەموو ئەوە پیشان ئەدەن کە گوایە جیهان لە پێشبڕکەی مەرگدایە » و « جیهان تەرمی ئادەمیزاد بەرەو گۆڕستان بەڕێ ئەکا » . ئەوەتا زانایەکی سۆسیۆلۆجی ئەمریکایی ئەڵێ : « ئێمە ئێستا لە سەعات بیست‌و پێنجداین . سەعات بیست‌و پێنج دواسەعات نی‌یە ، سەعات یەکی پاش دواسەعاتە . شارستانەتی ڕۆژئاوا ئالەم کاتەدا بووەو ، ئەمەکاتی ئەوە »

« **جۆرجێو ، فیرجیل ، سەعات بیست‌و پێنج ، نیویورك ، 1950 ، لاپەرە 49** »

ئابەم جۆرە بەدبینانە لەجهان‌و لەژیان‌و لەمێژوو گەیشتن ، کتێبە فەلسەفی‌و سۆسۆلوجیەکانی ڕۆژئاوای گرتۆتەوە ، وەك بڵێی جیهان‌و ژیان‌و مێژوو زنجیرەیەك ڕووداوی تراژیدیایین ڕاستەکەشی ڕیشەی فەلسەفەی بەدبینی تەنانەت بەناخی کۆنترین فەلسەفەیشدا شۆڕبۆتەوە ، ئەو فەلسەفانەی کە نرخی بوونی (بەرچاو) ی دنیایی ئەوندە دێننە خوارەوو ئەیکەیەننە پلەیەکی زۆر نزم‌و مەرگ بەرزگاری لە ئازاری سەر زەوی دائەنێن‌و ، لە جیهانێکی‌کەی جیاوازی لە ژوور هەست‌و سروشتدا بەداوی ڕاستیدا ئەگەڕێن .

**فەلسەفەی سیستێمی داتەپیو** :ـ

لێکۆڵینەوەی مەوزووعی‌یانەی ئەم ڕووەی سەرنجی فەلسەفی ، دەری ئەخا کەوا بەدبینی‌و بەشان‌و باڵی مەرگدا هەڵدان ـ تێکڕا ـ لەوکاتانەدا ئەبێ بەباو کە سیستێمی ئابووری‌و سۆسیۆلۆجی گەیشتبێتە قۆناغی بەزین لە بەردەم سیستمێکی سۆسیۆلۆجی تری ڕێك‌و پێك‌ترو پێشکەوتووتردا لەبارەی مێژوویی‌یەوە . سیستێمی بەرەو ڕمان‌چوو وائەزانێ ڕووخانی خۆی ڕووخانی هەموو کۆمەڵ‌و هەموو شارستانەتی‌یە .

ئەوە بوو ڕووخانی سیستمی کۆیلەیی کون بوو بە هۆی پەیدابوونی دەمارێکی زۆر قوڵی بەدبینی لە ئایدیۆلۆژیی کۆمەڵگای کۆیلەییدا . خاوەن بیرەکانی ئەو چەرخە لایان وابوو جیهان شەوق‌و واتای ئەقڵیی خۆی لەکیس چووەو تەنانەت مافی مانەوەشی نەماوە . نیشانەی ئەمە ئەوقسەیەی فەیلەسووفی ڕەواقی ئەمپەراتۆر مارکۆس ئۆریلیوسە کە ئەڵێ : مرۆڤایەتی هەمووی دوکەڵە .. مرۆڤایەتی سەرانسەری هیچ‌نیە .

هەمان شت لە ئایدیۆلۆژیی دەرەبەگییش ڕوو ئەداتەوە لەقۆناغی ڕووخانیدا . هەر کە دەرەبەگی لە سەرەنجامی مێژوویی خۆی‌نزیك ئەبێتەوە ، ئەبینێ خاوەن بیرەکانی دەستیان داوەتە پێش بینی بەدبینانە لە بارەی دوا ڕۆژی ئادەمیزادەوەو بەزەوی ئەڵێن ئەمە ماوەیەکی وەختی‌یە بەسەر ڕێگاوەیە بەرەو جیهانێکی تری پیرۆزو مەترسی دوا لێپرسینەوە ئەخەنە دڵی خەڵکەوە .

لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بەم سەرەنجام‌و دوا لێپرسینەوەیە ، هەرگیز ڕێی لەچینی حوکمرانی دەرەبەگ نەگرت ، تا بینەقاقەیان بە ناخی ژیانی ئەم جیهانەدا بچنە خوارەوەو لەزەت لە سووکترین جۆری ڕابواردن وەربگرن . دروشمی ئەو ڕۆژەی ئەمانە ئەوەبوو : بائێمە خۆمان بەئارەزووی خۆمان ڕابوێرین ، خوام کرد دوای ئێمە جیهان لافاو ئەیبرد ، کفن بەخۆم ببڕێ .. مردوو گۆڕ بەگۆڕ .. چینی پادشاو شازادەکانی فەرەنسە بەر لەڕوودانی شۆڕشی فەرەنسە بەماوەیەکی کەم لەناو دەرباری فەرەنسەدا ئەمەیان دەگوت‌و دەگوتەوە .

ئەو دەمە دەرەبەگیش هەر مەترسی‌یەك بهاتایەتە ڕێی خۆی وای‌لێك ئەدایەوە کەوا مەترسیەکی کوشندەیە بۆگیانی هەموو شارستانەتی . بۆیە بوو لەو سەردەمەدا « فەلسەفەو بیرو باوەڕی حەشر » بڵاو بوەوەو فەیلەسوفەکانی پاشایەتی فەرەنسە وەك جۆزیف ماری دی میسترو لویس گابریل ، ئەمپرواز دی بونال ، گواستنەوەیان لە پەیوەندی کۆمەلایەتی دەرەبەگی‌یەوە بۆ پەیوەندی کۆمەلایەتی بورژوازی بە مەترسی‌یەکی کوشندەی شارستانەتی‌و بەردەوام بوونی بەرەی ئادەمیزاد ئەدایە قەڵەم . لەهەمان کاتا ئەو خاوەن بیرانەی سیستێمی نوێ‌یان ئەخستە ڕوو ، بیرو باوەڕی تەواو پێچەوانەی ئەوبیرو باوەڕانەیان بڵاو ئەکردەوەو ، لەگەڵ پەیدابوون‌و بەرز بوونەوەی سیستێمی سەرمایەداری‌دا باسی

« پێشکەوتن » و « خۆش گوزەرانی هەمیشەیی » یان ئەکرد . ئەوە بوو خاوەن بیری فەرەنسەیی جان ئەنتوان کۆمدرۆسێ ، وتارێکی نوسی ئەوەی تیا ئیسپات بکا کە بلیمەتی خەلقکەرانەی ئادەمیزاد بێ رادەو سنوورەو ئەیوت : « بەراستی دەسەلاتی ئادەمیزاد بۆ رۆژلەدوای رۆژ باشتر کردن لە هیچ رادەو سنورێکدا ناوەستێو بەرەو پێش چوونی ئەم دەسەلاتە بەتەواوی لەبەندی هەموو ئەو هێزانە ئازادە کە لەوانە بێ بیانەوێ لەرادەیەکدا رایگرن »

### وجوودی یەکان دلسۆزترین بەدبینن

لەم چەرخەدا وجوودیەتی دلسۆزترینی ئەوانەیە « گەشە » یان بە فەلسەفەی بەد بینی داوەو گەیاندوویانەتە رادەی ئەو پەڕی ، چ وجوودی یە باوەر بەخوادارەکان و چ بێ باوەرەکانیان ، چونکە مەیدانی ئەوەنیە بووترێ کەوا بیرۆکەی « تاوان » تاقە سەرچاوەی دەماری بەدبینی یە لای وجوودی یەکان . کارل یاسپەرز ئەلێ : ئادەمیزاد لەرووی چوار « هەلوێستی سەرەکی » دا وەستاوە لەجیهاناو نە ئەتوانێ بیان گۆرێو نەئەتوانێ خۆیان لێ لاداو گوێیان نەداتێ ، ئەوانەش « مەرگ » و « ئازار » و « تاوان » ن . بەلای یاسپەرزەوە مەرگ ئەوشتەیە موركی نیسبی یەت بەهەموو شتێکەوە ئەنێ ، لەبەرئەوە ئەبێ ، وەك ئەو پەر ئامانجی هەموو بوونێکی تاقی کەرەوانە وەری گرین و پێی قایل بین ، یان بەو پێ یە کە ناکرێ ژیانمان بێ برانەوە هەر درێژە بکێشێ و بەردەوام بی . ئەلەوانەیە لە راستەقینەیی بوونی خۆم گەیشتنم ئەوەم بۆ دابین بکا وام بخاتە روو کەوا ژیانم تێکەڵ لە بەختەوەریو کلۆلی یەو پێویستە هەمیشە لەنیوان ئەم دوو تەوەرەدا هەلس و کەوتمان بێ .

هەمیشە من جاروبار خۆم لەنێوان دوو حالەتدا بەگیرخواردوو ئەبینم حالەتی ویستن کە بەگوێرەی ئەو حالەتە جەزلە قووبوول کردنی ئازار ئەکەمو حالەتی بێ هێزی کە بەگوێرەی ئەمیش ئەتوانم بەدلسۆزی یەکی تەواوەوە ئازارەکە قووبوول بکەم . گابرێل مارسێلی وجوودیی مەسیحی یش ئەلێ : من دلنیام کەوا ئێمە خەریکە لەدوا دواییی مێژوو نزیك ئەبینەوە . زۆر رێی تێ ئەچێ زۆرمان ئەو دوایی یە مێژوویی یە ببینن کە سروشتی خوا باسی ئەکا . ( مارسێل : خەلك لەدژی مرۆڤایەتی . ل 161 ) .

هەروەهائەلێ : « ئەمە کەلەوانەیە وادەرکەوێ کە ژیانم ژیانێکی بێ واتایە ، بەشێکە لەقەوارەی ژیانم و لێی جودا نابێتەوە ، لە جیهانیکا کەبوونی ئادەمیزاد واتای ئەتنۆلۆژیی نەماوە » ( مارسیل : جیهانی شکاو ، ل 144 )

مارتن هایدگری فەیلەسووفی خوانەناسی وجوودییش ، هەر بەم جۆرە ئەروانێتە مەسەلەکە . ئەو بێ پێچو پەنا دەیبرێتەوەو بە قەتعی ئەلێ « مێژوی بوون لەرووخانی بوونەوە دەست پێ ئەکا » . « بوونمان لە ناخی خۆیدا قابیلی برانەوەیە . لەوانەیشە ئەم برانەوەیە لەخودی زاتی خۆمان لێمانەوە نزیکتربێ ، برانەوەیش لە لەناو چوون و بۆ مردن شیان بەولاوە واتایەکی تری نی یە .

ئادەمیزاد ئەو تەنها بووەیە ، کە مەرگ ئەچێتە ناو جەرگی بوونیەوە ، بەو پێ یە کە مەرگ بەرزترینی ئەو توانایانەیە کە ئادەمیزاد هەنی . ئەم سنوورە ئازاراوی یە - سنووری مەرگ فەوتان یان برانەوە - ئەو سنوورەیە بوونی ئادەمیزاد دیاری ئەکاو جوێی ئەکاتەوە ، بەجۆرێ کە بتوانرێ بووترێ بوونی ئادەمیزاد خۆی لەخویا بوونی مەرگە یا بوونە بۆ مەرگ . چونکە ئێمە بۆ مەرگ دروست کراوین . ئەمەیش شتێکی روودا وی جەوهەری یەو رەنگیش بێ بیرتیژی لەوەدا بێ ئادەمیزاد ئەوەی رووی داوە قووبوولی بکا وەك خۆیو ، ژیانی مەرگ وەك بالاترین توانا لە تواناییەکانی بوونی ئادەمیزاد . بوون لەناخی نەبوونەوە نەبێ هەلناقولێ وەك چوون ئەبێ بەناخی نەبوونیشا بچێتەخوار . نیکۆلای بیردیاییف فەیلەسووف بەدبینی کۆچکردووی رووس ئەمانباتە مەودایەکی تری فەلسەفەی بەدبینی یەوە . مەرگو فەوتان بەلای بیردیاییفەوە قەدەرێکی متیافیزیکی نیە ، وەك بەلای یاسپەرزو هایدگەرەوە وایە . مەرگ فەوتانە بەلای ئەمەوە . مەرگ فەوتانێکە « تەکنۆلۆژی دروستی ئەکا » ! « گەورەترین مەترسی ئەوەیە کە تەکنۆلۆژی ئادەمیزاد خۆیی خستۆتە مەترسی یەوە .

دلی ئادەمیزاد لە ئاست ساردیی میتالەکان موچورکەی پیادێ . ئادەمیزاد لەگەڵ کۆمەلگایەکی رێك و پێك رێك کەوتووەو ئیستا بەرادەیەکی فراوان مەکینەو ئامێر بەکاردێنێ بۆئەوەی بەتەواوی دەسەلات بەسەر سروشتدا پەیدا بکا ، بەلام بەهۆی گەلێ بارو دۆخی بەسامەوە خۆی رۆژ بەرۆژ زیاتر ئەبێ بەکۆیلەی ئەوەی خۆی بەدەستی خۆی دروستی کردوە . من خەونی بەسام ئەبینم : رۆژێ دێ ئەم مەکینەو ئامێرانە ئەوەندە تەواو بێ عەیب ئەبن بێ ئەوەی ئادەمیزاد دەستیان تێ وەردا بۆخۆیان کار ئەکەن ، سەرەنجام ئەبن بە خاوەنی جیهان بۆ

نموونە ئۆتۆمۆبیلو فڕۆکە زاڵ ئەبن بەسەر گورجیداو رادیۆجیهان پڕ ئەکا لەدەنگی مردوو . دواکەسانیش پەکیان ئەکەوێو ناتوانن لەم ئاوو هەوا تەکنەلۆژی یایی‌یەدا هەناسە بدەنو بژینو ئەمرنو جیهانێکی نوێی ئەوتۆ لەدوای خۆیان جێ ئەهێڵن کە بەدەستو مێشکی خۆیان دروستیان کردووە »

( لە کتێبی ج ـ فولکوت : چەرخی ئادەمیزاد یان ئادەمیزادی ئامیرین ، مۆسکۆ ، 1967 )

ئەو نیشانەیەی هەموو فەلسەفە بەدبینەکان تیا هاوبەشن ئەوەیە کە هەموویان بوعدە مەوزووعی‌یەکانی « خراپەکانی جیهان » پشت گوێ ئەخەن کە خۆیان باسیان ئەکەنو مۆرکی شتی موتلەقیان لێ ئەنێن ، ئەو خراپەیەی هەیە لە جیهانا « لە ئادەمیزاد دایە » بەلام بەڕای ئەم فەلسەفانە دەسکردی ئادەمیزاد نی‌یە .

ئادەمیزادی سەدەی بیستەم لە مەیدانی زانستو تەکنەلۆژیدا زۆر فێربووە ، بەلام ئەم زانستە زۆرەی بە بیروراو بۆچوونی فەلسەفە بەدبینەکان مەینەتی تازەی وای بۆدروست کردووە کە ئەتوانێ چاریان بکات . ئەم فەلسەفە بەدبینانە لایان وایە ئادەمیزاد هێزی توانا لەرادە بەدەری وای کردووە بەچەکی دەستی ، گەلێ لەخۆی بەهێزترنو بەهۆی ئەمەوە لەوانەیە خۆی رۆژێ لە رۆژان ببێ بە بەندەی داهێنراوە کانی خۆی .

هەندێ لەفەیلەسوفو خاوەن بیرەکانی رۆژئاوا ، تەنانەت بەدبینەکانیشیان لەوە ئەگەن کەوا سەرچاوەی بەدبینی لەناخی سیستێمی سەرمایەداری خۆیدایە . بۆ نموونە ئەتوانین ئەم چەند تێگەیشتنە لای کەسێکی وەك مێژوو نوسی ئینگلیز ئەرنۆلد توینبی بەدی بکەین :

« ئەمرۆ لە هەموو ولاتەکانی رۆژئاوادا لەبارەی دوا رۆژی چینی ناوەراستی رۆژئاواوە ئەکۆڵنەوە . بەلام ئەنجامی لێکۆڵینەوە وەنەبێ تەنها دڵەکوتە بێ لەبارەی بەشێکی کەمی ئەوەی ئادەمیزادەوە کە راستەو خۆ بەر ئەکەوێ ، چونکە ئەم چینە ناوەراستەی رۆژئاوا کە بەشێکی ئێجگار کەمی مرۆڤایەتی‌یە بووە بەو هەویرترشەی هەموو مرۆڤایەتیی ئەم چەرخی نوێ‌یەی بێ پێگەیشتووەو بەوە جیهانی نوێی دروست کردووە . باشە کە درووست کەر نەما دروستکراو بێ ئەو چۆن ئەتوانێ بژی ؟ ئەگەرچینی ناوەراستی رۆژ ئاوایش تێك شکا ، بڵێی کۆشکی مرۆڤایەتیی هەموو بەجارێ لەگەڵدا داتەپێ ؟ وەلامی ئەم پرسیارە هەر چۆن بێ ، ئاشکرایە ، ئەوەی بوە بەتەنگو چەڵەمەی ئەم کەمایەتیە ، بە ناچاری تەنگو چەڵەمەی هەموو جیهانیشە »

« توینبی ، شارستانەتی لەتای تەرازوودا ، ل 30 »

**دوایی چینێك ... یان دوایی شارستانەتی :**

والیرەدا توینبی دانی پیانا کەوا سەرچارەی دەماری بەدبینیو سەرچاوەی ئەو ترسو لەرزەی کە هەموو داکۆکی لێکە رانی کۆنی گرتووەتەوە وە بریتی‌یە لەو نەخۆشیە کوشندانەی تووشی سیستێمی سەرمایەداری بوون . بەلام ئاشکرایە ئەو لای وایە کەوا کۆتایی چینی ناوەراستی رۆژاوا کۆتایی هەموو شارستانەتیشی بەدەمەوەیە . ئەویش لەم باری سەرنجەیدا هیچی لە فەیلەسووفی بەدبینی رۆمانی دوا رۆژە کانی چەرخی کویلەیی‌و فەیلەسووفی بەدبینی فەرەنسەی بەر لە شۆرشی فەرنسە دژی دەرەبەگی جیانی‌یە .

فەیلەسووفە بەدبینەکانو ئەوانەی تیووری کۆمەلایەتی بەدەبینی‌یان پەسەندکردووە ئیدیعای ناچاری بەرپابوونی شەرێکی ئەتۆمی‌یان کردووە بە بەلگەیەکی سەرەکی بۆخۆیان . لە وولاتانی رۆژئاوادا پری کتێبەکانە لە پێش‌بینیو قسەو باس لەبارەی « ئەوشێتی‌یە » وە « کەتوشی مرۆڤایەتی بووە » و سەرەنجام ئەکێشێتەوە بۆ شەرێکی گشتیو بەرفراوان کە هەموو شتێ کاول بکا . ئەم بەدبینانە هەموو هەوڵو توانای خۆیانیان تەرخان کردووە بۆ ئەوە کە تاوانی ئەم بەدبینی‌یەی خۆیان بخەنە ئەستۆی « سروشتی ئادەمیزاد » یان ئەوەی جار جار پێی ئەڵێن پاڵ پێوەنەری ناوەکی ئادەمیزاد خۆی کە بەهۆی ئارەزووی سروشت کردیەوە لەشەڕ حەز ئەکا خۆی لەناو بەرێ . ئەم بەدبینانە لایان وایە سەرچاوەی بەلاو هەموو ئەو ناکۆکی‌یانەی لەژیانی ئادەمیزادا سەروگوێلاکی یەکتری ئەکوتنەوە ، ئەم ناوازی‌یەی ناو دەروونی ئادەمیزاد خۆیەتی . هەروا ئەشیانەوێ شێوەیەکی زانستی‌یانە بدەن بەم بەدبینی‌یەیان تەنانەت گەیشتوونەتە رادەیەك ئەیانەوێ هۆیەکی بیولۆژی بە ئاشکراو زۆرەملێ یانە ، بۆ ئەم بەدبینی‌یەی خۆیان دانێن . ئەڵێن لەشی ئادەمیزاد تا رادەیەکی تایبەتی ئەتوانێ لەگەڵ ئەو گۆرانە توندو تیژانەدا بگونجێ کە لەو دەوروبەرەی دەرەوەی خۆیدا روونەدەن ، کە ئەوی تیابژی . مەبەستیشیان بە پەلە گۆرانی رەوتی ژیانو باری توندو سەختی تەکنولوژیو ماندوو بوونی دەمارو چەپەل بوونی ئاسمانو دەریاو تەنانەت خواردەمەنی بەتۆزی ئەتۆمو ئەو

دڵەکوتەیـە کە تـووشی ئادەمیـزاد دێ لە کاتی خـواردنی ئەو خۆراکانەدا . بێگومان ئەم جۆرە رەوشتو هۆکۆمەلایەتی یانە هەنو کاریش لە ملیۆنەها کەسو لە تەندروستیاندا ئەکەنو ، سەرەنجامیش هەموو هیوایِ ژیانیـان لێ ئەشێـوێنی . ئەمـە هەموودەستمـان ئەخـەنە سـەر راستی یەکی بـایەخـدار کە ئەوەیش ئەوەتا ئەو راستی یەی لەوانەیە گەمارۆی ئادەمیزادو ژیانی ئادەمیزاد بدا بەترس و لەرز زۆرن . هی‌واهەیە هەموویان ئـەگێڕێتـەوە بۆ « ئـامێر » و لای‌وایـە ئامـێر لە ئادەمیـزادیِ دروستکـەری وەرگەڕاوەتـەوەو بووەتـە دروندەیـەکی مـاڵ ویران‌کەروئەیەوێ عەقڵو دڵی ئادەمیزاد لە ناو بەرێو بیکا بە ئامێرێکی گوێ لەمستی خۆی . هەر بۆیەیشە ناوونیشانی زۆری وەکو « چەرخی، مرۆی ئامیرین » و « ئادەمیزاد لەژێر حوکمی ئـادەمیزادی ئـامیرین دا » و « یـاخی بوونی ئـادەمیـزادی میکانیکی » وشتی‌وا بڵاو ئەبێتەوە . هەر بۆیـەیش نووسـەرە سۆسیۆلۆجی یەکانو لاهووتی یە رۆژاوایی یەکان ترس و لە رزی خـۆیان لە چـەرخی ئامـێر دەرئەبـڕن . ئەمیـل بـرونـەر کـە لاهووتی یەکێ ناسراوی سویسرایی یە ، لە باسی چەرخی ئامیردا ئەڵی :

« ملیۆنەها کەسی لەژمارە نەهـاتوو لەچـەند شـاری گەورەیِ بێگیاندا کۆبوونەتەوە . پرولیتاریایەکی بێ پەیوەنـدین لەگەڵ سروشت ! نەریشـەی نیشتمانی‌یـان هەیـەو نەدەرو دراوسێ ئەفامن .. ئـەمە شـارستانـەتی کۆنکـریتو قالبو کێشـانەو پیوانەی چون یەکە . ئەمە بۆ ئەو بنیادەمانەیە کە ئامێر بیـرو خواستی لێسەندوونو خۆیان بوون بەخزمەتکاری ئامێرو بە ئـاوازێکی لەوەپێش دیـاری‌کـراوەوە بـەیـەك جـۆرە شێـوە ئەجولێنـەوە . ئەمـە واتە ـ هـەراو زەناو جلەو بـەربوونی لە وزەدانەبوو ئەمە بێکاریو بێ ئاسایشیی ژیانو خڕبوونەوەی پـایەو سـامانو هـۆی بەرهـەم هێنانـە لەچەنـد دەستێکداو قۆرخ‌کردنە بەهۆی بیرۆکراتی دەوڵەتەوە »

( بروانە ، مەسیحی یەتی و شارستانەتی ، نیویۆرك ، بەرگی 2 ، ل 10 )

پێ‌لێ نەنانی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی :

لەگـەڵ ئەوەشـا ئەو سـەرچاوەیـەی راستەوخـۆ بۆچـوونی بەدبینانەی بۆمێژوو لێوە هەڵئەقوڵێ بریتی یە لە پێ‌لێ نەنانی پێشکـەوتنی کۆمـەلایەتی ، چـونکـە بیروبـاُڕێکی سـەرنجی بەدبینانەی بەرامبەر بەئیستاو دواررۆژی مرۆڤـایەتی بێ ، ئەوە واتە دان بەوەدانانێ کە کۆمەڵە لە خوارەوە سەر ئەکەوێ بۆ سەرەوە ، لای وایە بە درێژایی چەرخ بەرەو بڕانەوە ئەڕوا . بەلام ئەبێ ئەوەیش بزانـرێ کەوا کـاتێ بۆرژوازیـەتی وەك سیستێمێکی کۆمەلآیەتی ئابـووری بەرەو پێش ئـەچوو پێ‌لی نەنانی وتەی پێشکەوتن بەشێ نەبوو لەبیری بورژوای رۆژاوا . خاوەن بیری پێشکەوتخوازی فەرەنسەیی لافارج مەبـەستی ئەمەیە کە ئـەڵێ : « لە سەرەتـای سەدەی نـۆزدەهەمـدا کە بۆرژوازیەت هیشتا بە شێوەیەکی سەرسام کـەر لەگەرمـەی سەرکەوتنی سیاسی و گەشەکردنی سامانی ئابووریدابوو ، بیری پێشکەوتنو گەشە کردن باوبوو . فەیلەسووفو میژوو نووسو رەوشت پەروەرو سیاسی و رۆمان نووسو شاعیرەکان نووسینو ووتـارەکانیـان بـەنـەخشو نیگـاری پێشکـەوتنی بـەردەوام ئەرازاندەوە . بەلام لە ناوەڕاستی سەدەی نوزدەهەمەوە ناچار بـوون وردە وردە بکـەونـە میـانـەڕەوی لەکـەفو کـوڵە بێ سنوورەکەیاندا ، چـونکە دەرکـەوتنی چینی کرێکـار بەسـەر شانۆی سیاسەتەوە لە بەریتانیادا ، گومانو دوو دڵی خستە دڵی بوژوازیەتەوە کەوا ئاخۆ دەسەلاتی سیاسی‌یـان هەر پـایەدار ئەبێ یانە ؟ لەوکاتەوە پێشکەوتن بەش بەحـاڵی بورژوازیـەت دلگیزی‌یەکەی جارانی نەما »

( لافارج : ـ پیویستی ئابووری ، پاریس ل 16 — 17 )

ئەمڕۆیش بورژوازیەتـ هێرشێکی بێ ئامان ئەباتە سەر واتای پێشکەوتنو فەیلەسووفە رۆژاوایی‌یە کان هێرش ئەبەنە سەر بیرۆکەی گەشەکردنی بۆپێشەوەو هێرش ئەبەنە سەر مەنطیقی مێژوو و توانای زانست هەر لەڕیشەوە . لەوانەشە بلێین حەزیان ئەکرد ئەگەر پێیان بکرایـە فەرمـانێکیان دەرکـردایە واتـای پیشکەوتن‌یان پێ لەناو ببردایەو بحەسانایـە وە وەك چـۆن نیکۆلای یەکـەمی قەیسـەری ڕووسیا فـەرمانێکی دەرکـردبە بەکارهێنانی وشەی پێشکەوتنی پێ قەدەغە کرد ..!

گینـز بـرگ ئـەڵێ : ئـائێستـا هیـچ قـانـوونێکی پیشکـەوتن نەدۆزراوەتەوە . ئەو دووپاتی ئەکاتەوە کەوا ئـەبێ لەجیاتی پێشکەوتن بوترێ گۆڕان ، چونکە گـۆڕان وائەبێ لەسـەرەوە ئەبێ بۆ خوارەوە یان لە خوارەوەو بۆ سـەرەوەو واتای جـۆر ناگەیەنێو هیچ هەڵسەنگاندنێکی بێ پێچو پەنای تیانی‌یەو هیچ پێودانێکی مەوزووعێ پێوەنیە « گینزبرگ : هەڵسەنگاندنەوەی بیرۆکەی پێشکەوتن . لەندەن ل 48 ) .

فـەیلەسووفـەکـانی بـەدبینی ئـەڵێن پێشکـەوتن واتـایـەکی

زانستیانەی نی‌یەو تەنها هەلسەنگاندنێکی رەوشتانەی روو داوەکانەو ئەو خودی‌یەتی‌یەی پێوەیە کە بەهەموو هەلسەنگاندنە رەوشتی یەکانەوە هەیە . بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە لە مەیدانی کۆمەلایەتیدا وەنەبێ تاقەیەك سەنگو تەرازووی پێشکەوتن هەبێو لەوانەیە ئەوەی لەسووچێکەوە پێشکەوتنە لەسووچێکیکەوە دوواکەوتن بێ . زانای سۆسیۆلۆجی هاوچەرخی فەرەنسی ریمۆن ئارۆنیش ئەلێ : ـ « ئەتوانرێ سیستێمە جیا جیاکانی حوکمرانی بەچارەی جیا جیای یەك گیروگرفت دانرێن . گواستنەوەیش لە جۆرە حوکمرانی‌یەکەوە بۆ جۆرە حوکمرانی‌یەکی تر وەنەبێ گواستنەوە بێ لە خراپەیەکەوە بۆچاکەیەكو لەخوارەوە بۆ سەرەوە ، بەڵکو گواستنەوەیە لە چارەیەکەوە بۆچارەیەکی‌تر ، هەرکامیان چاکەو خراپەی خۆی هەیە ( ئارۆن 18 دەرز لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا ، پاریس 1962 ل 86 ) . ئەم بەلگەهێنانەوەی ریمۆن ئارۆن لەسەر بناغەیەکی تاك پەرستی خۆیی نیسبی دامەزراوەو ئەتوانرێ بکرێ بە بیانووبۆ هەرچی ، هەر وەك چۆن ئەشکرێ نارەزایی لە هەرچی بێ دەربرێ ـ ئارۆن سەنگو تەرازوویەکی تایبەتیی خۆی داناوە بۆ پێشکەوتن .

ئەوەتا ئەلێ پێشکەوتن « بلاوبوونەوە » یە بیرۆکەیەکە ئەتوانرێ لە رووی چەندی‌یەتی‌وە تەعبیری لێبدرێتەوە . بۆیە ئەو ئینکاری پێشکەوتن ناکا لەزانینو لەمەیدانی هێزە بەرهەم هێنەکانو تەنها لە مەیدانی ئابووریدا ئینکاری ئەکا . هەر بۆیەش ئەلێ وەنەبێ پیشکەوتوترین ئابووری لەهەموو ئابووریەك باشتربێ . هەر وەها دەقاو دەق ئەلێ تا ئێستا ئیسپات نەبوە کەوا بارو دۆخی کاری ئادەمیزاد هەنگاو بەهەنگاو لەگەل باشتر بوونی هینانە بەرهەمدا بە ش بەحالی هەر تاکە کەسێك باشتر ئەبێ وەك چۆن ئیسپات نەبوە کەوا دابەش‌کردنی خێرو بێرو سامان بە ناوخەڵکا لەگەڵ زیاد بوونی سامانی کۆمەلایەتی‌یدا چاکترە لەدابەش نەکردنی . ئەم جیاوازی خستنە نیوان پێشکەوتن لە مەیدانی زانستداو پێشکەوتن لە مەیدانی کۆمە لایەتیدا درێژە ئەکێشێ تاوای لێ دێ لای پاسپەرز واتایەکی دوورتر ئەگرێتە خۆی . پاسپەرز ئیشارەت ئەکا بۆ پێشکەوتنی تەکنیکیو ئەلێ ئالەم مەیدانەدا ئەتوانین بلێین مێژوو هەر لەسەرکەوتندایە «بەلام بەش بەحالی مرۆڤایەتی ، لەو رووەوە کە مرۆڤایەتیەو لەرووی رەوشتی ئادەمیزادەوەو لەرووی بەزەیی‌و زیرەکی ئادەمیزادەوە ، ئەوەـ پێش ناکەوێ . پاسپەرز درێژە بەم مەفهوومە ئەدا تاهەموو شارستانەتی بگرێتەوە . ئەو بەلگە بۆ ئەوە دێنێتەوە کەوا ناتوانرێ پێشکەوتن دووبارە بکرێتەوەو ئەلێ گەلێ شارستانەتیی بەرز بوون شارستانەتی لەخۆیان نزمتر بەزاندوونی ، بەلکو هەموو شتێکی مەزن ئەبێ بکەوێ » . پاسپەرز دووبارەی ئەکاتەوە کەوا لەیەك دانو ژێرکەوتن دوونیشانەی باون لەمێژوودا بەلام راستی زانستانە ئەوەیە واتای دینامیکی‌یەت وەنەبێ واتایەك بێ بۆ تەنها جوولانو گۆران . جیهان پترلەیەك گۆرانی بەسەردادێ .

گۆران لە جیهانا لە ئاستێکی بالادا روو ئەداو شان بەشانی ئەوەگورانێکی ئا راستە کراویشە ، چونکە بەرژەوەندی ئادەمیزادو شتە ژیواری‌یە بایەخ پێ دراوەکانی پالی پیوە ئەنێن لەئاستی سیستێمە کۆمەلایەتی‌یە کۆنەکان لابدا .

لە فەلسەفەی دیالەکتیکیشدا ئەوە دانی‌پیانراوە کەوا لەچەند قۆناغێکی دیاری گەشەکردنی کۆمەلایەتیدا ـ ئەگەر بەیەك پارچە سەیریان بکرێ وائەبێ دیاردەی گەرانەدوابێو ، بە درێژایی مێژووی هەموو کۆمەلگاکانی چەوساندنەوە ، بەرابەر هەرپێشکەوتنێ ، گەرانە دوا یا پاشە کشەیەکی نیسبی بووە ، مامۆستایانی سۆشیالیزم ئەم واتایەیان بەو قسەیەی خۆیان دووبارە کردوەتەوە کە کەووتوویانە گەشەکردنو خۆش گوزەرانیی هەر کۆمەلێك لەسەر حیسابی کولۆلیو سەرکوتاندنەوەی کۆمەلێکی‌تر بووە . بەلام دیاردە لەولەبی‌یەکانو وردە پاشەکشە لەگەشەکردنی مێژوویدا ئەوە دورناخاتەوە کە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی یش هەبێ وەك رێبازێکی گشتی مێژوو . هەموو ئەو سیستمە مێژوویی‌یانەی بەدوای یەکدا هاتوون هیچ کامیان لەوە زیاتر نین کە قۆناغێکی گواستنەوەن لەرەوتی دواجاری گەشەکردنی کۆمەلەی ئادەمیزاددا لە خوارەوە بۆ سەرەوە » ( هەلبژاردەی دانروەکان ، بەرگی 2 ، ل 362 )

**تیووریی خولی مێژوویی :**

فەلسەفەی بەدبینی لە مێژوودا بە جۆرێکی کەش جگە لە جۆری بەئاشکرا دانەدواوەی واتای پێشکەوتن ـ خۆی دەردەبرێ . تیووری « خولی مێژوویی‌یش » دەربرینێکی کەی فەلسەفەی دانەدواوەی پێشکەوتنە ، چ بەدان‌نەنان بە پێشکەوتندا یان بەدان‌نەنان بەبوونیدا یان بەدان نەنان بە بەردەوامییدا .

بیرۆکەی دووبارە بوونەوەی « خولە مێژووییەکان » بەلای ئەوەدا ئەروا کەوا مرۆڤایەتی پاش تێپەڕ بوونی بەچەند قۆناغێکدا ئەگەڕێتەوە بۆدواوە تا سەر لەنوێ ئەو قۆناغانەی پێشتر پیایاندا چوە دووبارەیان بکاتەوە . ئەم بیرۆکەیە لەجۆرە بیرکردنەوەیەکەوە هەڵقوڵاوە کە ئەویش ملکەچی هەندێ بڕیاری بێ سەروبنی میتۆلۆژیاییە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە تیۆریی خولی مێژوویی خۆی لەبنەڕەتدا هەندێ بیری ئەقڵگرتووی تیابوە لەگەڵ سەرەتای پەیدابوونیدا گونجاوە .
بۆنمونە فەلسەفەی مێژوو لای (فیکۆ) لە دوانیوەی سەدەی هەڤدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا بیری نازانستییانەی دووبارە بوونەوەی خولە مێژووییەکان و بۆچوونی زانستییانەی ( ئەو قانوونانەی مێژوو بەرێوە ئەبەن قانوونی مەوزووعین ) ی ئەبەست بەیەکەوە بەلام بانگ راهێلان بۆ ئەم جۆرە تیۆرییانە لەسەدەی بیستەمدا بەتەواوی شتێکی جیاوازە چونکە گەشەکردنی زانستیی زۆرو تاقیکردنەوەی مێژوویی ئادەمیزاد بەتەواوی بیرۆکەی دووبارە بوونەوەی خولە مێژووییەکان ئەدەنە دواوە . مەبەست لەم تیۆرییە دووبارەکردنەوەی قۆناغە کۆمەڵایەتیەکان و بێبەشکردنی ئادەمیزادە لەباوەڕ بەتوانای بوونی دوارۆژێکی چاکتر .
( شپەنجلەر ) کە یەکێکە لەوانەی ڕێیان بۆ ئایدیۆلۆژی نازی خۆشکرد لە بەدەرەوە بووترین لایەنگرانی تیۆریی خولی مێژوویی و بەکەف و کوڵ ترینیانە . ئەمە لای وایە شارستانەتییە جیا جیاکانی مرۆڤایەتی لەوانەیە هیچ شتێکی هاوبەشیان لەنیواندا نەبێ و هەریەکە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەوانی کەیان گەشە ئەکات و هیچ شارستانەتییەك نیە شارستانەتییەکی تر دەوڵەمەند بکات و ڕێی شارستانەتی یەکان هەرگیز ناگاتەوە بەیەك .
شپەنجلەر لەهەموو ئەمانەدا لەگەڵ توینبی یەك ئەگرێتەوە ، لەگەڵ ئەوەشا کە لێکدانەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی گیروگرفتە مێژووییەکان لای توینبی و شپەنجلەر لێك جیایە .
شپەنجلەر لای وایە هیچ شارستانەتییەك بێ مەرجی مێژوویی شارستانەتییەکی تر دانامەزرێ . ئەو بەم جۆرە واتای گەشەکردنی بەرەو پێشەوەی مێژووی ئادەمیزاد ئەداتە دواوە .

ئەو بێپێچو پەنا ئەڵێ : « من لەجیاتی شێوەی یەك چەشنەی مێژوو وەك هێڵێکی ڕاست ، ئاوێنەیەکی شارستانەتییە بە هێزەکان دێتە بەرچاوم هەریەکەیان بیرۆکەی تایبەتی و ئارەزووی تایبەتی و ژیانی تایبەتی و چونی و هەستو مەرگی تایبەتی خۆی هەیە .
هەر شارستانەتییەك بەرپرسی تایبەتی خۆی و دەربڕینی تایبەتی خۆی هەیە کە پەیدا ئەبێ و بێ ئەگاو جارێکی کە دووبارە نابێتەوە . من لەمێژووی جیهاندا شێوەی پەیدابوون و گۆڕانێکی هەمیشەیی ئەبینم . بەلام مێژوو نووسی ڕەسەنکار وەك قەیتانە کرمێك بۆی ئەڕوانێ کەبێ ماندوو بوون ماوە ئەخاتە سەرماوە .
« رووخانی ڕۆژاوا ، ل 27 — 28 » .
باوەڕ نەکردن بە پەیوەندی ئاڵو گۆڕکراوو یەکتری دەوڵەمەندکردنی شارستانەتی و کولتوورە جیاکان هەرگیز لەگەڵ ڕاستییە مەوزوعییەکان ناکەویتەیەك . فەلسەفەو هونەرو ئایینەکۆنەکانی چین و هیند ـ بۆنموونە ـ بەیەکێ لە سەرچاوە ئایدیولۆژییەکانی شارستانەتی گریکی کۆن ئەدرێنە قەلەم . وەك چۆن شارستانەتی ڕۆمانیش بە هەموو سیما تایبەتییەکانیەوە کەڵێ لە بەها گیانییەکانی یۆنانەیەکانی بەمیرات بۆماوەتەوە . ئاینی مەسیحی خۆیشی پەیوەندی زۆری پێکهاتنی بەجیهانی گریکی و ڕۆمانییەکان و بەئایینی جوولەکەو میتۆلۆگی فارسی و شارستانەتی کۆنی میسرەوە هەیە . لەرووی مێژووییشەوە ئیسپات بوە کەوا « لە هەر لایەك پەیوەندییەك لەنێوان گەلانی جیاجیادا بووبێ ، وەنەبێ تەنها ئاڵو گۆڕی کەلو پەل بکەن ، بەڵکو ئاڵوگۆڕی بیریش ئەکەن . ئێمە لەگەشەکردنی مێژووەوە ئەزانین کەوا دامەزراندنی شێوەیەك لەشێوەکانی هێنانە بەرهەم لە ئەورووپاو ئاسیاو ئەمریکاو ئەفریقادا ئەبوو بەهۆی ئەوجۆرە بیرو باوەڕو داموو دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییانەیش لە هەرکامیاندا بەرپا ئەبوو ، هەروا دیاردەی چوونیەکی لەمەیدانی ڕەوشت و هونەرو ئەدەبدا و لەهەموو قەوارەی ژیانی کۆمەلایەتیدا لەهەموو کیشوەرەکانا پەیدا ئەکرد . ئێمە لە ڕوانگەی مێژووی هاوچەرخەوە ئەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین کەوا سەرکەوتنی سیستەمی سەرمایەداری لە ژاپۆنیا گەڵێ دیاردەی مایەیی و گیانیوای دروست کرد وەك ئەوانەی سەرکەوتنی ئەم

سیستێمە پێشتر لە ئەوروپادا دروستی کردن . کەواتە ڕاستنەوەیە مێژوو نافەوتێو هیچ شارەزاییەکی عەقلی وەچەی ئادەمیزاد با نایبا » .

**تیووریی چارەنووس و بەدبینی**

فەلسەی بەدبینی ڕوویەکی کەشی لەمێژوو ولە سەرەنجامی ئادەمیزادا هەیە ئەویش ئەو ڕووەیە کەفەلسەفەی چارەنووس ئەیگەیێنێ . لەوانەیە فەلسەفەی چارەنووس یەکێ بێ لە کۆنترین تیووریییە فەلسەفییەکان بەهۆی سروشتی پێوەندی بەتینیەوە بە میتۆلۆژیای کۆنەوە ، بەتایبەتی میتۆلۆژیای یۆنانی . لە ئەفسانەی یۆنانیدا هاتووە کەوا(موارای) خوای چارەنووس تاڵی ژیانی ئادەمیزادی ڕستو پاشان فڕێیدایە بیابانی کاکی بەکاکیی (لابرنث)و پاشان پچڕ پچڕی کرد . بنەمای بیرکردنەوەی فەیلەسووفانە کە لەسەر سەرەنجی چارە نووسی یانە دامەزرابێ ، زۆری لەم ئەفسانەیە ، چونکە ئەویش ـ هەرلای وایە کەوا هەرچی ڕووداوی مێژووییە ـ لە شەڕو شۆڕشو بەڵاو چارە نووسی خەڵك ـ هەموو لەپێشەوە لەلایەن هێزێکی دەرەکی یەوە بڕیاردراوەو ، مێژوو کردارێکی سەرەتایی بێ مەعنایە ، قانونی بێڕەحمانەی چارەنووس پاڵی پێوە ئەنێ . زانای سۆسیۆلۆجی فەرەنسا گۆستاف لۆبۆنیش ئەم بۆچوونەی هەیەو وای لێكئەداتەوە کەرەنجی ئادەمیزاد هەمووی بەیادە . ئادەمیزاد لەژێر حوکمی هەندێ هێزی دەرەکی وەك قانونی ناچاریو ئاووهەواو کارتێ کردنی ڕابووردوودایە کە پێشینان بێ یان ئەوت چارەنووس . ئێمەلە تواناماندا هەیە جنێو بەچارەنووس بدەین ، بەلام لە تواناماندا نییە خۆمانی لێ دەربازکەین .

تیووریی چارەنووس لە بارەی مێژووەو لای وایە نە شەخسیەتی مێژوویی و نەکۆمەلانی ڕاپەریو ناتوانن کار بکەنە ڕەوتی بڕیاردراوی مێژوو . بیری ئادەمیزادو سازمانە ـ ئینسانییەکانیش ناتوانن شتێ لەوەزیاتر بکەن کە خۆیان لەگەل کاری چارەنووسانەی مێژوو هاوئاواز بکەن ، چونکە ناتوانن کاری تێدابکەن . هەرچی لە مێژوو ڕابووردووە ئەبوو هەر بەوجۆرەبوایە ! هەرچیش لەژیانی کۆمەلایەتیدا ڕووئەدا ، بەو جۆرە ڕووئەدا کە لەچارەنووسی نووسراوە . ئامانجی فەلسەفەی چارەنووس ئەوەیە نادەمیزاد ناچار بکا بۆ گونجان لەگەل ئەو خراپەیەی بەشێکە لەچیەتی (ماهیة) و ژیانی ئادەمیزاد جوێ نابێتەوەو مادام هەرچی دەردی ئادەمیزاد هەیە هەموو دەردی سروشت کردنو ناتوانێ خۆی لێیان دەرباز بکات .

سەیر ئەوەیە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی خۆیی کەدان بەهیچ جۆرە ڕێکوپێکی یەکدانانێ لەگەشەکردنی ئادەمیزاددا و هۆشیاری ئادەمیزادو ویستی ئادەمیزاد وا لێكئەداتەوە کەوا قەوارەیەکی ئازادە لە دروست کردنی پرۆسێسی مێژوودا و لەگەڵ فەلسەفەی چارەنووسی دژی خۆیدا لەوەدایەك ئەگرێتەوە وە کە هەرچی ئازادیی کاری ئادەمیزادو ـ مەبەست داریی کاری ئادەمیزادە ـ هەمووی هەڵ ئەوەشێنێتەوە . هەر دوولا لەوەدا هاودەنگن کە ئاقلانەیی مێژوو وپێشکەوتنی کۆمەلایەتی ئەداتە دواوەو لە بەربەرەکانێ کردنی واتا مەوزووعیو شۆرشگێرییەکانی مێژوودا یەك ئەگرنەوە .

بە پێچەوانەی فەلسەفەی چارەنووس و تیووری لە خۆڕاییەوە ، فەلسەفەی زانستی لایوایە کەوا تێگەیشتنی پێویستی مێژوویی کارێکی گەوهەرییە بۆ بەدەرەوان کردنی سنووری ئازادیی ئینسانو پاڵ پێوەنانی پرۆسێسی دەوری بیری پێشکەوتن ـ خوازو چالاکی مەبەستداری ئادەمیزاد لە بیناکردنەوەی ژیانی ئادەمیزادو پێوەندی کۆمەلایەتی لەو ژیانەدا . فەلسەفەی زانستی یانە لە مێژوودا هەرگیز دەوری هۆشیاریو ویستی ئادەمیزاد لەگەشەکردنی کۆمەلایەتیدا ئینکار ناکاو بەکەم بایەخی ناداتە قەڵەم ، بەڵکو ئەوەی کردووە بەئەرکی سەرشانی خۆی لەپێوەندی ڕاستەقینەی نێوان هۆیە مەوزووعیو زاتییەکان بکات لە کۆمەڵو لەمێژوودا و لەئاستی پرا کتیکیشدا (فێربوونی هونەری دیاریکردنی ئەو مەرجانەی کردبێ بە ئامانجی خۆی کە سەرکەوتنی چالاکی هۆشیارانەو ئامانجداری خەڵكو چینو ڕێکخراوەکانی تیا بێتەدی»

فەلسەفەی زانستییانە بەهیچ کلۆجێ مەیدانی بەدبینی نادا لە تەقەلای خۆیدا بۆ پێشخستنی زانستییانە . ئەو لەئاستی کۆمەڵایەتیشدا بتوەری وایە کەوا پێشکەوتنی زانستیو چەرخی بەکارهێنانی ئەتۆمو چەرخی کۆمپیوتەر مرۆی ئامێر (الانسان الآلي) مەترسی یان بۆسیستێمی سەرمایەداری هەیە نەك بۆمرۆڤایەتی . مەترسییان بۆ هێزە کۆمەلایەتییە ڕووخاوەکان هەیە ، نەك بۆ هێزە کۆمەلایەتییە بەرەو پێش چوەکان و مەترسی ناخەنە بەر دوارۆژی ئادەمیزاد .



# پێشانگایەکی حەوبەش و هەڵسەنگاندنێکی هونەری

هەموو تابلۆیەکی هونەریی ئەگەر چی سەر بەهەر ڕێبازو قوتابخانەیەکی هونەریی بێت خاوەنی جوانیو تەکنیکێکو دەلالەتێکی تایبەتی ی خۆیەتیو ملکەچ دەبێت بۆنەو یاساو دەستورە ئیستاتیکییانەی کە بڕیاری سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی ئەو تابلۆهونەریە دەدەنو زۆر جار ئەو هونەرمەندەی تابلۆیەك دەکاتو سەرکەوتووش دەبێت بێئەوەی ئاگاداریی هیچ شتێك لەو یاساو دەستوورە ئیستاتیکیانە بێت ، بۆ تاقی کردنەوەو زیرەکیو ئەو هەستە هونەرمەندانەیەی دەگەڕێتەوە کە هەیەتی ، ئەم دیاردەیەش لە پێشانگای (حەوت هونەرمەند) بەدی دەکەین کە بەڕێوەبەرێتی

ڕۆشنبیریی جەماوەرلە سلێمانی سازی کرد . ئەم هونەرمەندانەش هیچیان دەرچووی هیچ قوتابخانەیەكو دامەزراوێکی هونەریی نینو لەگەڵ ئەمەشدا زوربەیان زیرەکانە هەڵس وکەوتیان لە گەڵ ئەو ڕووە پانانەی تابلۆکانیان کردووەو سەرکەوتوو بوون تیایا ، جا بۆ ڕادەی سەرکەوتنو سەرنەکەوتنی تابلۆکانیان بە پێویستم زانی هەڵیان سەنگێنم کەئەم هەڵسەنگاندنەش پەیوەندیی بەفۆرمەوە زیاترە وەك ناوەرۆكو زیاتر گرنگی دان بەهەندێکیانو چوونە ناو ناوەرۆکیانو بۆ سەرکەوتوویی ئیشەکە دەگەڕێتەوە .

**1 ـ ئاراس عەبدول کەریم :**

کۆمەڵێکی زۆر لەهیوای گەورەی داهێنانو بیرو ئامانج قەتماغە دەبەستێت ئەمیش بەدوای ڕێگەیەك دادەگەڕێت کەتەعبیری پێبکاتو دەریبڕێت کەسیفەتی تایبەتی هەبێت لەگەل ئەوتێڕوانینەی لەناخیدا پەنگی خواردۆتەوەو لەخودیدا دەیهەژێنێ ، بەهێمنی هەڵسو کەوت لەگەڵ ئەوڕووە پانەی تابلۆکەی دەکات جولەیەکی بەردەوام دەدات بە پارچە (الكتلة) لەپێناوی ئەوەی هاوسەنگێتی (التوازن) بەدی بێنێت لەڕێگەی ڕەنگو هێڵو پەیوەندییە تەشکیلییە تایبەتییەکان . بەمەش پلەی یەکەم دەدات بەڕەنگ بۆئەوەی زیاتر بگاتە جەوهەری فورمەکانی . فۆرمە ئەندازەیییەکانی تێکەڵ بەیەکتری دەکات بەشێوەیەك کەهێڵو فورم دەبێتە بنەمایەکی کارتێکەری دینامیکی ، هەندێ جار سنوور لەنێوان فۆرمێكو فورمێکی تردا دادەنێتو زیرەکانە دەیکاتە پەیوەندیەکی هارمۆنی لەنێوان هێڵەکانو سەربەستی یەکیش دەدات بەفۆرمەکانی . لەپێناوی ئەوەی تەعبیرە تایبەتییەکەی خۆی بسەلمێنێ کێشەیەکی لەتابلۆکانیدا دروست کردووە ، ئەویش گەڕان بەدوای فورمی نوێدا لەڕێگەی ئەوهەستە سەرەتاییەوە کەتوانیویەتی لەتابلۆکانیدا بنچی دابکوتێ . لەخانووی شارو دێو گەڕەکەکان ووردەبێتەوەو دوای سەرنج دانێکی دوورو درێژ فورمی خانوەکان تەجرید ددکات بۆ ئەو فورمەی کە خۆی دەیەوێت ، هارمۆنییەتێك بەکاردد هێنێت لەنێوان فورمەکانو ئیقاعێکی ئەندازەیی جوان دەدات بەتابلۆکە (نوکوربوزیە)ی هونەرمەندو ئەندازیاری جیهانی دەڵێت (مرۆڤ پێویستییەکی حەتمی بەفورمە ئەندازەیییەکان هەیە ـ گۆشە وەستاوەکان ـ چوارگۆشە ـ لاکێشە ـ بازنە ، بێ ئەمانە ناتوانێت هیچ شتێك بکات کە هەستێکی بداتێ شتێکی نایابی کردووە ، چونکە ، ئەندازە زمانی مرۆڤە . ئەم هەستەش لای ئاراس لەو ڕۆژەوەی کە لە دایك بووە چاوی بەفورمە ئەندازەیی یەکان کراوەتەوە .



● **لوقمان میرزا** ●

دروست بووەو کاری تێ کردووە بە هیچ هەوڵێك نەی توانیوە دەست بەرداریی ئەوزمانە بێت بۆیە لەوزمانە بەباشی تێگەیشتوەو توانیویەتی پەیوەندیەکی ڕۆحی لەنێوان خودی خۆیو فۆرمە ئەندازەیی یەکان پەیدا بکات . بەکارهێنانی ڕووپێوی گەورەی ڕەنگیو سادەیی بەرهەم هێنانی فۆرمەکانی دیسان سادەییو پاکێتی خودی ئەم هونەرمەندە دەردەخات کە زۆر جار لەجیهانی منداڵ نزیکی دەکاتەوە ودەبێتە ڕەنگدانەوەیەکی تەمەنی منداڵی ی خۆی . ئەمەیش یەکێکە لەو بنەما گرنگانەی کە ئاراس توانیویەتی لەگەڵیدا یەکگرێتوخۆی لەئامێزی ئەوجیهانەدا بدۆزێتەوە ، تابلۆی (ژیانەوە) پاکترین بەڵگەیە بۆ ئەوە . وەنەبێت نزیك بوونەوە لەجیهانی منداڵ شتێکی ئاسان بێت ، چونکە منداڵان گەورەترین هونەرمەندو ڕەخنەگرن هەر بۆیەش کۆمەڵەی (کوبرا) لەبەیانە هونەرییەکەیاندا دەڵێن (حەقیقەت تەنها لەدەمی منداڵانەوە دەردەچێت) . ئاراس هونەرمەندێکە خۆی تاقی دەکاتەوە بۆیە ئەم دیاردەیەش لەوێنەکانەدا هەست پێ دەکەین کەپێشانی دابووین لەتابلۆی (تێڕوانین) دا کە چوار دەمو چاو بوون هەریەکەیان سیفەتی تایبەتیان هەبوو هەمووشیان تاقی کردنەوە بوون بۆ ئەورەنگو فۆرمانەی کە لەتابلۆکانیدا چارەسەریکی ئیستاتیکی کردبوون . ئەتانەت لەئیشە هێلکارییەکانیشدا هەر درێژ بوونەوەی ئەو ڕیرەوەیە کەسوودی لێوەرگرتبوو . هەست بە هیچ نامۆیی یەك ناکەین لەنێوان هێلکاریو ئیشەکانی تریدا بگرە زۆر بە زیرەکی (کولاج)ی بەکارهێناوە کەهیچ ناجۆرییەکی بەئیشەکانی نەدابوو . لەلێکدانی ئیشی ڕەنگو کولاجو هێلکارییەکانی گەیشتوتە ئەو بەرهەمەی کە ڕیرەوی خۆی بی بوو بوونەوە توانیبووی هارمۆنییەتی فۆرمو ئیقاعو هاوسەنگێتی لەتابلۆکانیدا بەهێز بکات . (کیوبین) لەبارەی ئەو شارانەی کە (بول کلی) هێنابوونییە بەر هەم لە تابلۆکانیدا دەڵێت (ئەوشارانە لەسەر نەخشەدا بوونیان نییە ، وەك سەرابیش سەرنجت ڕادەکێشنو لەگەڵ خۆیانا ئەتبەن . وەك شووشەش شەفافو پاکن) . لەو باوەڕە دام ئەگەر (کیوبین) ئیشەکانی ئاراسیشی ببینیایە هەرهەمان ڕای دەبوو بەرامبەر ئەمیش .

٤ ـ ئەمڕۆ ئەوقی

ڕێبازێکی تەعبیری بۆ وەردەگرێت لەدەربڕیندا ، دەموچاو دەکاتە حەقی تەعبیریەکەیو کردوویەتی بەو بنەما گرنگەی کە هەموو پێك هاتووەکانی لێوە دەر دەچێت لە بەکارهێنانی ڕەنگدا دەست بڵاوی ناکات . دوو ڕەنگ یان زیاتر بەکار دەهێنێتو بەشێوەیەکی زیرەکانە چارەسەری تابلۆکانی پێ دەکاتو دابەشی دەکات بەسەر فۆرمەکانیدا . هەر ئەمەش زیاتر یارمەتی دەدات بۆ تەقینەوەی ئەوهەستە تەعبیریەی لەناخی دایە ، ئەم دیاردەیەش لەتابلۆی (1982/1/1) دەبینین . لەپێشو ناوەڕاستی تابلۆکەدا فیگەرێکی گەورە دەبینین کەبریتییە لەپۆرتریتێکی خۆی لە ڕوانگەیەکی ڕۆمانسییەوە کەحالەتێکی ڕۆحیو دەروونیی خۆیپیشان دەدات بەرامبەر یەکەم ڕۆژی ساڵی تازە ، کە ئەمەش زیاتر لەتەعبیریەکانی نزیك دەخاتەوە لە بەکار هێنانی پۆرتریتی خۆیا بەو شێوەیە . چونکە زۆربەی ئیشی تەعبیریەکان پۆرتریتی خۆیان بووە لەو ڕوانگە ڕۆمانسییەوە هاوسەنگێتییەکی ڕێكو پێكو دیراسە کراو لەئیشەکەدا هەیە . لای ڕاستی تابلۆکە قورسەو توانیویەتی بەو جوولەو خوارکردنەوەی مل فیگەرە گەورەکە وە بەلای چەپی تابلۆکەدا . هاو سەنگێتییەکە بهێنێتەوە جێی خۆیو

جوولەیەکی نەوەستاو بدات بەتابلۆکە . هەموو بوون ، ناوەرۆکی عاتیفی وسایکۆلوجی لای ئەم درێژ بوونەوەیە بۆگەیشتن بەڕۆح و خودی خۆی . هەر بۆیەش ئەو دیمەنەی لە تابلۆی (قزلەر)دا دەیبینین کردوویەتی بەو هۆیەی کەتەعبیریەتە خودییەکەی تیا بەکار بهێنێت چونکە لای ئەم تابلۆی هونەریی گواستنەوەی واقیعی دەرەوە نییەبەڵکو هەڵڕشتنی ئەو هەست و سۆزو ئەندێشەیەیە کە بوون لەخودی خۆیدا دروستی کردوون و لەتابلۆکەیدا دای ڕشتووە کەوا دەزانیت بەشێکە لەخودی ئەم نەك بەشێك بێت لەواقیعە مەوزوعییەکە . ڕەنگ و فۆرم و هێڵی تیژ بەتایبەتی ڕەنگە تەماوییەکان گەیاندویانە بەو ڕێبازە تەعبیریە کەتیایدا توانیویەتی ئەو هێڵە تیژانە لەگەڵ یەکتری وا ڕێکیان بکات لەگەڵ فۆرمی ڕەنگدا هارمۆنیەتێك سازبکات . ئەمەش لای تەعبیریەکان زۆر پێڕەو کراوە ، چونکە هونەری یابانی کاری تێکردبوون ، یابانییەکان ئەو فیگەرانەی کەبەکاریان دەهێنا هێڵی دەرەوەیان بۆدەکردو دەورێکی چاکیان دەدا بەهێڵ . ئەهرۆ لەم ئیشانەیدا زۆر گرنگی بە فۆرمی دەرەوە داوە لەپێناوی بەرەڵلا کردنی ئەو سۆزو هەستە پەنگ خواردوانەی پێویستیان بەبەرەڵلا کردن هەیە هەر بۆیەش فۆرم و دەموچاوەکان و تەنەکان تێك دەشکێنێت و خوارو خێچ و گەورەو بچووکیان دەکات بۆگەیشتن بەوحاڵەتە تەعبیریەی خۆی دەیەوێت کەئەمەش لە تابلۆکانی (کۆچەرە کوردەکان) و (ژان)دا دەیبینین . بەڵام ئەوەی کە (ئەهرۆ) تیایا سەرنەکەوتبوو بەکارهێنانی ڕەش وسپییە یان مەسەلەی کۆنتراست لە تابلۆیەکیدا ئەوڕەنگە سپییەی تیایا بەکار هاتبوو نەشازییەك و دابڕانێکی گەورەی دروست کردبوو . لەتابلۆکەدا زۆر بەزەقی کاری لەچاوی بینەر دەکردو هیچ سووچ و مەودایەکی تیانەبوو . وات هەست دەکرد فۆرمەکان لە هەوادان ، لەتابلۆیەکی تریدا کەمادەی (پاستیل)ی تیا بەکار هێنابوو ، نەیتوانیبوو پەیوەندییەك دروست بکات لە نێوان ئەو پێك هاتووە گەورەیەی لای خوارەوەی تابلۆکەو فۆرمە پاستیلیەکانی و نەشی توانیبوو چارەسەری بکات . ئەگەر بێتوو سەرنجێکی ئیشەکانی (ڕینوار) و (دیگاس) بدەین دەبینین کە چۆن چارەسەرێکی ئیستاتیکیانەی مادەی پاستیلیان کردووە ، تابلۆکە هاوسەنگێتی تەواو نەبوو ئەویش بە قەڵەبالغ کردنی تابلۆکە بە فۆرمێکی زۆر کە تووشی سەر لێشێوانی کردبوو و نزیکی کردبۆوە لە ڕێبازی سوریالییەکان . ئەهرۆ ئەزعەیەکی تەعبیریی چاکی تیا هەیە ئەگەر بێتوو زیادتر ئیش بکات و بەشێوەیەکی باشتر پێی بگەیەنێ .

### 3 ـ حمەسەعی باپیر .

یەکێ لەشاکارە هونەرییە گەورەکانی جیهانی تابلۆی (سەربەستی پێشەوایی گەل دەکات) کەلەساڵی (1830) دا (دیلاکروا) بەرهەمی هێناوەو توانیویەتی ئەو تیئۆرە تایبەتییەی کە خۆی هەیەتی بەرامبەر فۆرم و ڕەنگ و هێڵ تێیدا بە کاری بهێنێت . ئەم تابلۆیەش هونەرمەند حمەسەعی گواستبوویەوەبە ماوەی چوارساڵ کە بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ خەریکی بووە . مەسەلەی گواستنەوەی تابلۆیەکی جیهانی وەکو لێدانی سەمفۆنیەکی جیهانی وایە ، تاچەند ئەو تیپەی کە لێی دەدەن کارامەو دیراسی بن دەتوانن نرخی خۆی بدەنێ . بەلام ئەگەر توانایان بەسەری دانەشکا لەلێدانیشدا خۆشیان بێزار دەبن و گوێگریش بێزاردەکەن و بەشێوەیەکی خراپیش ئەومۆسیقایە دەگەیەنن بەخەڵك . بەلێ کاك (حمەسەعی) ویستوویەتی نرخی خۆی بدات بەتابلۆکە ، بەلام نەیتوانیوە . ئەویش بەهۆی نەبوونی ئەو دیراسە باشەی کە ئەم نییەتی . ئەمەیش گوناهی خۆی نییە چونکە (باپیر) هیچ قوتابخانەیەکی هونەریی نەخوێندووەو بەباشی نەچوتە ناو مەسەلەی



ئەكادیمیەت . تابلۆكەی لە ڕەنگدا هەتا بەلای دیلا كرۆادا چووە . دەبینین لە سێبەرەكان‌دا ڕەشێكی تۆخی بەكارهێناوە كە سێبەرەكان لە تابلۆكەی دیلاكرۆادا هەتا ڕەنگی گەرمیشی تێیەو پلە بە پلە هاتۆتە خوارێ . تابلۆكە بەهیچ شێوەیەك هێلی تێدا نیە ، ئەمەیش یەكێكە لە تیۆرەكانی دیلاكرۆا كە بە هیچ شێوەیەك هێلی لە تابلۆ كانی‌دا بەكارنە هێناوە . بەلام لەوەی ئەم دا بەتایبەت لەو فیگەرەی كەپاڵ كەوتووەو هەردوو قاچی بووتە ، هێلی بەشێوەیەكی سەرەكی دەوری تیا بینیووەكە كردوویەتی بەسنوور بۆ لەشەكەو هێڵەكانیش ڕەشن . تابلۆكەی دیلاكرۆا ڕەنگی سەوز زاڵە بەسەریدا و لەگەڵ زۆربەی ڕەنگەكانی تریدا تێكەلاوی كردووە ، بەلام لای ئەم پەیڕەوی ئەمەی نەكردووەو ڕەنگی ڕەش‌و زەردی زاڵ كردووە بە تایبەتی ڕەنگی زەرد لەدواوەی تابلۆكەدا . ڕێژە لای كاك پلەیەر ڕاست نییە بەتایبەت ڕێژەی ئەو فیگەرەی لەژێر قاچی منداڵەكەدایە . سەری زۆر زل كردووەو لەشی بچووك ، ئەو ماوەیەی لە نێوان تفەنگی دەستی كچەكەو دەستی منداڵەكەدایە لای ئەم زۆر كەمە ، بەلام خۆی زیاترە . جگە لەوە سوانەوەی ڕەنگەكانی كە ویستوویەتی تەكنیكی تابلۆ ڕەسەنەكە دەربهێنێت بەلام ئەمەیشی نەتوانیوەو ڕەنگەكانی مزاندووە . لەگەڵ ئەوەش‌دا ڕەنگی دەمووچاوی فیگەرەكانی زۆرتر ڕەنگی زەردە كەلای ئەو بەهیچ جۆرێ ڕەنگی زەرد نییە ، بەڵكو ڕەنگی گۆشتیی ئەكادیمی‌یە . بەهیچ شێوەیەك گرنگی بە زەمینەی تابلۆكە واتە لای خوارەوەی نەداوەو پشت گوێی خستووە . ئەمانەو هەندێك هەڵەی تر كە نەیتوانیووە زاڵ بێت بەسەریدا . لەو تابلۆیەی كە (پۆرترێت) ێك بوو ئەو ڕەنگانەی‌یان بلێین ئەو دوو ڕەنگەی داناوە ڕەنگی گوێزیی مەیلەو ڕەش‌و زەردێك‌و لەهەندێك شوێندا سپی ، هیچیان ڕەنگی گۆشت نین . هیچ هەستی هونەرمەندێكی وا نادات بەدەستەوە كە بەڕەنگ ئیش بكات ، چونكە مەسەلەی (پۆرترێت) كە هونەرمەند بەرامبەر (مۆدێل)ەكە دادەنیشێت كەرەسەیەكی زیندووی لە (فورم)و (ڕەنگ) لەبەر دەستایەو پێویستە هەڵس‌و كەوتێكی باش لەگەڵ ڕەنگ‌و فۆرمدا بكات . (حافظ الدروبي) دەڵێت (پۆرترێت ئیشێكی گرانە . كاتێك وێنەی كەسێك دەكەیت دیمەنێكی سروشتی زۆر گەورە دەكەیت‌و لەووردە كارییەكانی قووڵ دەبیتەوە) چونكە ئەو ڕەنگانەی لە پۆرترێتێك‌دا هەیە هەمان ڕەنگ لە دیمەنێكی سروشتی‌دا دەبینین كەڕەنگەكانی زۆرە . ئەو كەسەی پۆرترێتێك دەكات پێویستە ئاگاداری ئەو ڕووناكی‌یە بێت كەدەكەوێتە سەر دەموچاو ، چونكە ڕووناكی كاردەكاتە سەرگۆڕینی ڕەنگەكانی دەموچاو . بۆیە پێویستە ئاگاداری مەسەلەی تێڕوانینی هێڵ سازی (المنظور الخطي) و تێڕوانینی ڕەنگ سازی (المنظور اللوني) بێت‌و ئاگاداری (تدرج) لەڕەنگەكانداو ڕێژەو (التشريح) بێت كەئەمانەو هەندێ شتی تریش وا لە پۆرترێتەكە دەكەن سەركەوتوو بێت ـ ئەم تێبینیانە هیچیان لای (حمە سەعی) ڕەچاو نەكرابوو ، وەپۆرترێتە كە تاڕادەیەكی زۆر تێیدا سەر نەكەوتبوو .

لەتابلۆی (پشتێردا) سەركەوتنێكی باشی هونەری بەدەست هێناوە ئەویش بەو دارشتنە واقیعی‌یە كە زیرەكانە هەڵس‌و كەوتێكی باشی لەگەڵ ئەو فیگەرانە دا كردووەو توانیویەتی جووڵەیەكی چاك بەتابلۆكە بدات‌و پەیوەندیەكی دینامیكی لەنێوان فۆرمەكاندا دروست بكات‌و بەزیرەكی ڕەنگ بەكاربهێنێ‌و بەپێی ئەو ڕووناكی یەی پشتی پێ بەستووە هارمۆنیەت لەنێوان فۆرمەكان‌دا دروست دەكات . لەتابلۆی (سەفەر بەلك) دا لە دانانی دارشتنە نیو بازنەیی یەكەی دا سەركەوتوو بوو . توانیبووی هەڵس‌و كەوتێكی چاك لەگەڵ پارچەدا (الكتلة) بكات . ئەو نرخە تایبەتی‌یەی ئەو ڕووداوە مێژوویی‌یەی بەڕەنگێكی‌وا دروست كردبوو بینەر هەستی دەكرد كەڕووداوێكی كۆنە . بەلام ئەوەی تیابدا سەر كەوتوو نەبوو (ڕێژە)یە . دەبینین ئەو ئافرەتەی منالەكەی لە باوەشدایە منداڵەكە سەری نزیكەی ئەوەندەی سەری ئافرەتەكە دەبێت . لەگەڵ زۆر تێبینی تر كە جێگای باس نی‌یە . لەگەڵ ئەوەش‌دا ئەم ئیشانە ئەوەدەردەخەن (حمە سەعی) توانایەكی باشی هەیەو هونەرمەندێكی لێ هاتووەلە ئیش كردن‌دا . هیوای شتی باشتری لێ‌دەكرێت .

**4 ـ عمر ڕەسول .**

ئیش كردن بەو دووماده كۆنتراستی‌یەی (سپی‌و ڕەش) یەكێكە لەهەرە قورسترین ئیشی هونەریی كە هونەرمەند بیكات . هونەرمەند توانایەكی زۆری دەوێ‌تابتوانێت‌ئەودابەش‌كردنە ئیستاتیكی‌یەی لێ دروست بكات لەتابلۆكەی‌دا . سێ ڕێگە هەیە

لە نیش کردندا بە (ڕەش و سپی) ، یەکەم : پێویستە ڕەشەکە زاڵبێت بەسەر سپی‌یەکەدا ، دووەم : سپی یەکە زاڵ بێت بە سەرڕەشەکەدا ، سێ‌هەم : لەنێوان هەردوکیاندا بێت ، لەم سێ حاڵەتە دا دەست ڕەنگینی باشی پێویستە بۆ ئەوەی هونەرمەند لەگەڵ ئەو ڕووە پانەی تابلۆکەی‌دا بەکار بهێنێت کەئەمەش تاقی کردنەوەیەکی دوورو درێژی پێویستەو هەروا کارێکی ئاسان نی‌یە . (عومەر ڕەسول) ئەورێگەیەی گرتوتە بەر کەبە (ڕەش‌و سپی) ئیش بکات‌و خۆی پێوە خەریك کردووەو ئیشەکانی پێ بەرهەم دەهێنێت . لە تابلۆی (بەرگری)دا ئەو ڕوو پێوە سپی یەی لای چەپی تابلۆکەیەوە بەکاری هێناوە بەهێڵێکی جیاکەرەوە دای پچڕاندوە ، ئەمەش نەشازی‌یەکی بە تابلۆکە داوە هەر هەمان هێڵ دووبارە بوتەوە لەنێوان فۆرمێك‌و فۆرمێکی تردا ، بوتە هۆی ئەوپچڕاندنەی (قطع) کە بینەری تووشی بێزاری‌و پچڕاندنی جووڵەی ناو تابلۆکە کردووە . لەگەڵ ئەوەش‌دا تەکنیکی ئیشەکەی لەسنوورێکی دیاری کراودایە ، نەیتوانیوە پەیوەندیەکی ئیستاتیکی چاك لەنێوان پێك هاتوو (تکوین)و هێڵ‌و ڕووپێودا پەیدا بکات . دابەش کردن بۆ ڕووپێوە ڕەش‌و سپی‌یەکان بەلەنگی بەکاری هێناوە . لەگەڵ ئەوەش‌دا (گوێزان)ی وەك پێك هاتوویەك لەتابلۆکەی‌دا بەکار هێناوە کەبە شێوەیەکی نەشاز سنوورێکی بەهێڵی ڕەش بۆ گوێزانەکە کردووەو لەئیشەکەدا زەق بووە ، بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندیەك هەبێت لەگەڵ هەوای گشتی‌ی (جو العام) تابلۆکەو ئەوپێك هاتووە بگرە بووەتە وونکردنی گەورەترین بنەمای سەرکەوتنی تابلۆ ئەویش یەکەیە (وحدة) . لەتابلۆی (زیندانی)دا ئەو هێڵە پان‌و درێژە ڕەشانەی کە بۆ شیشی زیندان بەکاری هێناوە لەگەڵ ئەو وورده کاریانەی ناو تابلۆکە هیچ پەیوەندیەکی پەیدا نەکردوەو بوەتە هۆی لاسەنگ کردنی هاوسەنگێتی تابلۆکەو نەشازیەکی زۆر زەقی پێوە دەرکەوتووە . ووردەکاریەکی زۆری لەلای‌چەپی تابلۆکە کردووەو لەلای ڕاستەوە بێزار بووەو بەتەکنیکێك ئیشەکەی تەواو کردوە ، دانانی ئەو ڕو پێوە سپی‌یە لەلای ڕاستەوە بەبێ هیچ گرنگی پێدانێك‌و دانانی ڕووپێوکی ڕەش کەئیشەکەیان لاسەنگ کردووە . ئەم تێبینیانە لەئیشەکانی تری (عومەر)دا دووبارە دەبنەوە . (عومەر) پێوسیتی بەتاقی کردنەوەیەکی بەردەوام هەیەو بەشێوەیەکی چاکیش لەئیشەکانی هونەرمەندی مەزن (ئیسماعیل خەیات) ووردبێتەوە کە زۆر کاری لەئیشەکانی ئەم کردووە چونکە ئەودابەش کردنەی (خەیات) بۆڕەش‌و سپی هەتا ئێستا کەم کەس توانیبێتی بیکات .

5 ـ ئازا حەسیب .

مەسەلەی زیرەکی لە (ئەکادیمیەت) و (کلاسیکیەت) گەورەترین مەسەلەیەکە سریالی‌یەکان خۆیان پێ بەستوتەوە لەپێناوی بەرهەم هێنانی ئیشی ووردو دیراسی بۆ ناوەرۆکێکی سریالی . دەبینین زۆر لەتەکنیکی فوتوگرافەوە نزیك دەبنەوە کەئەمەش لەئیشەکانی (دالی) و (مارگریت)دا بە شێوەیەکی ئاشکرا دیارە ـ ئەو هونەرمەندەی کە ئەم ڕێبازە لەگەڵیدا ڕێك دەکەوێت پێویستە شارەزایی‌یەکی باشی لەئەکادیمیەت‌دا هەبێت‌و ئەم قۆناغەی بەباشی بڕی بێت ، ئەگینا لەئیشەکانی‌دا سەرکەوتوو نابێت . (ئازا) ڕێبازی سریالی‌ی گرتووە بێ‌ئەوەی هیچ ئاگایەکی لەڕێبازی ئەکادیمیەت دا هەبێت کەئەمەش بووەتە هۆی سەرنەکەوتنی لەئیشەکانی‌داو نەیتوانیوە بەسەر مەسەلەی ئەکادیمیەت‌دا زاڵ بێت .

لەتابلۆی (لەبوونەوە تامەرگ)دا هاوسەنگێتی تابلۆکە ناتەواوە ئەویش بە بەکارهێنانی ڕووێتکی شینی کاڵ لای چەپی تابلۆکەو ویستویەتی لەو سەری تابلۆکە هاوسەنگێتی بداتێ ئەویش بەبەکارهێنانی چەند هێڵێکی زەرد بەشێوەیەکی زەق کە نەیتوانیوە سەرکەوتووبێت تیایاو تابلۆکەی لاسەنگ کردووە ، هیچ پەیوەندی‌یەك نی‌یە لەنێوان ئەو پێکهاتووە ڕاستەی تابلۆکە





لەگەڵ پێکهاتووەکانی تری تابلۆکەو بووەتە هۆی دابڕانێکی تەواوی پەیوەندیی گشتی تابلۆکە . بێجگە لەوەی ئیشەکە بەشێوەیەکی ئاتەبا تەواو بووەو نەیتوانیوە ئەو پەیوەندییە ئیستاتیکی‌یە لەنێوان پێك هاتووەکان و ڕەنگ پەیدا بکات . جگە لەوەش نەیتوانیوە بە سەر فۆرمەکانی ناو تابلۆکەدا زاڵ بێت

لە تابلۆی (پەردە لەڕوو هەڵاڵین)دا ووردە کاریەکی زۆری لای چەپی تابلۆکە کردووەو چڕو پڕی کردوون . بەڵام لای ڕاستی تابلۆکەی بە دوو پێکهاتوو یان سیان تەواو کردووە کە بووەتە هۆی لاسەنگ کردنی ئیشەکەو لای چەپی بەتەواوەتی لاسەنگ بووە ئەویش ئەوپێك هاتووە زەردەی دایناوە خستوویەتی بەلای چەپی‌دا . (ئازا) لەزۆربەی ئیشەکانی‌دا داپچڕاندنێکی زۆر هەیە لەنێوان پێك هاتوویەك و ئەوی‌تردا كە ئەوەش بووەتە هۆی وون کردنی یەکە(وحدة) و زۆربەی ئیشەکانی بەلای چەپدا لاسەنگن لەتەواو کردنی‌دا یان هیچ چارەسەرێکی هونەری بۆ نەدۆزیوەتەوەو زۆربەی ئیشەکانی لەمانگی (7) و (8)دا تەواو کردووەو بە شێوەیەکی ئاشکرا پەلەی پێوە دیارە کە بە تایبەتی بۆ ئەم پێشانگایە کراوە . بەڵام ئەو تابلۆیەی ئازا تیایا سەرکەوتوو بوو (تێك شکاندن لەداقیدی ئەنجیلۆ) بوو کە بە شێوەیەکی هونەریی چاك هەڵس و کەوتی لەگەڵدا کردبوو . بەڵام لەمیشدا هەر دابڕانێك هەبوو لەنێوان دەست و سەرەکەدا نەشاریەك هەبوو کە چاوی بینەری لەجووڵە دەخست . ئەمانەو هەندێ تێبینی‌تر . لەگەڵ ئەوەش‌دا (ئازا) خاوەنی هەستێکی سریالی باشە ئەگەر بێتوو زیاتر لەمەسەلەی ئەکادیمیەت‌دا قووڵ بێتەوە .

**6 ـ عەبدول کەریم ڕەشید ـ خالید ڕەسول .**

لەئیشەکانی (عەبدول کەریم)دا لەڕێبازی ئیمپرێشنیزم (الانطباعية) نزیك دەبێتەوەو هەندێك جار لەڕێبازی ڕیالیستی خۆی دەدۆزێتەوە . ئیشەکانی هەستێکی چاکی بەرامبەر بەڕەنگ تیایە . بەڵام هەندێکیان زۆر سەرەتایی‌یە لەتەواو کردنی‌دا لەگەڵ وەرگرتنێکی زۆر لەئیشی هونەرمەندە ڕووسیەکان وەکو ئەو فیگەرەی لەتابلۆیەکی‌دا دەموچاوی دەشوات . لە بەکارهێنانی ڕووناکی‌دا سەرنەکەوتووە . لەتابلۆی (دیمەنێك)دا کە دەزانیت ڕووناکی‌یەکی سرووشتی‌نی‌یە لەهەموو لایەك‌دا ڕووناکەو هیچ سێبەری تیانی‌یە ئەمەیش ڕێك ناکەوێت لەگەڵ ئەو ڕووناکی‌یە سروشتی‌یەی کە دەکەوێتە سەرتەنێك . هەموو شتێکی ئەوتەنە ڕووناك ناکاتەوە بەڵکو بەشێکی ڕوناکەو بەشەکەی‌تری دەکاتە سێبەر . ڕێژەکانی زۆربەی تەواونین‌و گرنگی نەداوە بە دانانی سووچ‌و مەودای ڕەنگ بەپێی ئەو سووچ‌و مەودایە لەگەڵ ئەوەشدا (عەبدول کەریم) هیوای ئیشی باشتری لێ دەکرێت .

لەئیشەکانی (خالید) بە شێوەیەکی زۆر سادەیی بەرهەم هێنراون‌و ئەو ئیشانە زۆربەیان شایانی ئەوەنین لەپیشانگایەکی هونەری‌دا پیشان بدرێت وەکو ئەودیمەنە بچووکانەی کەکردبووی لەسلاید دەچوو هەندێك ، شتی‌تر کەبەرامبەر تابلۆکە دروست دەبوون کە هەستت ئەدەکرد تابلۆیەکی هونەری دەبینیت هەڵس‌و کەوتێکی تارادەیەك سەرکەوتوو لەهەندێك ئیشی‌دا لەگەڵ دەموچاودا کردبوو خالید لەمێژە ئیشی هونەری دەکات‌و تائێستا دوو پێشانگای هونەریی کردوەتەوەو لەزۆر پێشانگادا بەشداری کردووەو چاوەڕوانی شتی زۆر چاکمان لێدەکرد نەك ئەو ئیشانە

تاقی‌کردنەوەیەکی چاك بوو کە کۆمەڵە لاوێکی هونەرمەند لەم پێشانگایەدا یەکیان گرتبۆوە . توانای هونەری خۆیان‌و ڕێبازی تایبەتی هەریەکەیان بووبوە هۆی گفتوگۆکردنی‌و لێدوان .

خالد رسول

# گۆرانی

# «عەزیزم بەیانی»

●

هەڵبەستو ئاوازی : فۆلکلۆری
ئامادەکردنی : ووریا ئەحمەد
گوتنی : گۆرانیبێژی خوا لێخۆشبوو
«ئازاد کەریم»

●

● گـۆرانی بێـژی جـوانـەمـەرگ «ئـازاد کـریم» لە دەوروبەری ڕۆژی 1955/10/3 لە گەرەکی «تعجیل» لە هەولێر لەدایك بووەو لە ڕۆژی 1978/12/9 بە کارەساتێکی (دڵتەزێن سـەری نایـەوە ، شایـانی باسـە کە ئـەم گۆرانی بێـژە جوانەمەرگە تەنها گۆرانییەکی تۆمارکردووە ، ئەویش لە ساڵی 1977 دا .

عەزیزم بەیانی کە گوڵ عەتری دەڕێژی
کە بولبول دەناڵێ کە سۆفی دێنە نوێژی

* * *

لە کونجی قەفەس دام بەسەد ناڵە دەخوێنم
هەناوم نەماوە لەبەرچی نایە شوێنم
لە هیجرانی و یصالت لە دەوری خەتو خاڵت
هەتا هەم دەخوێنم، دەناڵێنم ..
هەتا نێو گوڵی خۆم وەدەس دێنم
خەزێمێ، خەزێم گیان، لەبەرچی نایە شوێنم
لەبەر چاوی جوانت، لەبەر جەرگی بەخوێنم
عەزیزم .....

* * *

گوڵو لالە پشکوت، دەور دەوری گوڵانە
گوڵی من دەپشکوێ، بەهاری دوو دڵانە
کە بولبول دەناڵێ دەڵێ کوا گوڵی سوورم
هەناوم نەماوە، دەمێکە لەتۆ دوورم
دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە، بەهاری دوو دڵانە
کە بولبول دەکا ڕازی، دڵداری
لەگەڵ کۆنە یاری، جەفا کاری
بەهارە عەزیزم، بەهاری دوو دڵانە
کە بولبول دەخوێنێ لەسەد ـ پەلکی گوڵانا
عەزیزم ...

* * *

*ئەم گۆرانی یە لە ساڵی 1977دا، بە یارمەتی تیی هونەری هەولێر بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار کراوە ..



**نووسینی : عمر عبدالرحیم**

# ساواو لانك و مۆزیکا

دەستە مەلەرزە ، پێنووسی مەزن یارمەتیم بدە بام لەسەر رووپەڕەی پاكو بێگەردی گۆنا ئاسـای ساوا لەم سێ ووشـە پیرۆزە ڕستە بـەرمووریـێك لەدەنکە گێـلاسو گۆیـژە زەردەو قەزوانی شینو ئالە بەلاڵووك بهۆنینەوەو لانکـەی ساوای پێ برازێنینەوە ، ئەوساوایانەی چ نێر بن چ مێ کەگـەورە بوون خۆیان ئەکەنە کۆڵەگەو نیرگە بۆ دارەڕای دیواخانی ژیان .

نامەوێ زۆر لەسەر گرنگی ساوا بدوێم ، لەزۆر نووسینی تردا بە درێژی باسیانم کردوەو لێـان دواوم تەنیـا ئەمـەندە ئەڵێم :

**ساوا گولوکەی باخچەی هیوایە**
**مژدەی خۆشبەختی گەلی لەدوایە**
**بۆیە دواکەوتوو ، حاڵمان ئاوایە**
**بەخێو کردنی ساوا ساوایە**
**منال بولبولو نیشتمان چل بێ**
**هیواو ئاواتیش گەیین بەگوڵ بێ**
**سامەرجە منیش گول بەخێوکردن**
**خولیای سەرمبێ تارۆژی مردن**



لانك ئەوچەند تەختە خڕو پانکەڵە بەفەڕەیە کـەساوای لەناودا پەروەردە ئەکرێو هەر لەوێشدا فێری ئنگائنگاو گفەو کڕو کاڵ ئەبێ ، زۆر جاریش بەدەم فریشتەی ژیانەوە دەم پان ئەکاتەوەو بزە ئەی گرێ ، یان لچە جوانەکەی هەڵ ئەهێنێتەوەو هەنسك ئەدا هەر وەکو بڵێ : ژیان پێکەنینو گریانە . ئای لەو دیمەنە جوانە کەدایەی دڵسۆز لەناو لانکەدا ساوا تێرشیرئەکاو دوای تێر بوون ئەو شیرە پاکو بێگەردە سۆلاوگە ئەبەستێ بۆ ژێر چەنەو غەبغەبەی خڕینو ، بەجۆرێك ئەی نەخشێنێ «هەتا بـەرگێ سپی بەفـرین ، لەگەڵ بـالای دایكو بـاوکا ، خـۆی ئەپێوێ ، ئەو دیمەنە ، لەیاد ناچێو ، لەبەر چاوە»

گومانی تیانییە کەباوكو باپیرانی ئێمە لەوکاتانەدا کـە پسپۆڕ بوون ، واتە پەزگەلو ئاژەڵو چـارەوێیان پـەروەردە کردوەو ، گەرمیانو کوێستانیان کردووە ، منالەکانیان ئەخستە کۆڵوانەکانی خویانو ، بەکۆڵی خۆیـاندا دایان ئـەبەست لەم بارگە بۆ ئەو بارگەو لەم هەوار بۆ ئەو هەواریان دەبردن ، بەلام کە هەندێکیان نیشتەجێ بوونو خانوو بەرەیان دروست کـرد فێری ئەمە بوون لەترسی مارو مێروو منالەکانیان لەناو لانکەدا بخەوێنن .

ئەزانم ئێستا هەندێك کەس ئەم پرسیارەی بەخەیاڵدا دێتو ئەڵێ :

- باشە ئەی لەکاتێکدا کەباوكو باپیرانی ئێمە ڕەوەند بوون بەشەو منالە ساواکانیان لەکوێ دەخەواند ؟

- ئەگەر منالەکەیان زۆر ساوا بوایە ، کۆتکە دارێکیان لەباری درێژی بەتەور تۆزێ چاڵ دەکردو پەڕۆو پاتالیان بۆ ڕادەخستو لەوێدا دەیان خەواند ، بە شەوانەش هەرکاتێ منالەکە بگریایە دایك ، یان باوك کوتکە دارەکەیان چەند جارێك دەجوولانـدو منالەکە خرپ خەوی لێ دەکەوتەوە ، لانکیش لەمـەوە پەیـدا بوو .

جۆرەکانی لانک ، وەیان لانکە :

بەبیرەوەری خۆم کەتەمەنم شەست و سێ ساڵە دوو جۆر لانکەم بینیوە :

١ - لانکی سادە : ئەمە چینی هەژارو کەم دەست دەیان کڕی و منالەکانیان تیا دەخەواند .

2 - لانکی خرخاڵدار : تایبەتی بوو بۆ دەولەمەندو دەست ڕۆیشتووان ، ئەو وەستایەی کە لانکی خرخالداری دروست دەکرد پێش ئەوەی تەواوی بکا دەی هێنا دەسکەکەی سەرەوەی لەچەند بازنەیەکی لەتەختە دروستکراو هەل دەکێشا ، ئەوسا بەم سەرو ئەو سەری کەمەی لانکەکەوە دەسکەکەی سەقام گیر دەکرد ، بەرەنگی زەردو سوورو شینو کەسک لانکەو بازنەکانی ئەنەخشان ، کاتێك کەلانکەکە ڕادەژەنرا بازنە لەتەختە دروست کراوەکان دەهاژان و هاتو چۆیان دەکرد ، جۆرە مۆزیقایەك پەیدا دەبوو مەگەر هارەی هەیاسەو کەمەرەی ژنانی جاف و گەورە کچانی مۆریاس ئەو ئاهەنگەیان بگێڕایە ، ساوای ناو لانکەی بەدەستەرازەی گورزە هۆن بەستراویش بەدەم ئاوازی ئەم سازو سەمتوورەوە پێلووی چاوە گەشەکانی لەیەك دەناو دەچووە ناو عالەمی خەوی سروشت کردەوە هەندێ لەدایکانی بەسەلیقەش کەدەستەلاتی بێشکەی خرخالداریان نەبوو دەیانهێنا چەند گوێزێکیان دەسمیو لەکشتە کێکی قایمیان هەلدەکێشان ، ناوبەناو چەند دەنکە موورووێەکی شینیشیان دەخستە میانەی گوێزەکانەوە ، ئەوسا هەردوو جەمسەری کشتەکەیان بەم سەرو بەوسەری لانکەکەوە دەبەست ، لەکاتی ڕاژندندا ئەم گوێزو مووروانە بەجۆرێکی ڕێك و پێك بە ڕاستو چەپدا دەهاتن و دەچوون ، ساواکەش بۆیان دەخنایەوە هەتا فریشتەی خەو دەبوو بەمیوانی چاوە جوانەکانی و دەرابەی پێلووەکانی پێ دادەدایەوە .

خۆکە ئاوازی لایە لایەی دایکانی جگەر سۆزو خوشکانی میهرەبان تێکەل بەم خرو هورە ئبوون نەك ساوا گەورەشیان خەو لێ دەخست و شەکەتی و ماندوێتی یان دەرەواندەوە وەنەبێ هەر خرو هووری لانکەو لایەلایەی دایك مۆسیقای منال بن : هارە هاری ئاو ، ڕمە ڕمی بارانی ژێر دەواران ، بارە باری مەڕ ، قارە قاری بزن ، جریوە جریوی چۆلەکەو مەل ، قاسپەی کەو ، عوو عووی کەلەباب ، گمە گمی کۆترو گەلێك دەنگی تریش هەن جۆرە مۆسیقایەکیان تێدایە کە منال بە پەرۆشەوە حەزیان لێدەکات .

وا ئەزانم ئێستایە لەتەمەنی دەساڵیدا بووم کە کارەبا هێنرا بۆ سلێمانی لەباخی پوورە بەگی لەنزیك مزگەوتی هەمزاغاوە بەرامبەر قەلەندەرخانەو چاپخانەکەی پیرە مێردی شاعیر جێگایان بۆ ساز کردبوو . ئەو ئێوارەیەی بڕیار درا بوو بکەوێتەکار ژن و پیاو و کوڕو کالێکی زۆر دەورەی شوێنەکەیان دابوو ، کاتێك کە کەوتە گەڕو گولۆپەکان داگیرسان گرمە گرم و ڕمە ڕمەکەی مۆسیقایەك بوو :

«ڕم ، ڕم ، ڕم ، ڕم ، ڕم ، ڕم»

پاش ماوەیەك زوربەی منالان بەباوەشی دایکیانەوە تەکە تەك ملیان لار بوو بووەوە بەدەم ڕمە ڕمی ئاشی عەلە تریکەکەوە خەویان لێکەوتبوو ، زۆر جار لەدراوسێکانی ئەو ناوەشم ئەبیست ئەیان ووت :

- ئەو شەوانەی کەگرمە گرمی مەکینەکە نەیەتو یەکی پکەوێت منالەکانمان خەویان دەزڕێ و تابەرە بەیان ئەم دیوو ئەو دیو ئەکەن .

---

لە ئەدەبی فۆلکۆری کوردیدا

طارق غفور منتك
هەولێر

دەچمە بەر بیرایێ
ئەو بێرایێ بە شینێ

نازدارەك دانیشتی یە
بەپێی لانکێ دەژینێ

لای لای بۆ کوڕی دەرێ
خەمان پێ دەڕوینێ

بسك و پەرچەمی سوورە
خەنەی لێ دەوەرینێ

خەزێمەك لە کەپووی دا
بەشەی بسکان دادێنێ
ئاکرێ و ئامێدیان دێنێ
ئەوەی یارم دەخوازێ
خێر لە جوانی نەبینێ

# ڕوونکردنەوەیەك

○

مەغدید حاجی

هەولێر

○

لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (کاروان)دا کە تایبەتی بوو بۆ شانۆ شانۆگەریەك بۆ منداڵان بە ناونیشانی (دارستانێکی تێنوو) بڵاوکراوەتەوەو لە سەری نووسراوە چیرۆکی ناصریوسفو ئامادەکردنی بۆ سەر شانۆ سەباح عەبدولرەحمان . لە کۆتایی شانۆگەریەکەشدا ئەم تێبینییە تۆمارکراوە : «چیرۆکەکە بە عەرەبی نووسراوەو ناوی رووبارێکی مەزن ە» .

لەبەر ئەوەی ئێمەیش ئاگاداری بنچ‌وبناوانی چیرۆکی ئەم شانۆگەرییەین کە چیرۆکێکی فۆلکلۆری میللی سۆڤیتییەو مامۆستا ناصر یوسف داویتییەپاڵ خۆی . منیش لە پێناوی پاراستنی ناوو پایە بەرزەکەی گۆڤاری (کاروان) کە بابەتەکەی بڵاوکردوٚتەوە .. هەروا لە پێناوی ئەمانەتی ئەدەبیدا ، بە پێویستمان زانی ئەم ڕوونکردنەوەیە لە چەند خاڵێکدا بخەینە پێش چاوی خوێندەوارانی بەرێز :

یەکەم : لە هاوینی ساڵی 1974 دا مامۆستا ناصر یوسف بە عەرەبی چیرۆکێکی لە ئەدەبی فۆلکلۆری سۆڤیتییەوە بۆ رۆژنامەی (طریق الشعب) ئامادەکردبوو .. ئەم رۆژنامەیەش لەو ساڵەدا لاپەرەی منداڵانی نەبوو ، چیرۆکەکەش بۆ منداڵان دەشیا ، بۆیە بە نیازی بڵاوکردنەوەی بە کوردی بە (بیری نوێ)ی سپارد .

ئێمەیش بەوکاتەدا وەکو وەرگێڕێکی یاریدەدەر لە بیری‌نوێ دا کارمان دەکردو وەرگێڕانی چیرۆکەکەمان پێ‌راسپێردرا کە بە ناونیشانی [کیف جاءت داوچاقا الی الدنیا] بوو .

جا لەبەرئەوەی چیرۆکەکە لە بنەڕەتەوە لە ئەدەبی فۆلکلۆری سۆڤیتییەوە وەرگیراوە وەرگێڕدراوە ، کاك ناصریش هەروەکو لە کاری رۆژنامەگەری دا باوە نە دەقە ئەصلییەکەی لە گەڵدا رەوانەکردبوو نە ناوو ژمارەی ئەو گۆڤارەی کە بابەتەکەی لێوە ئامادەکردبوو ، بەلکو تەنیا نووسیبووی [حکایة من الفلکلور الشعبي السوفيتي] . بۆیە بریار درا بێ ناوهێنانیکەس بە ناوی رۆژنامەکە بڵاوبکرێتەوە ، تەنیا لە پەراوێزەکەیدا نووسیمان کە [لە ئەدەبی فۆلکلۆری میللی یەکیەتی سۆڤیەتەوە کراوە بە کوردی] .

بەم شێوەیە چیرۆکەکە بە ناوی [چۆن داوچاقا هاتە دنیاوە] لە ژمارە (113)ی رۆژنامەی (بیری نوێ) دا لە ڕێکەوتی 1974/9/15 دا بڵاوکرایەوە .. دووای ئەمەش مامۆستا ناصر یوسف هیچ گلەییو رەخنەیەکی دەربارەی شێوەی بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکە نەبوو .

دووەم : لە رۆژانی دووەمین میهرەجانی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لە هەولێرو بە ئامادەبوونی مامۆستا محەمەد تەیمور کاك سەباح عەبدولرەحمانمان بینیو سەرگوزشتەی چیرۆکی شانۆگەری (دارستانێکی تێنوو)ی بۆ گێڕاینەوەو گوتی :

«ئەوەی من لە کاك ناصر یوسف م وەرگرتووە تەنیا بریتییە لە چیرۆکێکی عەرەبی دەستنووس بە ناوی (حکایە النهر العظیم) و لە قەوارەی سێ وەرەقەی فولسکاب دایە ، کەچی من خۆم

(واتا صباح) لەبەر رۆشنایی ئەم چیرۆکە شانۆگەری (دارستانێکی تێنوو) م نووسی و لە (کاروان) دا بڵاوم کردەوە .. هەر لە سەرەتاوەش گومانم هەبوو کە ئەم چیرۆکە لە نووسینی ناصر یوسف بێت ، بەلام ئەو پێی لەسەر ئەوە داگرت کە چیرۆکی خۆیەتی و دەیشبێ بە ناوی ئەو بڵاوبکرێتەوە ..» .

کاك سەباح دەقی ئەم چیرۆکەی بۆ هێناین کە بە دەسخەتی مامۆستا ناصر یوسف بە عەرەبی و بە ناونیشانی (حکایە النهر العظیم) نووسراوەتەوە ، ئێمەیش کە ئەم دەقە عەرەبی یەمان لە گەل دەقە کوردی یەکەی خۆماندا بەراورد کرد کە لە ژمارە 113 ی (بیری نوێ) دا بڵاوکراوەتەوە بۆمان دەرکەوت کە ماڤ ناصر یوسف بەسەر ئەم چیرۆکەدا تەنیا ئەم چەند خاڵەن : 1 ـ لە کاتی خۆی لە گۆڤارێکی سۆڤێتی بە عەرەبی ئامادەی کردووەو ئامادەکردنەکەیشی لە وەرگرتن یا لە وەرگێڕان دەچێت . 2 ـ ناونیشانەکەی گۆڕیوە . 3 ـ تەنیا دوو دێڕی بۆ زیاد کردووە کە ئەویش پەیوەندی بە ناوهێنان و دەوری گورگەوە هەیەو کە گوایە ئەویش هاوکاری لە گەل باڵندەو درندەکان کردووە بۆ هەڵکەندنی رووبارەکە ! ، ئەمەیش چیرۆکەکەی دەوڵەمەند نەکردووە بەڵکو بە پێچەوانەوە . 4 ـ بۆ ئەو باڵندەیەی کە هاوکاری لە گەل باڵندەو گیانلەبەرەکانی تردا نەکرد لە هەڵکەندنی رووبارەکەو تەمبەڵ بوو ئێمە (دوڕنا) مان بەکارهێناوە بەلام کاك ناصر چووە بولبولی بەکارهێناو کەچی بولبول باڵندەیەکی رەزاسووك و خۆشخوانەو وەك هێمایەك بۆ ئەم دەورە ناگونجێت . 5 ـ لە جیاتی (داوچاڤا) کە ناوی رووبارەکەیەو دیاریشە کە ناوێکی سۆڤێتی یە ئەو لە هەموو شوێنێکدا تەنیا وشەی رووباری بەکارهێناوە .

سێیەم : لە ژمارە 1388 ی رۆژنامەی (العراق) دا کە لە ریکەوتی 1980/9/15 دا دەرچووە ، ناصر یوسف روونکردنەوەیەکی دەربارەی شانۆگەری ! بەناو (حکایة النهر العظیم ـ چیرۆکی رووبارێکی مەزن) بڵاوکردۆتەوە کە گوایە لە دانانی خۆیەتی بەلام سەباح عەبدولرەحمانی دەرهێنەر لێی دزیوەو بە نووسینی خۆی لە قەڵەمداوە ..
هەروا لە روونکردنەوەکەدا نووسیویەتی و دەڵێ کە «(چیرۆکی رووبارێکی مەزن) رۆشنایی دیوەو وەکو بابەتێك بڵاوم کردۆتەوە .» بەلام بێ ئەوەی ناوی ئەو بڵاوکراوەیە بێنێت کە لێی بڵاوکردۆتەوە .

دیسان ئێمەیش لەبەر رۆشنایی ئەم روونکردنەوەیە هەقمانە چەند پرسیارێك ئاراستەی مامۆستا ناصر یوسف بکەین : 1 ـ ئێوە کە شانۆگەریەکتان !! دانابێت و بە ناوی خۆشتان بڵاوتان کردبێتەوە چۆن یەکێکی تر دەتوانێ بە سووك و ئاسانی لێتانی زەوت بکات ؟ . 2 ـ ئەمجارەیان چۆن لەگەل کاك سەباح عەبدولرەحماندا رێککەوتوون کە هەمان بابەت لە گۆڤاری (کاروان) دا بە ناوی (دارستانێکی تێنوو) بڵاوبکەنەوە ؟ بەلام سەیرە کە نە نووسراوە شانۆگەری یەکە لە دانانی ئێوەیە هەروەکو ئەمەتان لە روونکردنەوەکەدا بە نارەوا راگەیاندووە بەڵکو ئەمجارەیان نووسراوە (چیرۆکی ناصر یوسف) !! ، کەچی لە راستیدا هەروەکو روونمان کردەوە چیرۆکەکەش لە نووسینی ئێوە نی یە .

چووارەم : لە بەر تیشکی ئەم خاڵانەی سەرەوە بە رای ئێمە سەباح عەبدولرەحمان ماڤ ئەوەی هەیە کە خۆی بە نووسەری شانۆگەری (دارستانێکی تێنوو) دابنێت بە مەرجێك پەنجە بۆ سەرچاوە بنەرەتیەکە رابکێشیت کە چیرۆکێکی فۆلکلۆری میللی سۆڤیتی یە بە ناونیشانی (چۆن داوچاڤا هاتە دنیاوە) ، هەر وەکو باوە لە رووی کەڵك وەرگرتن لە کەلەپووری خۆماڵی و بێگانە بۆ نووسینی هەر بابەتێکی ئەدەبی . لەگەل ریزمان بۆ هەموو لایەك .

# سڵاوێ

# دە ووشە

فاتیمە گەرمیانی

کەرکووک : 19 / 2 / 1982

# بۆ ئەوکەسەی خۆشم ئەوێ

احمد محمد محمد امین
حریر

ئەی ئەو کەسەی،
لە یەکەم هەنگاوی کاروانی شەوا
خۆشمویستی ...
تۆ ئەو کەسەی،
پریسکەی خەونەکانم دەکەیتەوە .
تۆ ئەو کەسەی،
گرەو لە تاریکی شەوگاری ژین دەبەیتەوە
تۆ ئەو کەسەی فێرت کردم،
کە کام شەوە،
بۆنی ژوانی شەوی لێ دێ
تا ژوانەکەم نەبڕێتەوە ...
تۆ ئەو کەسەی فێرت کردم،

له تابلۆ تەلخو تەماوی‌یەکە گیرسایتەوە ؛ ویستت خۆتی ر گێل بکەی . ئەلبوومەکەت دووتوێ کرد ، لەوێنەکان وورد بوویتەوە ؛ بەلام تابلۆکە وەك قیروزفت پێتەوە نووساوە ؛ لێت جیا نابێتەوە . سەرنجێکی ئەو دیو پەنجەرەکە دەدەیت ، تارمایی‌یەکی ڕەش‌و تاریك دەهات‌و دەچوو . تازە ، کار لەکار ترازاوە .. مێردەزمەکە پێت ئاشنابووە . بەلێ منیش دەزانم ، ئاخەریکە دوولەت دەبی . شەوێش لە ئاسیاوێکی بێ‌ئاودا دەگەڕێ . دەتۆش بدوێ [هەر بە منالی گرەویان دەکردەوە .. کە دەشبەرسی ... ؟ خۆ نالێم بیر لە شەیتان‌و جنۆکەو شەولەبان دەکەمەوە] وا بەسەری پشتتەوە وەستاوە ، دەیەوێ چەپۆکێکی قورس بدات بەسەرتا ، ئەوسا دەس بەجێ شێت دەبی ، لە وانەشە دەمت گێڕ بێ ، ئێدی نە دەرمان‌و نە پزیشك ناتوانن چارەسەرت بکەن . [خاتەی ژن حەمە مەلا بۆ ئەم مەبەستە ، شەوێك تاقی تەنیا لەسەر قەبران ڕۆژی کردەوە ، کە چوونە سەری ، دلی تەقی‌بوو ...] .

بڕوامەکە بەم زووانە بێنەوە .. لەوانەشە هەر نەیەنەوە . ڕادیۆکەت لە ئامێز گرت ؛ بەدووی ئێزگەیەك دەگەڕێی وەك خۆت باس لە کلۆلی ... بیرۆکەیەکی سێکسانە دێ بە لەشتا . دەترسێی . بەخۆت دەلێی : دەلێن هەموو مالێك فریشتەو جنۆکەی تێدایە .

[ئێستا چی وای لێکردووم بیر لە ئاوەدانی وا بکەمەوە] . بیرۆکەکەت جماندە نەبوونیەوە . سەرهەلدەبڕی . تابلۆ تەلخو تەماوی‌یەکە وەك ئەوەی بە بزمارێ بەسەر پۆپەی لووتتدا هەلواسرابێ لێت جیا نابێتەوە ئەمجا هەر بە جارێ بەرەو دەرگای حەوشەکە هەلەت دەبەی . ژاوەژاوی مندالانی گەڕەکەکە دێ بە گوێتدا :

- قبوول ؟
- نەء

قبوول ... قبوو ... قبوو ... قبوو ...و ...

خۆزگە دەخوازی تا دنالان بێن لەسەر تەپلی سەرت یاری بکەن .. چاوشارکێ بکەن ؛ لەپڕ ژاوەژاوەکە کپ دەبێ .. تۆش لە قاوغێکی نادیاردا ، خۆت مەلاس داوە . لەبەرخۆتەوە ئەمەت دەووت

[خۆ گورگیش لە تنۆکێ خوێن دەترسێ . سبەی



دەیئاڵێنمە ڕۆژنامەیەکەوە بە دیاری دەینێرم بۆ ئازادی هاوڕێم] .

مەسەلەکە تابلۆیەك نی یە ... ئەی دارو بەردو شتە تاریکەکان چی لێ دەکەیت . چاو دەگێڕی . ڕووانینت دەچێتە سەر پەنجەرەی ژوورەکەت ؛ پەردەکان دەلەرێنەوە . لەوانەیە ئێستا حەز بە قومێ ئاوی ناو سەلاجەکە بکەیت . مێشکت بووە بە پەپکەی ترس و خۆت ڕاودەکەی ؛ چی دەبێ ئەگەر پاڵەوانانە مل بنێیتە ژوورەوە ... نا ... ئێستا بیر لەو پرسیارە دەکەیتەوە کە هاوڕێ کەت چەند جارێك لێی پرسیوی : جنۆکەش وەك ئادەمیزاد سکوزا دەکەن ؟ !

[کێ ناڵێ جنۆکە منداڵەکان ئێستا یاری بە کتێبەکانم ناکەن ؟ !]

مێشکە هەراسانەکەت مۆڵەتی لێبڕیوی . ئەی ئەگەر بچیتە کنیان و چیرۆکێکی منداڵانەی خۆشیان بۆ بخوێنیتەوە !

[ئەوسا دەبێ لە کۆتایی چیرۆکەکەدا کەڕدێکی تیژ لەناو دڵی خۆمدا بچەقێنم] . دیقەتێکی ئەستوونە ڕووناکەکان دەدەیت .. وادیارە لەکەم دەچن . [ئۆف .. منالانی ئەم گەڕەکە حەز بە ئارەزوویەکی بێتام دەکەن ، بە دار لاستیك سیر دەگرن لەم گلۆپە پرشنگدارانە .. ئەمانیش وەك جنۆکە منداڵەکان ...] . لێرەشدا بیرە مەلۆزماوییەکە دووت دەکەوێ .. ئەگەر پارچە پەڕۆیەکت بدایە بەسەر تابلۆکەدا ، لەوانەبوو ئێستا لە شیرین خەودا ؛ خەو بە ...

لەسەری کۆڵانەکەوە دوو تارمایی عەبا بەسەرو چەند منداڵێك چوون بەیەکدا . قومە ئاوە ساردەکەت گۆڕییەوە بە تف و قووتتدا . سەبووری یەکی تفتت هات بە لەشداو ووردە ترسیش بوو بە ترشەڵۆك .

دوو ئافرەتەکە بێشەرمانە باسیان لە شێخ دەکرد :

- فەرمووی ئاوی نووشتەکەی بەرێ .
- ئێدی سەیران بە هەوەسی تۆ دەبێ .
- ئەی بۆ بەختەکەی تۆ چی فەرموو ؟
- فەرمووی ، بەم زووانە شۆڕە سوارێك لەبەر دەرگاکەت دەگلێ .. تۆش جامێ ئاوی دەدەیتێ .

تۆش بە خۆت دەڵێی : قەیاسەی چەند ساڵێکی تر ئەم شێخانەش لە موتربە کردن دەکەون .

ئێستا وادەی ئەوەیە ماڵە بە لەنجەو لارێکی مەستانەوە بەدەو گەڕەکەکە خلۆر بێتەوە . [خۆزگە لەوێ دەبووم . لەوانەش بوو بۆ جگەرەیەك لای بدایە ... ئای کە حەز بە دووانی دەکەم . لەبەر ئەم هۆیەش بوو بابم ناوی بە خراپە دەبرد . تائێستا ماڵەم نەدوواندووە ، بەڵام هەرکە ماڵەم دەدی حەزم دەکرد پڕ بەدڵ گوێ لە دووانی بگرم . گەنجێکی زۆر قایل بوون بە قسەکانی .. قسەکانی ماڵە هەر لە قسەی ڕووت نەدەچوو .. باسی لە ... بابم هەر کە دەیویست لەوانم دووربخاتەوە ، یەکە ڕاوێژکردنی ئەوەبوو ؛ دەیووت : کوڕەکەم .. دەست بگرە بەکڵاوی خۆتەوە تا با نەیبا .

بەبەر کناری یاد اشتەکاندا شۆڕ بوویتەوە ؛ لەوێ قایلبووی بە ئێستێك کە هەمەوەندەکان کاتێ مەقانیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیان .. ڕەشماڵیان تێدا هەڵدا . بۆ قافلەچی یە ئینگلیزەکانی ئەو دەوروبەرە شلەژان ؟ ڕێڕەوی خۆیان گۆڕی ؟

[ئەی باشە هەمەوەندەکان کوان ، چی یان بەسەرهات ، بۆ وەك جاران ...] بۆ ئەم پرسیارە سبەی لە کتێبەکاندا بگەڕێ .. ئەوان هەموو شتێ دەزانن .

[بەڵام من باسی ئیمڕۆ دەکەم .. خۆناشکرێ پەنا بەرمە بەر ڕۆژنامەکانی ئیمڕۆ] وا چاکە ڤیروسیا بکەی ، ماڵە بۆ ئەم مەسەلەیە بدوێنی .

لەپڕ دەستێ لەسەر شانت گیر دەبێ . تۆش چەواشە دەبی . ئاوڕ دەدەیتەوە ؛ دەبینی کاکتە . ناتپەرژێتە سەر ئەوەی هەواڵی نەهاتنەوەیان بکەی ؛ دەترسێی لەمەسەلەکە گەیشتبێ . وا هاتنە دەرەوەت دەئاڵێتە گۆنای ئاشکرابوونەوە .. ناچار درۆیەکی خنجیلانەی بۆ بکە .

- منداڵان بەردیان تێگرتین ... هاتم ..

کاکت بەبزە خەنەیەك ئاخاوتنەکەت تەواو دەکا . ئەمجا پاڵەوانانە مل ئەنێیتە ژووری ژوورەوە ، بەرەو سەلاجەکەش دەڕۆی ؛ قومێ ئاوی سارد بە مەلاشووتا دەچێتە خوارەوە ؛ هەموو برینە ترساوەکانیش ڕادەماڵێ . لەپڕ گارا لەخەو ڕات دەپەڕێنێ .

- ئای کە خەونێکی مەلۆزماوی و بەترس بوو .

هەر زوو پانتۆڵەکەت لەپێ دەکەی ؛ بەرەو هەواری ماڵە کۆنەکەتان دەکەویتە ڕێ ؛ لەبیرشت دەچێ تابلۆکە بۆ ئازادی هاوڕێت بە دیاری بەری .




لە بیست و چوار سەعاتی شەو و ڕۆژێکدا هەژدە سەعاتی تەنیایی یەکی کوشندە گیانت دەرزی ئاژن دەکات ، تەنیا شەش سەعات ـ یان کەمتر ـ نەبێ .. کە لە ئامێزی خەوندا بە دەیان سیمای هەمەجۆر ئاشنا دەبیت .. لەگەڵیان دەدوێیت و سەما دەکەیت .

زۆربەی کات لە بەردەم ئاوێنەدا بەسەر دەبەیت .. لەخۆڕا دەمێنیت .. لەگەڵ وێنەکەتدا دەدوێیت ، بەڵام وا هەست دەکەیت لەگەڵ دیوی دووەمی خۆتدا دەدوێیت ، تەنیا دیوی دووەمتە لە ماتی ی چاوەکان و قورسی ی پێڵووەکانت دەگات ، بۆیە کاتێک لەگەڵی دەدوێیت .. حەسانەوەیەکی دەروونی ی گەورە ناخت باوەشێن دەکات ، کەیف خۆش دەبیت و وا هەست دەکەیت دێوەزمەی تەنیایی هێدی هێدی لەسەر سنگت لا دەچێت و هەناسە پەنگ خواردوەکانت ڕەها دەکرێن .

گەلێك جاریش لەبەردەم ئاوێنەکەدا دەخنێیتەوە .. دەتەوێ گەر بۆ چەند ساتێکیش بێ .. خۆت و خەم و برینە بەسوێکانت لەیاد بکەیت ، بەڵام هەرزوو خەندە زەردو بێ گیانەکەی سەر لێوت دەوەرێت و دەچیتەوە دۆخی ئاسایی خۆت .

ئەم دەمەو ئێوارەیەش وەك زۆر جاری تر لە خودی خۆت هەڵا تووویت و لەپشت پەنجەرەی ژوورەکەوە نیگاکانت شەقامەکە دەپشکنن .. گیانت بۆتە هەورۆکەو بەسەر هەواری خاڵی ی دەورو بەرە پڕ ژاوە ژاوەکەتەوە لەنگەری گرتووە ، بینینی ڕێبوارە دەم بە خەندەکان بێزارت دەکات ، لەنێوان چوار دیواری ژوورەکەدا هەستی نامۆیی یەکی سەخت وەك تەمێکی

چڕ لە دڵتەوە ئاڵاوە ، دەنگێك لە ناختەوە ڕازەكانی دەروونت ئاشكرا دەكات ...

« ئای لەم چارەنووسە نالەبارە .. دەبێ بە درێژایی ڕۆژگار لە نێوان ئەم چوار دیوارەدا نێچیری دەست تەنیایی یەكی كوشندەبم و خەمەكانم بەسەر بكەمەوە .. یادە تاڵەكانم بژێنمەوەو فرمێسكیان بەسەرا داباریێنم .. گڕی ڕق و ئیرەییش بمكاتە ژیلەمۆ ، من نازانم بۆ دەبێ لە هەموو شتێكدا لەو خەڵكە جیاوازبم ، لەوەدەچێ لەدایك بووی ئەستێرەیەكی تر بم و ڕەشەبای غوربەت و مەینەت لەم دارستانە چۆڵەدا فڕێی دابم ، لەم خەڵكە ناگەم .. لەناویاندا دەژیم كەچی زۆرجار لە زمانەكەشیان ناگەم و دەڵێی بۆ یەكەم جارە ئەو ووشانە دەبیستم ، هەردەم دەڵێی بەدەم فریشتەوە پێدەكەنن .. گەزێك دەمیان داپچڕیوە ، كەچی من تا ئێستا چێژی پێكەنین نازانم .. شتێكی وانی یە لە ناخەوە شادم بكات و بە پێكەنینم بێنێت . ئای هەمیشە دەم داپچڕاوەكان .. قێزتان لێدەكەمەوە .. لەسیما شۆخ و دەروونە بۆگەنەكانتان بێزارم » .

شەقامەكە جمەی دێ .. ژاوەژاو ناوچەكەی خرۆشاندووە ، دوو لاوی قۆز دەكەونە نێو گۆشەی سەرنجەكانتەوە .. چەند هەنگاوێكیان ماوە بگەنە ئاستت .. بۆت دەخنێنەوە .. شادی یەكی سەیر لە سیمات دا دەنەخشێت ، هەر زوو دەنگەكەی ناخت كپ دەكەیت و گشت ڕق و تووڕەیی و ووشە ئاگری یەكان وەلادەنێیت ، خەندەیەكی فراوان لەسەر لێوانت دەنەخشێنیت ، خەندەی ناسك و نیگا گەرمەكانی دوو لاوەكە هەموو شتێكیان لەبیر بردوویتەوە .. بڕوا بەچاوی خۆت ناكەیت .. پێت وایە لە دنیادا كارەساتێكی گەورە خولقاوە .. دەنا چۆن ئەو دوو كوڕە قۆزە سەیری تۆ دەكەن ؟! بەلام هەرزوو دەركی مێشكت كڵۆم دەدەیت .. ناتەوێ بیر لە هیچ شتێكی وا بكەیتەوە كە لەو حاڵەتە خۆشەت ڕاچەنێنێت ...

« ئا .. ئەوەتا سەیرم دەكەن .. ئاشكرایە ئەمان وەك ئەوانی تر نین .. ئەوان زۆر لێم وورد نابنەوە ، بەلام ئەمان بە قووڵی لێم ڕاماوون .. تا ئێستا كەس بەم شێوەیە سەیری نەكردووم .. دیارە من هەڵەبووم . وام دەزانی هەموو وان ، ئۆخەی خوایە ! لە بێزاری و خۆخواردنەوە ڕزگارم بوو ، بەلام .. بەلام بۆ هەردوكیان وا بە تاسەوە بۆم دەڕوانن ؟! گوایە تۆبلێی ـ دەخنێیتەوە ـ تۆبلێی هەردووكیان ... دیارە بەختم هەستاوەتەوەو دوو دوو خۆشیان دەوێم ، ئینجا باشە خۆمن هیچیان ناناسم .. كامیان هەڵبژێرم .. ها ؟! ئاسانە .. ئا .. ئاسانە ! تۆبلێی لەسەرمن بیكەنە شەڕ؟!! » لە كەیفاندا هەر هەندەیە باڵت لێنەڕوێت .. هەرگیز سیمات وا گەشاوەو دڵت هێندە خێرا لێی نەداوە ، هەتا ماوەی نێوانتان كورت‌تر دەبێت .. زنجیری هیواكانت درێژتر دەبێت .. جەستەت بۆتە چراخان و تەم و تاریكی یەكانی ناخت دەڕەوێنەوە .. درەختی كۆنە سالی خەونە سەوزەكانت چرۆ دەردەكاتەوە ، هەنگاوێكتان نێوانە .. كەیف و شادی و مانای ڕاستەقینەی ژیان لەڕووی ئەو دوو لاوەدا دەبینیت .. واگەیشتنە ئاستت .. هەناسە لەخۆت دەبڕیت ، پێكڤە ئێستێك دەكەن .. یەكێكیان لێوەكانی لێك دەكاتەوە ...

ـ قەلەموون ئەوە زۆر جوانیت وا دەڵێی ڕەسممان دەگریت ؟! ئەوی‌تر ـ دەم و چاوی دەڵێی لەبزینەیەو كەچی دڵیشی بە دنیا خۆشە !

پێكەوە دایانە قاقای پێكەنین .. شوڵكێكی تەڕ لەسەر لووتت دەدرێت .. تەزوویەكی سارد لەسەر تا بەری پێت سڕ دەكات ، دۆزەخت نەدیوە .. بەلام دڵنیاین گەر لە ناوەندی دۆزەخیشدا بیت هەر هێندە ئازار دەچێژیت ، ووشەكانی ئەو دوو لاوە قۆزە ! پشكۆن و لەناختدا دەگەشێنەوە ، هەموو شتێك ئاوەژوو بۆتەوە .. خەندە ناسكەكەی سەر لێوت تاساوە .. ڕەنگت وەك بەرگی ئاودا مان سپی ی فریشتان داگەڕاوە .. دڵت سست بووە .. زنجیری هیواكانت یەك یەك ئەڵقەكانی لێك ترازاوە .. ناخت بۆتە شەوێكی قەترانی .. قاقای گەرمی دوو لاوەكە خەزانێكی شێت بوو .. چرۆی خەونە سەوزەكانتی وەراند ، سەرسامیت .. لە خۆ ساختەكردنی مرۆڤ سەرت سوڕماوە ، هێشتا قاقای ناسازیان لەگوێتدا دەزرنگێتەوە .. بەدوو هەنگاو خۆت دەگەیە نیتە بەردەم ئاوێنەی قەد

دیوارەکە .. لەخۆت رادەمێنیت ، لەوە دەچێت یەکەم جار بێ خۆت لە ئاوێنەدا ببینیت ، یەکە یەکە دەست بە ئەندامەکانی لەشتدا دێنیت .. بەسەریان دەکەیتەوە ، گەرەکتە پڕ بە دنیا بقیژێنیت و سکالای حاڵت بکەیت .. بەلام هەنسك ووشەکان لە گەرووتدا دەتاسێنێت ، دەنگەکەی ناخت سەر لەنوێ .. زولالتر زریانی رق و توورەییت بۆسەر دنیا دەنێرێت و ئادەمی یان دەکاتە ژێر دارو پەردووەوە ...

« راست دەکەن .. ناشرینم .. رەنگو رووم لەمرۆ ناچێت ، چاوەکانم لەباتی ئەوەی دووکانی بن نهێنیی شۆخی یان تێدا پەنهان بێت .. زەق و ئاوساو ترسناکن ، قژم لوول و ئالۆزەو ـ وەك نەنکم دەیووت ـ دەڵێی کەپری جنۆکەیە ، نازانم چۆن هەڵ خەڵەتام .. چۆن لەساتێکدا هەموو راستییەکم لەبەر چاو وون بوو ؟ ئەمە یەکەم جارم نییە .. لەیەکەم ساتی ژیانمەوە گوێیەکانم بە ئاوازی ناسازی ئەو ووشە چەقۆ ئاسایانە کراونەتەوە .. ئای کە دەبەنگم ! چۆن وا بە ئاسانی هەموو فێڵ و درۆکانیانم لەبیر چووەو فریشتە ئاسا هاتنە بەرچاوم ؟! بەلام چیبکەم ؟ منیش حەزم لە جوانییە .. منیش وەك هەموو کیژێکیتر بە ئاواتەوەم کورێك بە راستی خۆشی بوێم و وەك ئینسان سەیرم بکات ، منیش حەز دەکەم کە بەرێدا دەرۆم کورو کالان خۆیانم لە دەور بگێرن و ئاخ و ئۆفم بۆ هەلکێشن .. بەلام بلێم چی .. ناشرینم ! خوای مەزن تەنیا چارەك سەعاتێکی تری پێ رەوا نەبینیم تا بە شۆخی دروستی بکردمایە .. ئاخ گەر خوا قیروسیای لە چارەك سەعاتێکی کاتە بە نرخەکەی بکردایە .. ئێستا ئازار ئاوا گرۆلەی نەدەکردم ، بەلام .. کێ دەلێ سووچی ئەوە ؟ رەنگە ئەو هەر ئاگاشی لەبوونی من نەبێ ! من زنیدەوەرێکی جیاوازم و لە رەگەزی ئادەمییان نیم »

لەپێ دەستەکانت کردوتە سەرینی رووت و چالاییەکانی نێو لەپت بوونەتە جۆگەی فرمێسك .. بەکول دەگریت .. چاوەکانت دووکانی بەهارەن .. بگری .. بگری .. بەکوڵ بگری .. با فرمێسك تەمی سەر گلێنەت برەوێنێتەوە .. با فرمێسکت ببێتە تێزاب و ژانەکانت بتوێنێتەوە ..

لە دەورو بەرێکدا دەژیت ، رواڵەت یەکەمین پێوانەی هەڵسەنگاندنە تیایدا .. هەڵسەنگاندنی مرۆڤ و درەخت و بەردو ئامێر ! ئەو شتانەش کە ئەنجامی هەڵسەنگاندنیان بەلای سالیبدا بشکێتەوە ، کەنار دەخرێن و لە پەراوێزدا دەخوێنرێنەوە ، تۆ وات لێهاتووە هەست بەوە ناکەیت مرۆڤیت ، لەدەورو بەرێکی پڕ ساختەو روخساری هەڵخەڵەتێندا خۆت وەك خودێکی وون دەبینیت ، گەلێكجار بە رادەیەکی وا هەست بە وون بوونی خۆت دەکەیت .. خۆت لەگەڵ سۆپەرێکی تازەترین مۆدێلدا بەرا ورد دەکەیت .. ئەنجامیش .. ئەنجامێکی سەیر دەبێ ! جیاوازییەکی ئەوتۆ نابینیت .. تەنانەت لە نرخیشدا ئەو بەرزترە ! . ئەوسا قێز لەخۆت دەکەیتەوە ، قێز لە مرۆڤی سەردەم دەکەیتەوە کە هەموو مۆرکێکی ئادەمیزادی لێ داماڵراوە .. نەفرەت لەو یاسا ژەنگ گرتووانە دەکەیت کە مرۆڤیش وەك شمەك دەقەبلێنن .

ـ لە منالییەوە ئەم ئازارە سەختە پزیسك ئاسا گیانت دەبرژێنێتەوە ئەوساش ببوویتە مەخسەرەی منالانی گەرەك .. ئێستاش قسەکانیان پەردەی گوێیەکانت دەلەرێنێتەوە ...

**[ ـ لە دووری مەترێکەوە لووتت دەچێت بە چاوما .**

**ـ ماشەڵلا .. چاوت چەند جوانە .. هەردەڵێی چاوی حوشترە .**

**ـ جا نەکبەت مەگەر هەر شەفە گۆج پێت رازی بێت . ]**

کاتێکیش بناغەی مەمکت داناو هەراش بوویت ، کیژانی هاورێت خۆیان بەسەرتدا بادەدا .. لەبەردەمتدا پۆزیان لێ دەدا .. تاوانێکی سەیریاڵ دەدایە پاڵت ، تاوانی دزێوی !! وات لێ هاتبوو نەت دەوێرا لەماڵ بێیتە دەر ، کاتێکیش بۆ کرینی شتێك دەنێررایتە دوکانەکەی دراوسێتان بەترس و لەرزەوە رێت دەکرد .. هەر کە گوێشت لە قاقایەکی نزیك دەبوو ، شپرێو دەبوویت .. هەنگاوەکانت تێکەڵ دەبوون ، وات هەست دەکرد گشت دنیا بەسەرو سیمای تۆ پێ دەکەنن ، هەردە میش گریان تاکە هاورازت بوو .. کە دەگریایت باری شانت سووك دەبوو ، وات دەزانی بۆ یەکجاری خەمەکانت لە خاچ دراون و زامەکانت سارێژ بوون .. بەلام هێندەی نەدەبرد قەتماغەی برینەکانت هەڵ دەدرانەوەو ئازارێکی بەسوێ گینگڵی پێ دەدایت ، هەکبەی ناخی حەقدە ساڵانەت هێندەی خەم و ژان و ئازاری پیرێکی برسی و بێ دەرەتا نی تێدایە .

هێشتا نێرگزی دوازدە بەهار زێترت بۆن نەکردبوو کە

بابت هەناسەی لێبراو گەیشتە مەزارەکەی دایکت ، لەوساوە خانووەکەتان بۆتە کەلاوەو تەنیا دەنگی تۆو کاکتە جارجار پەردەی خامۆشی یەکەی دەدڕێنێ .

## تێبینی

کاکی شلێر ناوی بارامە ، تەمەنی (23) ساڵە ، کرێکارە ، نەخوێندەوارە ، ژنی نەهێناوە ، لەگەڵ شلێری خوشکیدا زۆر توندو تیژە .. ڕای وایە / گەر ئافرەت زیندان نەکرێت و دەرکی ماڵی لەسەر کلۆم نەدرێت ئەوا بەد ڕەووشتی دەنوێنێت و خراپە

دەکات .. ئافرەت سەرچاوەی هەموو شەڕو بەلایەکە .. گەر ڕێی بدرێت ، سەری تایەفەکەی دەنەوێنێ ، ئافرەت بۆی بکرێ یەك میللەت بەیەکتر قڕ دەکات / هەر بۆیەش ڕێی خوێندن و لەماڵ چوونە دەری لەشلێر گرتووە .. چەندی بۆی بکرێت چاودێری دەکات و لێی خافڵ نابێ .

وا چوویتەوە بەر پەنجەرەکە .. سەرنجەکانت وەك هێزێکی موگناتیسی بە کێشیان بکات بەسەر کوڕو کیژێکەوە لەنگەریان گرتووە ، دەستیان لێك ئالاندووە .. هەموو گیانیان پێ دەکەنێ ، لەدەوروبەر دابڕاون و لە دنیا ئەفسووناوی یەکەی خۆیاندا شەلاڵن ، ڕێبوارەکان کە دەگەنە ئاستیان ، ئێست دەکەن و لێیان ڕادەمێنن .. تا لێشیان دوور دەکەونەوە ئاوڕیان لێ دەدەنەوەو لەبەر خۆیانەوە دەبۆڵێنن ، تۆش لەناخەوە داخ بۆ کیژەکە دەخۆیت ..

« هێی کیژە نەگبەتەکە .. پێ بکەنە ، هێشتا لەپیاو نەگەیشتوویت .. نازانیت دیوی ناوەوەی ووشە زۆر شیرینەکانیان ژەهرە .. ئامێزە گەرمەکانیشیان داوەو ئەو کیژە نەگبەتەی پێوەی بێ دەبێت تاماوە بناڵێنێت و بەدەم ئازارەوە سەر بنێتەوە ، تۆش ساویلکەیت .. ئەوەتا وا بە پێی خۆت و بە شادی یەوە بەرەو داوەکە دەچیت ، بەلام ڕەنگە عاشق نەبن و خوشك و برابن .. یان خزم بن .. ها !! . بەخوا بڕوا ناکەم .. ڕۆیشتنەکە یان هەر بە ڕۆیشتنی عاشقان دەچێت »

لە ڕووی گەشاوەی ئەو کیژەدا خۆت دەبینیت .. گلکۆی نژیارەکانت شین دەبنەوە ، لەبەردەمتدا ڕاست دەبنەوەو برینەکەی چەند مانگێك لەمەوبەرت دەکولێننەوە ، لە سیمەی ڕێبوارەکانی سەر شەقامەکەدا چاوە کاڵەکانی (ئارام دەبینیت ، وەك جاران بە تاسەوە لێت ڕاماوەو نیگەی تەلیسماویت تێ دەگرێت ، هەر سیحری چاوەکانیشی بوو یەکەم جار تەزووی بە گیانتدا هێناو بۆلای خۆیی کێش کردیت . بە درێژایی ڕۆژگار لەبەر ئەم پەنجەرەیەدا چاوەڕێت دەکرد ، کە بە سیلەی شەقامەکەشەوە دەردەکەوت خورپەیەك لەناخەوە دەیلەرزاندیت ، خۆشەویستی ی ئارام لەگەڵ خوێنتدا تێکە ببوو .. تا دەهات زێتر هەستت بە تێکەڵ بوونی دەکرد ، گە ڕۆژێك نەتدیتبا هەزار غایەلەی سەیر بە بیرتدا دەهات برستت لێ دەبڕا گیانت دەبووە مەلێکی لە لانەی خۆ هەڵبراوو نەدەسرەوت ، کە بۆ یەکەم جاریش قسەت لەگەڵ کرد هێندەی تر خۆشەویستی یەکەی بە ناختدا ڕۆچوو .. ئارام بووە پارچەیەکی گەورە لە بوونت ، هەستت دەکرد لەوەپێش لاشەیەکی بێ گیان بوویت و لەگەڵ خۆشەویستی ئارامدا ژیان ڕژاوەتە ناختەوەو بە دەمارەکانتدا خورەی دێت ...

[ باشە ئارام .. تۆ بۆ منت خۆش دەوێت ؟ .
- پرسیارێکی سەیرە ! .
- بۆ ؟ .
- چونکە خۆشم هیچ هۆیەکی ئاشکرا نابینم بۆ خۆشەویستی یەکەم .. تەنیا ئەوەندە دەزانم خۆشم دەوێیت !
- ئاخر کیژی لە من جوانتر هەیە !

- لەوانەیە ! . بەلام من جوانیم بەلاوە گرنگ نی یە .. گرنگ ئەوەیە من لەگەڵ تۆدا هەست بە خۆشی دەکەم .
- یانی ئەگەر کیژێکی جوانیش مەیلت بداتێ ، گوێی نادەیتێ ؟
- جا چۆن دڵم ڕێم دەدا کەسی ترم خۆش بوێ ؟! ] .

ئەو ووشانە بارانی دڵنیایی بوون .. سەر بەکڵاوە بەسەر دڵتدا دەبارین .. هێندەی تر ئارامیان لەپێش چاوتدا گەورە

ـمکردو فریشتە ئاسا دەتبینی ، کە لەگەڵ ئارام دەبوویت چێژت
ـە ئەواوی سەربەستی خۆت وەردەگرت .. وات هەست دەکرد ،
حکە لە ئەوینەکەت هیچ هێزێك نی یە دەست بـەسەر ویستو
ـرەزووەکانتدا بگرێتو بە کەیفی خۆی ئاراستەیان بکا ، خۆت
وەك کـۆترێـك دەبینی .. بێ ترس بـە ئاسمـانی بەرینی ئـەو
ـوورگانەدا ـ کە هێشتا دەنگی مرۆڤیان نەگەیشتووەتێ ـ بە
کلوخۆ باڵ لێك دەداو دەفری ..

ئەوسا بەزەییت بەو کەسانەدا دەهاتەوە کە تروسکەی خۆشەویستی لەدڵیان دا نی یە ، گـومانت لە بـوونو ژیانیـان دەکرد .. هەر بۆیە هەموو رۆژێك ماوەی چوونە سەرکاری کاکت بە دەرفەت دەرەخساندو بێ ترس ئارامت دەهێنـایە مـاڵەوە ، چەند ساتێکی پڕ خۆشە ویستیو ژیانتان پێکەوە بەسەر دەبرد ، بۆ ئێوە کات شتێکی پووچو بێ مانا بوو .. تاکە مۆمێك کە پەروانە ئاسا لە دەوری دەسووڕانەوە ، ئەوینە ساواکەتان بوو .

بەڵام هێندەی نەبرد بوومەلەرزەیەکی سەخت دوورگەی شۆخی عەشقەکەتی خاپوور کـرد ، شەپـۆلە سەر شێتـەکان تەنگیان بە لێوارەکان هەڵچنیو هەموو شتێکیـان راماڵی ، لە هەموو لایەکەوە بۆنی مەرگ بەرز دەبووەوە .. رەش بووە تاکە رەنگی بەرچاوت .. ئای لەوساتە سامناکانە ! . وەك رۆژانی دی ژوانتان گرت ، ماوەیەك بوو ئارام ئاسایی نەبوو .. لەگـەڵت ساردبوو .. بەڵام هێمنی ی ئەو ماوەیەی لەو رۆژەدا تەقاندەوە

[ چاوەکانی مەستو گێژ بـوون .. نیگاکـانی لە نیگای جاران نەدەچوو ، پێتوابوو پرۆژەی کارێکی گەورە وا بێ بـڕستو رەنگ بـزرکـاوی کـردووە ، بـەرامبـەرت دانیشتبـوو .. بە تـامەزرۆیی سـەیـری دەکـردیت .. لەهیکرا ئەوە رووی‌دا کە هەرگیز چاوەڕێ ی نەبوویت .. شێتانە ئامیازی سەرتبوو .. بەزۆر لەسەر بەرەکە پاڵی خستیت . . مانی بووە زەردە مارو بۆ هەموو ئەندامێکی جـەستەت کشـا .. دەیلێسایتـەوە .. لالغاوەشی کـەف دەچەراند ، مەمکەکانت دوو تەماتەی کاڵ بوون لەنێـو دەستەکانی‌دا دەپووکانەوە .. بەرگریت کرد .. خۆت نەدا بە دەستەوە .. چەند ووشەیەکیش لە نێـوان هەنسکی ئەوو ناڵەی تۆدا وون دەبوون ...

ـ ئارام .. شەرمە .. وا مەکە ! .

ـ لەمە زیاتر بەرگە ناگرم .. تاکەی ! .

ـ ئەمە خۆشەویستی نی یە تۆ دەیکەیت ! .

ـ خـۆشەویستی ؟ . کـەی ئێستـا وەختی ئـەم قسـە قۆڕانەیە ؟ ! . جاری با ڕابوێرین .. دوایی خوا کەریمە دوو قسەش لە خۆشەویستی یەکەت ! دەکەین .

ـ یانی درۆت لەگەڵ کردم ؟ .

ـ هەموو هەر درۆ دەکەین .. ئێستا تۆ ئاقڵ بەو پەلە قاژە مەکە .. دوایی ڕێك دەکەوین ! .

بورکانێکی مەزن لەناختدا تەقی‌یەوە ، بەهەموو توانات پاڵت پێوە ناو وەلات نا .. لە دەستی دەرباز بوویتو لە چاو تروکاندنێکدا خۆت گەیاندە سەر شەقامەکە .. هەر هێندەو هەمووشتێك کۆتایی‌هات ، هەموو ساتە ناسکـە ئەوینی‌یەکان وەك تەواوبوونی شانـۆیی‌یەك پـەردەیان بەسەردا درا .. ئیتر لەوساتەوە گیانت بووەتە بـارانی نەفرەتو بەسەر ڕەگەزی پیاودا دەبارێت ] .

قاقایەکی ناسك لە ژوورەکەی ئـەو دیوەوە بـە ئاگـات دەهێنێتەوە .. بەدەم قاقاکەوە دەچیت ، خەمو ئازارو قینێکی پیرۆز هەنگاوەکانتی قـورس کردووە .. لە کـونی دەرگاکـەوە دەڕووانیت ... / کاکت لەگەڵ ئافرەتێکدا بە ڕووتی لەسـەر فەرشەکەن .. کاکت لەبەردەم ئافرەتەکەدا بەچۆکدا هاتووە .. دەپاڕێتەوە ... ئافرەتەکەش قاقا لێ دەداو بە نازەوە سەری قایل نەبوونو گاڵتە پێکردن دەلەقێنێ .. کاکت هەر هێندەیە ناگری ، بەڵام ئافرەتەکە هەر قاقا لێ دەدا .. لەوە دەچێت گەرەکی بێت ئازاری بدات / .

ئەو دیمەنە هێندەی‌تر نەفـرەتەکـەت سەختـترو قینەکـەت گەورەتر دەکات ، قێز لە کاکت دەکەیتەوە بەڵام ئیـرەیی بەو ئافرەتە دەبەیت کە دەتوانێت بە سانایی ئازاری پیـاو بداتو چۆکیان پێ دابدات .. خۆزگەی پێ دەخوازیت .

لەناکاو بروسکەیەك لەبیرت دەدات .. ساتێك خـامۆش دەبیت ، هـەر زوو بڕیـار دەدەیتو خۆت دەگـەیەنیتـە بـەر پـەنجەرەکـە ، چاو دەگێـڕیت .. لاوێـك لەو بـەرەوە لەسـەر شۆستەکە وەستاوە .. بە ئیشارەت بانگی دەکەیت ، وا بە ترسو کەیفەوە هەنگاو دەنێو بەرەو لای تۆ خۆی دەکوتێت ...

« ڕێگایەکی چاکە بۆ ئازاردانو گاڵتە پێکردنو چۆك پێ دا دانیان .. نازانم چۆن تا ئێستا بیرم لێ نەکردۆتەوە »

کەمال رەئووف محەممەد

# جووتێکی بولبولی خۆش ئاواز




**● پێشەکیی**

دوو ڕاستیی هەن . یەکەمیان : گۆرانیی رادیۆیی قۆناغێکی کاروانی هونەری گۆرانیی کوردیی‌یە . دووەمیان : لەو قۆناغەدا گۆرانیی‌بێژی ئەوتۆ هەڵکەوتووە کە دەیەها گۆرانیی هەیە و لەلای خەڵك پەسەند نەکراوە .. هی ئەوتۆش هەیە کە چەند گۆرانیی‌یەکی لە ڕۆژگاری خۆیەوە بۆ بەرەودووا پەسەند کراوە وناوبانگی هەیە کە تێکرا یان بە گۆرانیی‌زان و دەنگ خۆش یان هەر بە دەنگ خۆش و زمان شیرین دەنگیان داوەتەوە . هەر کەسێکیش بیەوێت ـ زانستانە ـ بۆ مێژوو کار بکات ، دەبێت هەردوو دەستەکە نیشانە بکات ئەگەر چی ڕەنگ بێت ، خوێندەوار چ گوێگر ، تەنانەت دەستەی یەکەم ـ خۆی ـ بەرگەی ئەو باسە نەگرن ، بەلام تا کاتی ئەوە دێت باس لەو دەستەیە بکرێت ، ئەوە لە پێشترە ، دەستەی دووەم ـ بەناوبانگەکان ـ بەسەر بکەینەوە و پەردەی تاریکیی لەسەر ژیان وکرداری هونەرییان لا بدەین ، چونکە پێمان وایە ـ قۆناغی ئێستا ـ کۆرپەی هەل و بارێکی کوتوپڕ نی‌یە ، بەڵکو ئەنجامی کاروانی ڕابردووە با بارەکە ـ لەچاو جاراندا ـ ئێستا پێشکەوتوو بێت . ئەمجا ئەگەر « دایکی جەمال »[1] وەکو کۆلییومانەتەوە ، پێشترین ئافرەت بێت بۆ تۆمار کردنی گۆرانیی کوردیی و ـ سۆرانیی ؟ ـ لەسەر قەوان وگۆرانیی‌بێژی ڕادیۆش نەبووبێت ، ئەوا « نازدار و ئەسمەر فەرهاد » بەتەنها گۆرانیی‌بێژی رادیۆ بوون و بەو ـ شێوە زمانە ـ دووهەمن ئەگەر چی قەوانی بازرگانییشیان[2] نەبووە .

باس‌کردنی ئەم دووانەش هەر لەبەر ئەو هەڵوێستە نی‌یە بەتەنها ، هەروەها لەبەر ئەوەش نی‌یە کە خۆیان بێ سەرو شوێن ماوونەتەوە ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە گۆرانیی‌یەکانیان هونەری تێدایە و لەسەر ڕەفەیەکی بەرزدان و ناوبانگیان هەیە کە ( پرسیینەوەشمان لە ڕای هەندێك کەسی سەردەمی بڵاوبوونەوەی گۆرانیی‌یەکانیان ، هەروەها درێژیی داواکاریی گوێگرەکانی ڕادیۆی کوردیی بەغدا بۆ بیستنیان کە ـ خۆم ـ تەمەنۆکەیەك شایەدم ، ئەو ڕاستیی‌یە دەچەسپێنن ) . ئەمە لە هەڵێکدا دووای خۆیشیان و هەتا ئێستا ، دەنگێکی ئافرەت نەیتووانییوە جێگایان بگرێتەوە یان لاسایبیان بکاتەوە . دوواجار بۆ دۆزیینەوە و ناسیینی کردو کۆشی ـ ئەمانیش ـ کە سەرگەردان و نەنووسراوەن ، یادگاری بییری ئەم و ئەو دەکەین بەپشتیوان دا ڕاستیی وون نەبێت .

**● نازدار و ئەسمەر فەرهاد کێن ؟**

هەتا ئێستا ، رادیۆ بەو ناوەوە ناوی بردوون و لە نێو دەفتەرەکانی گۆرانییشدا ، بەکۆن و تازەوە ، ناوێکی تریان نەنووسراوە کە خۆیشیان هەڵبەت ناویان هەیە . تەنها سەرچاوەیەکیش هەتا ئێستا ـ بەنووسیین ـ هەمان ناو و ـ وێنەیانی ـ بڵاوکردبێتەوە کتێبۆکەی « چەپکە گوڵی 1954 » ی تایەر تۆفیقە[3] کە لەژێر وێنەیشیاندا نووسراوە : ( دوو قوڵی نازدار و ئەسمەر فرهاد ـ دەنگیان زۆر خوشە وە مەشهوورن بە نەجیبە یار نەجیبە ! ) . لەلایەکی‌ترەوە ـ خۆم ـ لەساڵی 1966 دا لە پرۆگرامی « دەنگی هونەر[4] » دا یەکەم جار لەسەر ژیان و گۆرانییان و دووەم جار ـ هەر لەو ساڵەدا ـ لەسەر گۆرانیی‌یەکی « ئەسمەر و عەلی مەردان » باسم پێشکەش کرد کە لە یەکەم جاردا ـ دەم و دووی ـ عەلی مەردان[5] سەرچاوەم بوو . لە ساڵی 1979 دا لە لایەن هونەرمەند حەسەنی جزییری[6] لە 1983 دا لە لایەن د . عیزرەددین مستەفا ڕەسوول[7] و مامۆستا کامل کاکە ئەمینی[8] ـ یەکەم باس‌بێژو چاودێری رادیۆی کوردیی بەغدا ـ باسی ترم دەستگییر بوو کە پوختەی سەرنجی خۆم و باسەکانی ئەوان ـ پاش بژار کردن و بەراوورد کردنیان ـ زۆرتر لەم شێوە ڕاستیی‌یەدا دەردەکەوون :

**نازدار = خۆخێ ) و ئەسمەر ( = ماری ) ین** کە تەمەنیان لە دەورو بەری 20 — 22 ساڵیدا بووە . باوکیان (مووسا) و دایکیان (بەستێ) ی ناو بووە ، خەڵکی گوندێکی لای قەزای ئاکرێ بوون گوایە (دەحلەڕێ) ی ناوە . لە ساڵانی 1948 — 1949 دا



1 — نازدار « خۆخێ »
2 — ئەسمەر « ماری »

کامل کاکه ئەمین که میوانی موختاری ئەو گونده (سالح ئاغا) ناوبووه ، ئەو جووته خوشکەی دیبوه که به شێوەی کورمانجیی ژووروـ بادینانی ؟ ـ هاتوون و گۆرانییان لەلا گوتوون . ئەویش که بەرپرسیاری ڕادیۆ بووه بەئەو خودان ماڵەی گوتووه که بیاننێرێ بۆ لای بۆ رادیۆ . پاش ماوەیەك هاتوون و لەبەر ئەوه که دەنگی ئافرەتی گۆرانیبێژی ڕادیۆ ـ به سۆرانیی ؟ ـ نەبووه داوای له عەلی مەردان کردووه که فێری گۆرانیی ـ سۆرانییان ـ بکات و ئەویش له ماوەیەکی کورتدا فێری کردوون که خوێندەواریی یەکیان هەبووه به تایبەتیش خوشکه پچووکەکەیان ( ئەسمەر = ماری ) ئینگلیزیی یەکی باشیشی زانییوه . چار و بارەش لەگەڵ دانانی یەکەم تیپی تەمسیلی ڕادیۆی کوردیی ، کەمێك بەشدارییان کردووه . له هەوادا ـ یەکسەر ـ هەروەها به تۆماری ـ وایر ریکۆرد : سیم ـ و لەسەر قەوان گۆرانیی میللیی و فۆلکلۆرییان گوتووه که به دوو قۆلیی هەروەها بەتەنها لەگەڵ دەنگێکی پیاودا وەکو ـ عەلی مەردان ـ گۆرانییان گوتووه که ژمارەیەکیان دیاره و ژمارەیەکیان وونه . به هەردووکیان ئاهەنگێکی گۆرانیی نییو سەعاتییان بۆ ڕادیۆ به 4 دینار گێڕاوه . زیرەك و دەنگخۆش بوون . پاش مەودایەکی ڕادیۆیی 1949 — 1954 بێسەر و شوێن ماوونەتەوه و ( ئەسمەر = ماری ) خوشکه پچووك هەتا ساڵی 1957 له بەغدادا دیتراوه که هەژار بووه و دووچاری نەخۆشیی تیبراوێ ـ سەرەتانی مەمك ـ بووه و حەسەنی جزییری دیبویەتی ! موسڵمانیش نەبوون .

● گۆرانیی یەکانیان

ئه : ـ ئەوی که من ئاگاداری بم له ساڵی 1966 بەوه ئەم گۆرانییانەیان لەسەر ـ تیپ ـ دا به تۆمارکراویی دیارو بڵاو دەکرانەوه :

1 — وەك قوومریی سەر باڵم شیینه .
2 — دەمەگری مەگری چاوانت دێشێ .
3 — نەجیبه یار نەجیبه .. نەجیب خاڵ دانه دانه .
4 — گەردوون من چی بکەم چیم دەسەڵاته .
5 — کزەی جەرگانم باوان وێرانم .
6 — ئامینێم نازەنێنێم .
7 — ئەرێ هۆ لەیلێ .
8 — هەلاوه لاوه گوڵێ .

بێ : ـ له پایزی ساڵی 1966 دا که دوو مانگێ له شریتخانەی ڕادیۆی کوردییدا کارم دەکرد و کۆمەڵێك قەوانی کۆن و فەرامۆش کراووم بەسەر دەکردەوه ( قەوانێکی تەپ و تۆزاوی و برییندارم دۆزی یەوه که لەسەر هەردوو دیویدا ـ بەعارەبیی ـ نوسرابوو : مانگی جارێك تۆمار دەکرێت .. / بەم جۆره : )

* **دیبوی یەکەم : نازدارو ئەسمەر فەرهاد . گۆرانیی : « مەگری مەگری »**
* **دیبوی دووەم : دووقۆلیی ئەسمەرو عەلی مەردان . گۆرانیی : « بڕووانه بزانه » شیعر : کەریم سەعید زانستی . ئاواز : سەعید شابۆ[**]** .

( ئەم قەوانەش که ڕادیۆیی بوو ، بەو برییندارییەوه له 12 / 11 / 1966 له پرۆگرامی باس کراودا[***] پێشکەش کرد که دەنگی ـ ئەسمەر ـ لەچاو دەنگی عەلی مەرداندا که ـ چرپیکەدار ـ بوو ، وەك تاڵێك دانتێلی بارێك ، ناسك بوو . ناشزانم ئێستا ئەو قەوانه چی لێ بەسەردا هاتووه بەتایبەتی که من پەیوەندییم بەئەو ڕادیۆیەوه نەماوه . گرنگیش ئەوەیه بەتەواوی دڵنیایی یەوه دەڵێم که گۆرانیی « بڕووانه بزانه » هەتا ساڵی 1958 بڵاوکراوەتەوه ، بۆ بەڵگەش له 5 / 2 / 1958 دا بڵاوکراوەتەوه .

* هەروەها له هەمان ڕۆژدا گۆرانیی یەکی ئەوخوشکه به ناوی ( موتریب ساز و نەی بێ ) له ڕادیۆی کوردییدا بڵاو کراوەتەوه ، که ـ بڕوانه وبزانه + موترب سازو نەی بێ ـ له

رادیۆدا وون بوون .

پێ : ـ کامل کاکە ئەمین لە قسەیدا بۆ ـ من ـ وەکو لە پەراوێزدا ئاشکرابووە ، دەگێڕێتـەوە و دەڵێ کە گـۆرانیی تریـان هەبووە ، وەك :

* **بارانە ـ ی ژمارە : 1**
* **بارانە ـ ی ژمارە : 2**
* **ئای ئایەك ـ بەشێوەی مەقام نا .**

لە لایەکی ترەوە ، لە هەندێك کەسم بیستووە گوایە ئەم گۆرانییانەیشیان بیستووە :

* **گیان و گیان ئازیزەکەم .**
* **بابچیینە سەر وەیس وەیسی خۆمانە . ( کە خۆمان لەمە دڵنیا نین ! ) .**

● **لێکدانەوە :**

ئە : ئەگەر هەر کەسێك گوێ لە گۆرانییەکانیان بگرێت ، لە ڕووی پاکیی ـ تۆمار ـ ەوە هەست دەکات کە ئەم گۆرانییانە لەوە ناچن ـ لەسەر قەوان ـ تۆمار کرابن چونکە تۆمارکراوی سەر قەوان بە هەرجۆرێك ئەو سیفەتە دەنوێنێت . ئەمجا لێرەدا کە ـ خۆم ـ کارمەندی رادیۆ بووم ، لەگەڵ ئەو رایەی کامل کاکـە ئەمینم کە لەسەر سیم = وایەر ڕیکۆرد ، گۆرانییەکان تۆمار کرابن کە لەو لاوەش ئەو ڕاستییەش هەیە ـ وەکو لە کارمەندە پێشینەکانی رادیۆی بەغدا « نەك کوردییەکەی » ـ پرسیارم کردووە ، ئەو وایەرە یان تەلە لە سەرەتای 1950 دا پەیدابوو ، دووای ئەوە لە 1951 بە دوواوە باوی قەوانی تایبەتیی رادیۆ ـ جۆری مارکۆنی ـ پەیدابوو ، کە هەر لە نێو رادیۆدا قەوانەکە ـ شتی ـ لەسەر تۆمار دەکرا و کە خراپ بـووایە دەشکێنـرا و سەرلەنوێ دەکرایەوە بە قەوان . بەم پێیە کە لە 1949 — 1950 دا هاتبن ، دیارە گۆرانییان ـ بێ تـۆمار کـردن ـ لە هەوادا بـڵاو بووەتەوە . هەروەها دەشێت قەوانیشیان هەبووبێت ، بـەڵام لەبەر لێدانەوە و خراپ بوون و شکاندنیان ـ کە فریـای تییپ ریکۆردر « شریت [14]» نەکەوتوون ـ گەلێك گۆرانییان لە دەست چووبن و وێنەیان کە ـ مابێت ـ هەر ئەو یەکەیە کە باسی بەسەر چـوو . لێرەدا پـرسیارێکـك سەر هـەڵدەدات : ئایـا مەودای 1949 — 1954 کە پێنج شەش ساڵێکە ، ڕێگای تێ دەچێت کە تێدا لە رادیۆدا بووین و هەر هێندەش گۆرانییان لەپاش بەجێ مابێت ؟ بەکورتیی من بۆ ئەوە دەچم کە ئەو مەودایە زۆرە ، بەتایبەتیی خوشکی گەورە ( نازدار = خۆخێ ) وکەس و کاری کۆچیان کـردووە ، ئەگـەر چی ـ وێنە بـڵاوکراوەکـەیـان لە 1954 دا و ئاشناکردنیان بە خوێندەوار هاندەرە باوەڕ بکرێت هەتا ئەو ساڵە لە رادیۆدا بووبن[13] ! ئەمە لە لایەك ، لە لایەکی ترەوە ، دەبێت ئیما بۆ تەمەنیان بکەین کە هەر لەو دەورو بەرەدایە کە باسی کرا ـ ئـەگەر چی بیـروڕاکانی سـەرچاوەکـان جیاوازیی هـەیە . بەڵگەشمان وێنەکەیانە کە تەمەنیان بۆ بەرەو ژوور نابات .

بێ : ـ بەگوێ گرتن لە گۆرانییەکان و داوکاری گوێگرەکان و دەوری عەلی مەردان لە فێرکردنیاندا ، هەروەها ـ تاسووقیی رادیۆش لە سەرەتادا ـ کە دەزگایەکی هـەست ڕاکێشە و بـە ئاشکرا دەنگی ئافرەتی گۆرانییبێژ بـڵاودەکاتـەوە ، دیارە ، دەوری ئەم جووتە خوشکە لەگۆرانیی کوردییدا کـارییگەرە ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەش کە گۆرانیی نزیـك بە دەروونی ئـەو گوێگرانەیان بە زمان پژاوە کە هۆنراوی میللی و فۆلکلۆرییان بە دەم مووسیقاوە ، بەرێك و پێکی ، گێڕاوەتەوە . بـەڵام ئایـا ئەوانە بە تەنها مایەی ناوداریبان و هونەریانە ، یان هونەر لە خۆیشیاندا هەیە ، قسە لەمەڕ زیبرەکییان ـ بەتایبەت کە عەلی مەردان ـ لێیان بڵێت ، کلیلە بـۆ دۆزینەوەی هـونەریـان کە لەوەوە دەست پێدەکات بەماوەیەکی کـورت گۆرانیی شێـوە زمانی ـ سۆرانیی ـ یان بە ڕاستی و بەجووانیی و ڕێك لەگەڵ مووسیقە ـ پاش پراوەیەکی کورتی رادیۆیی ئەو کاتە کە وەك ئەمڕۆ نییە ـ ئەدا کردووە . بەمەشدا دیارە ، گوێ سووك ، هەست ناسك بوون بـۆ چێژتنی شێـوە زمانـەکە و هـۆنراو و مووسیقەش . دە نگیشیـان بەهـای خۆی هـەیە ، نـاسکە و قورگیان پاکە و هەناسەیشیان بێمشەیە و دەربڕینیان ڕەوانە وەك ئاوی سازگاری کانییەکی دێرین . دەشتووانیین بڵێین کە لێهاتوو بوون ، چونکە ئەگەر لێهاتوو نەبوونایە یەکێکی وەكـ عەلی مەردان کە بەدەگمەن گۆرانیی لەگەڵ یەکێکی تر گوتووە ، نەدەهات گۆرانیی « بڕووانە بزانە » لەگەڵ ئـەسمەر بڵێت و هەرگیز بییریشی لەوە نەدەکردەوە کە خۆیان بۆ هیلاك بکات و بیانکات بە گۆرانییبێژ . دڕۆش ناکەین ئەگەر بڵێین لە نێو دەنگە

ژنانیی یەکانی گۆرانیی کوردیی سەر قەوان و رادیۆ ـ بە هەردوو شێوە زمانەکەوە ـ دەنگی ئەم جووتە خوشکە ، دەنگی بولبولە و ئەدای گیانی بە گیانییان لە ئەدای ـ مریەم[14] خان ـ ی بەسۆز کەمتر نی یە و ـ دایکی جەمالیش ـ کەنزیك چارەکە سەدەیەك لەمانەوە دوورە ، ناگاتە ئەدای ئەمان : ڕەنگیش بێت ئـەگەر هەلی ژیان و رۆژگار ـ لەچاو ئەمڕۆدا ـ لەبـار بووایـە ، ئەوا خەرمانێـك گۆرانیی کـوردیی بەدەنگی ئـەوان دەبووژایـەوە بەتایبەتی کە عەلی مەردان مامۆستایان بوو . ئاشکراشە ئـەو گۆرانییانـە ـ هەتـا ئێستا ـ لە لای گـۆرانیبێژەکـانی تیپە مووسیقی یەکان فەرامۆش کراوە و دەنگێکی ژنانەش جێگایانی نەگرتووەتە و ئەگەر ـ لە دەرەوەی ئەواندا ـ یەکێکیش هاتبێت لاساییاتی کردبێتەوە وەك بە ـ نەجیبە یار نەجیبە ـ ئـەوا بە ڕاگرتنی ئەدای ئەوان و ئەم ـ تازەیە ـ جیاوازیی یەکی گەورە هەست پێ دەکرێت کە ئەوەش ناقۆلایی ئەدای دووەمە .

نوختەیەکیش کە گۆرانیی ئەم جووتە خوشکە بەنرخ دەکات ، ئەوەیە کە مۆری ڕاستیی یەکی مێژوویی بەنێو چەوانی گۆرانیی کوردیی تۆمار کراوەوە دەنێن . ڕاستیی یەکەش ئەوەیە کە هەتا پێش پەیدابوونی « تیپە مووسیقی یەکانی ئەو دیو قەوانی بـازرگانی و رادیـۆ » تەنهـا —3— ئافـرەت بەشێـوە زمـانی سۆرانیی کە (کوردی موسلمان) نەبوون ، گۆرانییان گوتووە کە ئەوانیش : دایکی جەمال و ئەم جووتە خوشکەن . بەلام بەشێوە زمانی بادینانی : مەریەم خان و ئەلماس محەممەد[15] و فەوزییە محەمەد و نەسرین شیروان ( کوردی موسلمان ) بـوون و گۆرانییان گوتووە . کە لای ئێمە تاقمی یەکەم ـ فێرکـراون و تاقمی دووەم ، وەك مریەمخان و ست ئەلماس کە لە ناوچـەی (جزیر) یەوە هاتووە ، ڕیشەیەکی ڕۆشنبیرییان هەبووە و ـ فێر نەکراوون بەلکو خۆیان ، لە ـ جزیر و بۆتانی ـ نیشتمانیاندا ئەو لاووك و بـەستـە و مـەقـامـانـەیـان زانییـوە و ـ لێـرەش ـ گێڕاویانەتەوە .

پێ : گەردوون چ سەیـرە ! دایکی جەمـال ـ ی یەکـەم ، بە نەخۆشیی تیراویی مەمك مرد و ئەم جووتە خوشکەش بێسەر و شوێن بوون و (ئەسمەر) یان تووشی هەمان دەردی تیراوی بووە و کێ ڕەلێت لە ژێر خاکدا نەڕزابێت . ڕاست دەلێن : مێـژوو هونەرە[16] ؟

## پەراوێزەکان

1 — 1908 ؟ ز ـ 1979 ز .

2 — لە یەکێکم بیست گوایە قەوانی بازرگانییان هەبووە ، بەلام چەند بە دۆزینەوەی قەوانە بازرگانی یەکانەوە خەریکم هەتا ئێستا قەوانێکی ئەوانم بەرچاو نەکەوتووە و باوەڕ ناکەم ، هەرگیز کە قەوانی بازرگانییان هەبوو بێت .

3 — چەپکە گول ـ چاپخانەی مەعارف ـ بەغدا 1954 ـ تایەر توفیق . ( وێنەی بلاوکراوەی نێو ئەم لێکۆلینەوەیە ، لەو وەرگیراوە ) .

4 — مێژووی بەرنامەی باسکراو 12 / 8 / 1966 م .

5 — ئە : قسەکانی مامۆستا عەلی مەردان کە دەم و دوویی بوو نەك ـ تۆمارکراو ـ بەم جۆرە بوو : ( دوو خوشکی خووار و ژوو بوون . گەورەکەیان تەمەنی لە دەورووبەری 30 سالییدا بوو ، ناوی : پۆڕێ = نازدار بوو . پچووکەکەیان تەمـەنی 25 سال دەبوو ، ناوی : نادیرە = ئەسمەر بوو . خەلکی ناوچەی سـورچیی لای قەزای ئاکرێ بوون . وەك بیستوومە خوشکی گەورە و کەس و کاری لە عێراقدا نەمانەوە [ ناوی سالەکەی نەبرد إ ك . ر . م ] . دووای ئەوە نەزانرا چییان لێ بەسەر هات . لە دانیشتنێکدا ناسییمن . دەنگیان خۆش بوو . زیرەك بوون . من ناووم نان ـ نازدار و ئەسمەر فەرهاد ـ و من فێری گۆرانیی گوتنم کردون ـ بەشێوەی خۆمان : سۆرانیی : ـ و هەموو گۆرانیی یەکان من دامناوون و فێرم کردوون . یەکەم جار سلەمییمەوە ، بـەلام بەڕاستیی لەوەدا نـەبوون و وریـا و لێهاتـوو بـوون . [ بـۆ سـەردەمی گۆرانیی گوتنیان ، گوتی : ] بیست سالێك لەمەوبەر . [ بیست سال پێش 1966 إ ك . ر . م ] . یەکەم گۆرانییشیان « وەك قومری سەر بالم شیینە » بوو . گۆرانییشیان هەر ئەمەندەیە کە بلاو دەکرێنەوە .

بێ : مامۆستـا مەردان نـاوی ( پۆڕێ ) ی بـەرامبەر نـازناوی ( نـازدار ) داناوە . ڕاستیی کەی (پۆڕێ) ناوی تەواوی ( نەسرین شیروانە ) و ئەمەش ئاشکرایە .

پێ : ئەوی لە بیرم ناچێت و مامۆستا مەردان لەوە دنیادایە ، بەدەگمەن و کەم دەیویست باسی ئاسیاوەکانی بکات و ئەو باسەیش بە تکایەکی زۆر پێم درکاند کە دیاریشە زۆر وورد نی یە و هەلەی تێدایە ! وەك دیاریشە لەم لێکۆلینەوەیەدا پشتمان بەچەنـد لایەنێکی ڕاست بەستووە نەك هەمووی !

6 — لە 7 / 5 / 1979 دا هونەرمەندان حەسەنی جزیری و نەسرین شیروان بە میوانیی هاتن بۆ لام بۆ سلێمانیی و لە دانیشتنێکی درێژدا ـ قسەی تۆمارکراو و دەم و دوومان بوو کە دەربارەی ئەم جووتە خوشکە پوختەی قسەکان ئەمەیـە : ( دوو خوشـك بوون . لە دەوروو بەری سالانی 1952 — 1954 دا هاتنە ئێستگەی رادیۆی بەشی کوردیی عیراق . تەمەنیان 14 — 16 سالان دەبـوو . گەورەکـەیان : خـۆخێ = ئەسمەری ناو بوو . پچووکەکەیان : ماری = نازدار بوو . باوکیـان : مووسـا و دایکیان : بەستێ ـ ی ناو بوو . خەلکی کن ئاکرێ بوون . باوکیان لە دایەرەی ـ مەجاریی ـ کاری دەکرد . برایان ناوی ـ عەبدولئیلا ـ و کوڕی برایان ـ ناجی ـ ی ناو بوو . ئەسمەر و سێ خوشکی عیـراقیان بـەجێهێشت ! سالی 1957 ڕۆژێکیـان لە بەغدادا لەسەر جادەدا یەکێك قسەی لەگەل کردم . دەنگەکەم لا ئاشنا بوو . گوتم : « ئەتۆ ئـەو نیت ؟ » گوتی « بـەلێ ! » ئەسمـەر بوو دەگـریا . گـوتم : « بۆچ

دەگرییت ؟ « گوتی : « بۆ بەختی خۆم ! « بۆی باس کردم کە تووشی نـەخۆشیی سەرەتان بووە و مەمکێکیان بڕیوەتەوە . گوتیشی لەلای برازاکەیەتی و ئەوانی تر ڕۆییشتوون . ئیتر نەمدییەتەوە . بۆیشیان گێڕامەوە کە زەرد لاواز بووە و پۆشتـە نەبووە و منیش هەندێ پارەم دایە . کامل کاکە ئەمین لە ماڵیکدا و لە دانیشتنێکدا دیبونی و ئەو بوو بەهۆی هاتنیان بۆ ڕادێو و گۆرانیی گوتنیان . سێ چووار ساڵێك گۆرانییان بۆ رادێو تـۆمارکـرد . دەنگیان کـەلێك خـۆش و بەزەووق بـوو . عەلی مەردانیش فێری گۆرانیی کردن . ( تێبینی : قسەکانی حەسەنی جـزیری زۆر نزیکترە ، هەڵەیشی لە ناوی نازدار و ئەسمەردا کردووە کە جارێك گـوتوویـەتی : ئەسمەری گەورە ڕۆییشت و جارێك لە 1957 دا ئەسمەرم دییت . راستییەکەی « ئەسمەر » ی خوشکە پچووك ماوەتەوە و ئەو هەڵەیەی ئەویش مایەی بێچاویی کاك حەسەنە و هیچی تر ! چونکە وێنەیان لای کاك کامل ئەمین ناسراوەتەوە .

7 — د . عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ . لە 12 / 1 / 1983 دا لە دانیشتنێـك و ڕایەڵەی باسێکدا ، کە ناوی ئەم جووتە خوشکە هاتە ناوانەوە ، لەسەر داوای خۆم ، ئەمانەی بۆ گێڕامەوە وەك لە بیری ماوە . گوتی : لە دەمە دووایی هاتنی ساڵی 1948 و هـاتنی 1949 : تشرینی یـەکەم بـۆ کانـوونی دووەمی 1949 لەگـەڵ پەیدابوونی یەکەم تیپی تەمسیلیی رادێوی کوردیی « تەمسیلی یەکسەر » ، کە شەماڵ صائیب میحوەر بوو ، ئەم نازدار و ئەسمەر فـەرهادە چـارو بارە دەورێکی پچووکیان لەگەڵ دەبینین . خوێندەوار یشیان هەبـوو . یەکێکیـان تەنانەت ئینگلیزی دەزانیی ! .

8 — : مامۆستا کامل کاکە ئەمین ـ ی یەکەم باس‌بێژ و چاودێری رادێوی کوردیی ڕۆژانی 20 / 4 / 1983 , 29 / 4 / 1983 لەمەڕ ئەم جووتە خوشکە کە وێنەیشیانم نیشان دا و یادی کردنەوە ، ئەم باسانەی گێڕایەوە :

لە ساڵی 1951 دا ( بیبری بۆ ئەو ساڵە دەچوو [ ك . ر . م ) چووم بۆ دێیەك لە عەشائیری سەبعە لای قەزای عەقرە کە باوکم زەوی لەو ناوەدا کڕیبوو دەمویست ساغی بکەمەوە . لە دێیەك وا بزانم « دەحلەڕێ » ی پێ‌دەڵێن کە دەکەوتە سەر جادەی عەقرە ، لای موختاری ئەو دێیە . وا بزانم « ساڵح ئاغا » ی نـاو بو ، بـووم بە میـوان . ئەم دوو خوشکەی بانگ کرد گۆرانیی بادینانی بێ‌گواتن . منیش پێم گوت کە بیاننێری بۆ بەغدا بۆ رادێو بۆ لام . لەپاش دە پانزە بیست ڕۆژێك ناردنی و منیش تەکلیفی عەلی مەردانم کرد کە گۆرانیی سۆرانییان فێر بکات چونکە گۆرانیی بێژی سۆرانیی بـە « دەنگی ئافـرەت » نەمان بوو . مانگێکی نەبرد عەلی مەردان گۆرانیی بۆ دانان و فێری کردن و ئەوانیش ئاهەنگێکی گۆرانیی نیو سەعاتییان بە 4 دنیار دەگێڕا . لە کۆرسیشدا کـاریان کـرد . گۆرانیان وەك من بزانم لەسەر « سیم » تۆمار کرد . بەلام بێجگە لەوانەی کە تۆ دەڵێیت ئەمەندە لە رادێودا هەیە ، زیاتریان گوتووە . زیاتر لە 20 گۆرانیی . بە باوەڕی من تا 1954 لە رادێودا بوون و بۆ ناوەکانیشیان : خۆخی = نازدارە کە خوشکی گەورەیە . ماری = ئەسمەرە کە خوشکی پچووکە و من ناووم نان نازدار و ئەسمەر فەرهاد . دەنگیان زۆر خۆش بوو . ماری ئینگلیزی‌یەکی باشی دەزانیی . گۆرانیی تریان هەبوو وەك : بارانە : ژ 1 ، بارانە : ژ 2 . هەروەها ئای ئایە بەلام بە مەقام نا . بۆ تەمسیل‌کریشیان رەنگبێت وابێت و شەماڵ صائیب فێری کردبن . ناشزانم چییان لێ بەسەر هات ، بەلام دەزانم کـەس و کاریان لێرە نەمان . پێڕێ ناویش ئەوە ئەسرین شیروانە . بەلام دوو ئافرەتی تر هاتن گۆرانییان دەگوت : یەکێکیان « مەقبوولە » ی ناو بوو ئەلماس محەممـەد مێنای و بـە بادینانی گۆرانیی گوت . ئەوە زۆر نەمایەوە و شووی کرد . یەکێکی‌تر هات ناوی « لەیلا عەزیز » بوو . ( تێبینی : لەیلا عەزیز = گولیزاری گۆرانیی‌بێژ بەشێوە زمانی بادینانی ؟ کە وا بزانم تەنها یەك گۆرانیی دیاری لە رادێودا ماوە / ك . ر . م )

9 — کەریم سەعید زانستی باس‌بێژ و وەرگێر بووە لە رادێوی کوردیی بەغدا کە هێشتا لە ژیاندایە . چەند هۆنراوی گۆرانییشی بـۆ عەلی مـەردان داناوە ، وەك هـۆنراوی گۆرانیی « ئەی یاری گولعوزار » و « هەورە هەوری بەهارە » و « ئەولێوە ئاڵە » .

10 — سەعید شابۆ ، مووسیقی‌یەکی رادێوی بەغدا بووەو « تیپی مووسیقەی رادێوی کوردییشدا بووە و کورد نەبووەو بە بڕوای من ئاوازەکە هەرهی عەلی مەردان بووە و ئـەو لایەنی دابـەش‌کردنی مـووسیقەکـەی لەسەر بـووە و وەك خۆیشم لەو مەیدانەدا سەرنجی زۆرم داوە ، شتی وا رووی داوە و لایـەنی ـ پارە ـ کـەش دەوری هەبووە .

11 — ئێستاش بۆ یادگار دەقەکانی ئەو پرۆگرامانەم لە لا ماوە .

12 — لە نێو کارمەندە کۆنەکانی رادێودا بییـرو ڕا لەمەڕ داهـاتنی تیپ ریکۆردر = شریت ، جۆر بەجۆرە . هەندێك دەڵێن لە 1955 دا یان 1956 دا یان 1957 دا پەیدا بووە .

13 — لە گەرمەی پووونووس کردنـەوەی ئەم بـاسەدا بـووم کە ڕاوەستـام و خۆم بـۆ بەڵگەییکی‌مێژوویی تەرخان کرد کە بیدۆزمەوە : لەنێوبـەرنامـەکانی ڕۆژانـەی رادێودا کەی ناویان هاتووە ؟

سەرئەنجام بەڵگـەیەکی نـووسراومـان دۆزی‌یەوە کـە دەڵێت لە ( 16 / 7 / 53 — 6/40 [ هەتا ] 6/50 : گۆرانی‌ی نازدار و ئەسمەر ) ، بڵاو دەکرێتەوە . من ئەم مێژووە بە کلیلێك دەزانم و هانمان دەدات بۆ وورد بوونەوەی تر کە کاتێکی زۆری دەوێت !

14 — لەمەڕ مریەم خان بنووارە گوتارمان [ مریەم خان گوڵێکی خەمگین : هاوکاری ـ ژمارە : 502 . 3 کانوونی یەکەمی 1979 + ژمارە : 503 . 10 کـانوونی یـەکەمی 1979 . ] .

15 — لەمەڕ ئەلماس محەممەد بنووارە گوتارمان [ ست ئەلماسیش مرد : هاوکاری ـ ژمارە : 419 . 27 ئاداری 1978 . ] .

16 — وێنە یادگارەکە بە سەرنجی کاك کامل کاکە ئەمین ، بەم جۆرەیە : ئەوی لەسەر تەختە و شانی لەسەر دووەم داداوە ، خوشکی گەورە : نازدار = خۆخێیـە . دووەمیش : ئەسمەر = ماری‌یە .

( تێبینە : بۆ مێژوو دەبێت بیگێڕییەوە ، لە نێو گۆرانیی‌بێژانی عەرەبییدا : لەیلا موراد و ئینساف مونیر و گەلێکی تر ، ـ جوو ـ بوون ، ئەوا دایکی جەمال پێش شووکردنی بە خواڵی‌خۆش‌بوو ـ ح س ـ ئەویش وەك نازدار و ئەسمەر فەرهاد جوو بوو . بەلام دایکی جەمال کە ئەمە یەکەم جارە ئەم باسە بگێڕمەوە ، پاش شووکردنی بەو کەسەی ناوی برا بو بە ئەوموسڵمان و ئەمجا ـ ح . س ـ ی مێردی دەچووە چایخانەکان و لە هەرکوێ‌یەك قەوانی کۆنی ، یان قەوانی جارانی دایکی جەمالی بدیایە ، بە خوواییشت یان بە پارەکۆی دەکردەوە و دەیشکاند ، کە ئەم راستیی‌یەم لە کـەس و کاری خـۆم و لە گەلێ کـەس بیستووە . دیارە هەر لەبەر ڕێزی کەسانێ لە مێژەوە ئەم باسەم نەدرکاندووە ، وەکو چۆن هێشتا ناوی مێردەکەیم بە « ح . س » نیشان‌داوە ، کەناسراوە . سەرچاوەکانیش هەموویان بۆ ـ ئایینی ـ نازدار و ئەسمەر فەرهاد یەك قسەیان کرد کە نیشانمان دا )

چتو حسن عزیز
1983/3/12

# لە جەنگەوە ..

پەردەی یەکەم
**شوێن** : سەنگەرێکە لە بەرەی جەنگ
**کات** : نیوەڕۆیە .....
ئازاد دەفتەری نامە نووسینی خستە سەرچۆك و دەمێکی خۆش سەیری لاپەڕەی دەفتەرەکەی کرد . جگەرەکەشی هەر وەك پێکەنینە جوانەکەی لە لێوەکانی جیا نەبووەوە .... تەیارەکانیش بەردەوام بوون لەهێرش بردن و ئەو ناوەیان پڕ کردبوو لە هاڕەو دەنگی بۆمبا تەقینەوە ... ئازاد رووی کردە عادلی برادەری ، پاش ئەوەی ئەم دوو جووتە فرمێسکەی کە بەسەر روومەتەکانی ڕێچکەیان بەستبوو سریەوە .... : ئەمڕۆ شەممەیە ؟

**عادل** : بەلێ... بەلام خێرە؟ بۆ ئەپرسی خۆ خوانەخواستە دیسان ئاگری دووری گری نەساندووە لە دەروونتا ...؟

**ئازاد** : بۆنا ... توخوا ئەبێ چ شتێ لەمە خۆشتر هەبێ .. کاتێ کە تۆ باوەش ئەکەی بە باوکتاو دەستی دایکت ماچ دەکەی ...؟

**عادل** : من لە گەلتام ... بەلام ئەمە لە کاتێکا خۆشە کە .. (ئازاد قسەکەی بێ ئەبری)

**ئازاد** : ئەزانم ئەتەوی چی بلێی ... ئەتەوێ بلێی ئەمە لە کاتێکا خۆشە کە سەرکەوین و شەڕ کۆتایی بێ و یەکجاری بگەڕێینەوە ...

**عادل** : ئەی وانییە؟

**ئازاد** : پشووت درێژبێ ... پشت بە خوا هەموو شتێ بە دڵی ئێمە ئەبێ .... رۆژێك دێت ئەمە هەمووی ئەبێتە بیرەوەری و بۆ منالەکانمان ئەگێڕینەوە ... ئێستاش بە یارمەتی خۆت ئەمەوی نامەکەم بنووسم

**عادل** : فەرموو کاکە گیان .... لە گەڵ گەرمترین رێزو سلاوم بۆ مامە برایم و ماموژنە هەمین .

**ئازاد** : زۆر سوپاس (دەست ئەکا بە نووسین) باوکی شیرینم .......
لە کانگای دڵەوە جوانترین سلاوتان ئاراستە ئەکەم و دەستتان ماچ ئەکەم ...
لەو کاتەی وا ئەو نامەیە ئەنووسم فڕۆکەو تۆپەکانمان ئەم ناوەیان هێناوەتە هەژان و دەنگەکانیان جۆری سیمفۆنیا درووست ئەکەن . تەنها ئەم جەنگاوەرانە تێ ئەگەن و چێژی لێ وەر ئەگرن کە ئەزانن چۆن گیانیان بەخت ئەکەن لە پێناو خاك و ئابرووداا .... ئەوانەی کە لە پێکەنین و بزەی سەر لێوی منالانی وولات هەلبەستی سەرکەوتن ئەهوونەوە ....
رێزو سلاوم بۆ ژنە خۆشەویستەکەم (ئازاد لەنووسین ئەوەستێ و سەیری عادل ئەکات)
: ئەرێ بەراست نامەکەی خۆت نارد

**عادل** : بەلێ ... ئێستا وا رێ ئەبرێ بەرەو مەندەلی خۆشەویست ...

**ئازاد** : هیوا دارم بیگاتێ ...

**عادل** : هەروا نامەکەی تۆش
(ئازاد دەست ئەکاتەوە بە نووسین) دوێنێ شەو لە خەوا بینیم ... کورێکم ببوو بە هەمووومان هەولی ئەوەمان بوو ناوێکی جوانی بۆ بدۆزینەوە ... ئێوە هەر یەکەو ناوێکتان دۆزییەوە .... تەنها من نەبێ ئەوەندە هەولمدا ناوێك بدۆزمەوە بە دلم بێ .. کەچی سەر نەکەوتم ..
باوکە گیان ، زۆر یادتان دەکەم و تامەزرۆی دوێنە

خۆشەکەی دایکم .... خوا یاربێ کە هاتمەوە ئەبێ تێر تێر لەو چێشتانە بخۆم کە دایکم لێیان ئەنێ .... تکایە دڵتاڵ بە منەوە نەبێ .... من کە سەربازم ئەرکی سەر شانمە پارێزگاری بکەم لە خاکی وڵات و هەرگیز ماوە نەدەین دوژمن پێ بنێتە ئەم دیوەی سنوورمان عادلی هاورێم و هاوبەشی خۆشی و ناخۆشیم دەستی تۆو دایکم ماچ ئەکات و پەیمانی داوە لە ژن گواستنەوەکەی لێمان بگێرێتەوە .

لە کۆتاییدا رێزو سڵاوم بۆ هەموو ئەوانەی لێم ئەپرسن ... تا ئیجازەی داهاتووم بە خواتان ئەسپێرم .... ئازاد نامەکەی قەد کردو خستیە ناو زەرف و دای خست لە پاشا ئەدرێسی ماڵەوەی لەسەر نووسی ...

**عادل** : خێراکە بەڵکو فریای سەر بازی پۆستە بکەوی .

**پەردەی دووەم**

شوێن / سەنگەرە .. کات شەوە .

عادڵ و ئازاد پێکەوەن و لە ئەو پەڕی خۆ ئامادە کردندان بۆ هێرش بردن ... دەنگی تەقینەوەی بۆمباو تۆپ پیاو کاس ئەکات .

**ئازاد** : عادل

**عادل** : بەڵێ

**ئازاد** : ئەدرێسەکەمت لاماوە ...؟

**عادل** : (دەست ئەخاتە ناو گیرفانی وەك بڵێی دەست لە شتێك بدات و بێ ئەوەی دەری بێنێ .. سەیری ئازاد ئەکات و سەری بۆ ئەلەقێنێ واتە ئەوەتا وا لە گیرفانمە) ئەی تۆ ئازاد ئەدرێسەکەی منت لاماوە ؟

**ئازاد** : بێ گومان عادل گیان .

**عادل** : ئازاد گیان توخوا ئەگەر .....

**ئازاد** : (قسەکەی پێ ئەبڕی) تۆ سەری من ئەگە تەواوی کەیت ..

**عادل** : ئازاد گیان مەسەلێکی کوردی هەیە ئەڵێ بەرخی نێر بۆ سەربڕنیە ئێمەش کە لەم کاتە روو بەرووی دوژمن وەستاوین ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەکوژین و دەشکوژرێین و پێویستی سەر شانمانە کە بەقەد زەررەیەك ماوە نەدەینە دوژمن خاکمان گلاو بکات ...

**ئازاد** : ئەزانم .. ئەمە هەمووی راستە ، بەلام من نامەوێ بیر لەو کاتە بکەمەوەو ئەمە بە چاوی خۆم ببینم ... (شەرەو ئەو ناوە تاریك ئەبێ و رۆناك ئەبێتەوە لە گەڵ تەقینەوەی هەموو گوللە تۆپێك .... جموجووڵی سەربازەکان دیار ئەخات لە کاتی شەڕ کردندا ... عادل و ئازاد بە یەکەوەن خەریکی شەڕن

## دیمەنی —2—

شوێن : ماڵی ئازادە

کات : هەمان کاتی شەرەکەیە ...

مام برایم (باوکی ئازاد) لە گەڵ پێشرەوی کوڕی دانیشتوون و بێ دەنگ و هەست وەك بڵێی چاوەڕێی شتێ بن .... هەمین خێزانی برایم (دایکی ئازاد) لە یەکێ لە ژوورەکانەوە دێتە دەرەوە مەسینەیەك و دەست شۆرێك هەلئەگرێ و ئەیەوێ بگەرێتەوە ژووری .

**برایم** : ها هەمین .... چۆنە ... نزیك ئەبوو .....

**هەمین** : دووعا بکە ...

**برایم** : خوا بەخێری بگێرێ ... انشاء الله کورێکمان ئەبێ ...

**هەمین** : (بە پەلەیە) انشاء الله (دەچێتە ژوورەوە)

**برایم** : ئازاد گیان ئەم شەو تۆ ئەبی بە باوك و منیش ئەبم بە باپیر (سەیرێکی .. پێشرەو ئەکات) پێشرەو تۆش ئەبی بە مام .

لە پڕ گریانی منالێکی ساوا لە ژوورەکەی ناوەوەدا پەیدا ئەبێ

**هەمین** : (سەر لە دەرگا دەردێنێ) برایم مزگێنی کوڕیکمان بوو ..

## دیمەنی —3—

کات / هەمان شەوو کات و ساتە شوێن بەرەی جەنگە ... لەگەڵ تەقینەوەی گوللە تۆپێك شوێنەکەروناك ئەبێتەوەو هاوارێکی زۆر توند ئەبیستری ... عادل بە دیار ئەکەوێ ئازادی لە باوەش گرتووە .... لە دووا هەناسەی ژیانیتی : عادل

**عادل** : بەڵێ ئازاد

**ئازاد** : تۆ باوکمت نەدیوە ... وا نییە؟

**عادل** : ئازاد گیان تکات لێ ئەکەم بێ دەنگ بە ...

ئازاد : کەمنت بردەوە ئەی بینی جا ئەزانی چەن پیاوی چاك و لیّهاتوو ... خۆشیشت ئەویّ
عادل : ئازاد گیان دەتۆ (ئازاد قسەکەی ئەبڕی)
ئازاد : باسی تۆم کردووە لای ئەو بەبیّ ئەوەی جاریّ بتبینیّ تۆی خۆش ئەوی
عادل : فرمیسکی ئەسرینەوە ـ
ئازاد : عادل گیان توخوا .. هەردوو لا روومەتەکانی ماچ کەو پیّ ی بلّیّ ئازادزۆر بە پەرۆش بوو بۆ دیتنت ...
عادل : ئازاد گیان پیّکەوە ماچی ئەکەین
ئازاد : نا عادل گیان من ... من .. باوەرناکەم جاریّکی تر چاوم پیّیان بکەویّ ... عادل زۆرم حەز ئەکرد لەژن گواستنەوەکەتدا ئامادەبم
عادل : هەلّبەت .. ئەی تۆ نەیەت کیّ دیّ ...
ئازاد : باوکم با بیّت لە جیاتی من (سەری ئەکەویّتە سەر باسکی عادل و گیانی دەرئەچیّ . عادل ئازاد بەتوندی ئەگوشیتە باوەشی ... لە پاشا ماچی نیّو چەوانی ئەکات و زۆر بە سەبری پیّلووی چاوەکانی ئەخاتە سەریەك

## پەردەی سیّیەم

کات / شەوە
شویّن / مالّی مام برایمە
هەموویان لە مالەوەن ... مام برایم و هەمینی خیزانی و ئەسرینی ئازاد لەگەل پیّشرەوی برا بچووکی ئازاد ... سەیری تەلەفزیون ئەکەن دەنگو باسی شەر ئەخویّنیّتەوە ..
برایم : هەمین ... وابزانم وا زوو ناگەریّتەوە چونکە ئیجازەیان ئەوەستیّ تا ماوەیەکی تر ...
هەمین : خوا بکا هەر دوورە بەلا بیّت . «نەسرین کۆرپەی لە کۆشدایە ... سەیری خەزوور و خەسووی ئەکات ... دەست ئەبا بۆ چاوی فرمیّسکی ئەسریّتەوە .. و ماچی کۆرپەکەی ئەکات»
(دەنگی ئۆتۆمۆبیلیّ دیّتە گویّتان .. لە بەر دەرگا ئەوەستیّ ... لە گەلّ دەنگی زیل لیّدان هەموویان رائەچلەکین
برایم : یاخوا خیّربیّ (دەرگا ئەکاتەوە) چاوی ئەکەویّ بە سەیارەکی عەسکەری لەبەر قاپی وەستاوەو سەندووقیّکی لە ئالاّپیّچراوی بە سەرەوە بەستراوە .
برایم : فەرموون خیّرە .
عادل : مام برایم ؟
برایم : (زاری ووشك بووە) . بەلّی منم
عادل : باوەشی پیا ئەگریّ و ماچی ئەکات
برایم : (چاوی بریّتە سەندووقەکە) ئازادت بۆ هیّنامەوە؟
عادل : بەلّیّ مامە گیان
برایم : تۆ عادلی برادەری ئازادی (دەنگی هەمین لە ژوورەوە دیّت)
: کیّ یە برایم ... ئازادە ... دەم زانی دلّم روون بوو کە ئەم شەو ئەگەریّتەوە
برایم : بەلّیّ خۆیەتی ... (ئەچی بۆلای سەندووقەکە پاش ئەوەی دەستیّك بەچاوەکانی دا دیّنیّ و فرمیسکی ئەسری ...) .. بەخیّربیّیەوە ... رۆلەگیان سەر چاوی باوکت ... ئەزانی بووی بە باوك .. کورەکەت زۆر جوانە ... بەلام تۆ نەت ووت چ ناوی لیّ بنیّین ...
(هەمین و نەسرین و پیّشرەو دیّنە بەر دەرگا کە ئەم دیمەنە ئەبینن)
هەمین : برایم خیّرە .... چی قەوماوە .
برایم : هەمین دەزانی کیّ یە؟
هەمین / ...
برایم : باوکی سەربەستە .... شەهیدکرا
هەمین : ئازاد شەهیدکرا
برایم : بەلیّ... ئازاد گیانی خۆی کردە قوربانی لەریّی پاراستنی وولات و بنیات نانی دووا رۆژیّکی رووناك بۆ سەربەست و هەزاران منالّی ئەم وولاتە
عادل : مامە برایم ... ئازاد شەهیدەو شەهیدیش هەر دەم لە ئیّمە پایە بەرزترن
برایم : (دووبارە عادل ئەخاتەوە باوەشی) زۆر راستە ...
عادل : بۆیە تکا ئەکەم دلّ تەنگ نەبن
برایم : مەرج بیّ نەگریم و نەیەلم کەسیش بگری.

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر

ئامادەکردنی : شوان

•

( لەدایك بوون و مردن لە کوردەواریدا )

لە چوارچێوەی چالاکیەکانی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەری لە شاری هەولێر ، ڕۆژی چوار شەممە 14 / 9 / 1983 مامۆستا عومەر ئیبراهیم عەزیز بە ناونیشانی ناوبراو کۆڕێکی ڕۆشنبیری پێشکەش کرد .

مامۆستا عەزیز حەریری کۆڕەکەی بەڕێوە دەبردو لە سەرەتادا کورتەیەکی ژیانی مامۆستا عومەری پێشکەش بە ئامادەبووان کردو ووتی مامۆستا عومەر :

* لە ساڵی 1957 لە گوندی دینگاوەی سەر بە ناحیەی قەراج لە دایك بووە .
* ساڵی 1969 — 1970 خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی لە دوڵە سزەی سەر بە ناوچەی قوشتەپە تەواو کردوە .
* ساڵی 1973 — 1974 خوێندنی قۆناغی ناوەندی لە ناوەندی قەندیل لە هەولێر تەواو کردوە .
* ساڵی 1974 — 1975 چۆتە قوتابخانەی خانەی مامۆستایان لە شاری دهۆك .
* ساڵی 1976 — 1977 لە گوندی خرە بەردانی ناوچەی قەراج بە مامۆستا دامەزراوە .
* ئێستا بەڕێوەبەرو مامۆستای قوتابخانەی خرەبەردانە لە دەشتی قەراج .
* بەرهەمی چاپکراوی : تیتلەو بیبلە ( کۆمەڵە چیرۆکێکی فۆلکلۆری منالانەو ساڵی 1980 بەچاپ گەیێنراوە .
* سێ کۆڕی لە بارەی فۆلکلۆری کوردیەوە بەم شێوەیە پێشکەش کردوە .

1 — یەکەم کۆڕ : ساڵی 1977 لە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەری لە هەولێر .

2 — دووەم کۆڕ : ساڵی 1978 لە وەرزی ڕۆشنبیری یەکێتی نووسەرانی کوردا .

3 – سێیەم کۆڕ : ساڵی 1980 لە وەرزی ڕۆشنبیری یەکێتی نووسەرانی کوردا .

## ( باسەکەو فۆلکلۆری کۆمەڵایەتی کوردی )

لێکۆڵەرەوە سەرەتاو بە شێوەیەکی خێرا باسی فۆلکلۆری کۆمەڵایەتی کوردی کردو ئەوسا کرۆکی مەبەستەکەی خۆی پێوە گرێداو وتی :

[ ئەم بەشەی فۆلکلۆر : هەموو خووڕەوشت و هەڵس و کەوتێکی کوردەواری دەگرێتەوە ، کە بە زۆری لەسەر بنچینەی هەرەوەزی کۆمەڵایەتی دامەزراون .

لەم هەموو نەریتی کوردەوارییانە لێرەدا تەنیا باسی دووانیان دەکەین ئەوانیش ئەمانەن -

(1) منداڵ بوون و چۆنێتی بەخێوکردنی تاکو هێنانە خوارەوەی لەسەر لانك (بێشکە) .

(2) مردوو مردن و شێوەی بەڕێکردنی پرسە . دوای ئەوە ڕاستەوخۆ لەو دووبەشە دوا کە ناوی بردن .

## (( منداڵ بوون و چۆنێتی بەخێوکردنی ))

مامۆستا عومەر بە شێوەیەکی دوورو درێژ لە بارەی چۆنیەتی بەر لە منال بوون و چۆنیەتی منال‌بوون و بەخێوکردنی دوا ووتی : [ هەروەك باوەو وتراوە لە دوای تەواوبوونی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ کات‌ژمێر و نۆ خولەك یا ئەوەتە دوای حەوت مانگی منداڵ دەبێ ، بۆیەش بە نۆمانگی و حەوت مانگی یە منداڵ دەبێ و دەژی ، چونکە لەلایەن هەندێ لەکۆمەڵانی کوردەواریمان کردویانە بەیاسایەك و تاقی‌یان کردۆتەوەو وتراوە لەبەرئەوەیە : چونکە مانگەکان تاقن ، دەی ئەگەر ماوەی منداڵ بوونەکەش جووت‌بێ ئەوە منداڵەکە نازێت ] .

دوای ئەوەی هەندێ بیروڕای باوی ناوکۆمەڵگای هەندێ ناوچەی کوردەوای روونکردەوە ، بەشێوەیەکی ورد باسی ئەوەی کرد کەچۆن ئافرەت ژان‌دەیگرێ و مامانی بۆ بانگ



دەکەن و لەوساتەو دوای منداڵ بوونەکە باسی ئەو نەریتانەی کرد کەباون وەك :

1 – ناوك بڕیز و مژدانەی منداڵ‌بوون .
2 – چۆن لەماڵە زەیستانەکەدا شەوارە دەگرن .
3 – چوونیەتی خۆپاراستن لەگوشینی منداڵ لەلایەن شەوەوە .
4 – ئەوخواردنانەی بەئافرەتە زەیستانەکە دەدرێ .
5 – خاڵ بەداری منداڵەکە .
6 – ناونانی منداڵەکەو چۆن بانگ بەگویدا دەدرێت .
7 – وەسفێکی لانك و چۆنیەتی دروستکردنی .
8 – شایانی باسە بەشێوەیەکی جوان و ڕێك‌وپێك باسی قۆناغەکانی سەرەتای ژیانی منداڵی‌کرد کەبەم قۆناغانەدا تێدەپەڕێ : گڕوکاڵ و دانشتنی وگاگوڵکێ و دارەدارەو پێکەنین و قسەکردن .

دوای ئەوە هاتە سەر بەشی دووەمی باسەکەی .

## ( مردن و شێوەی بەڕێکردنی )

مامۆستا عومەر لەم بەشەیدا باسی ئەو مرۆڤانەی کرد کە لەسەرەمەرگدا فریای ئەوەدەکەون سوورەتی (یاسینی) ی قورئاتی پیرۆزی بەسەردا دەخوێنن و وەسیەت دەکات ... هەردوای ئەوەی ، ئەومرۆڤە کۆچی دوای دەکات ئەوسا ،

نەریت و چونیەتی شوشتنی و شێوەی کفن پۆشیوو بەڕێکردنی بۆگۆڕستان باس کرد .
مامۆستا عومەر پەڵوپۆی باسەکەی بۆشێوەو جۆری پرسەو هەڵوێستی خەڵکی گوند یا ناوچەکەبرد ، شێوەی پرسەی پیاوانی لەژنان جیاکردەوە ، هەر بۆیە بەشێوەیەکی تێروتەسەل باسی پرسەی ژنان و جۆرەکانی شین و لاواندنەوەی کرد .

( گریانی ژنان و دولکەو ئاوازەکانیان )

لەم ڕووەوە مامۆستا باسی شین و گریان و دولکەی ژیانی ناوچەیەکی ژیانی کوردەواری کردو نموونەی بۆ هەریەکەیان هێنایەوە کەبریتین لەمانە :

١– شینی کەسم نەما :
نموونە

کەسم نەما کەسی کەسان
کەسم نەما لە مەجلیسان
کەسم نەما بکا قسان

٢– شین و گریانی دیوەخانی :
نموونە :

دیوەخان و هەیوانە
پاش وپێشی تەلانە
کوڕەی لەناو میوانە

دیوەخان خراو خرە
هەرچوار دەورەی شلخورە
حاجیمان تازە کوڕە .

٣– شینی لاوژ یا لاوژۆکە
نموونە :

لاوژ لەسەر بانێ
دەکوتی دەرمانێ
ئەشقەو لە کچێ مامێ

لاوژە چوە ئاتی
نەی خوارد لە باراشی

٤– شینی هێری هێری :
نموونە :

ئەو هێرە لە دەربەندی
ئەو شەڕە لە دەربەندی
بەزرێ و شەقە بەندی
چەند مەردەو هەمەوەندی

٥– شینی مەمکی نازدارێ : ئەم شینە بۆ کیژی گەنجی شوو نەکردوو یان ئەوئافرەتانە دەگوترێ کە جوانە مەرگ بوون و خێریان لەجوانی خۆیان نەدیوە .. نموونە :

(1)

مەمکی نازدارێ دوو زەردەبێیە
دەستی مەدەنێ لەبن کەوێیە
کاکی بزانێ خەجەی دەوێیە

(2)

مەمکی نازدارێ دوو سێوی تارە
دەستی مەدەنێ هەری مەمارە
کاکی بزانێ خەجەی هەریارە

(3)

مەمکی نازدارێ دوو سێوی ترشە
دەستی مەدەنێ رایان مەکوشە
کاکی بزانێ خەجەو قوماشە

٦– شینی قەڵغان و شمشێر : ئەم شینەش بۆ کەڵەپیاوی ئازادو سوارچاکی مەیدان دەوترێ . نموونە

قەڵغان و شمشێر ماینەکەی شێیە
تەقەی تفەنگان دێ لەومیرە دێیە
پاشی ئەولاوەی میر کوڕمان کێیە

لێکۆڵەرەوە جگە لەو بابەتانەی پێشو باسی ئەم شین و گریانانەشی کرد : [ کەوەکەی دەوێ ، قوشەن هاتەوە ، بووکانە بووکانە ، بووکێ ، دولکانە ] .
شایان باسە هەریەك لەویشن و گریان و گریان و لاواندنەوانەیەی پێشکەش کرا ، ئاوازێکی تایبەتیان هەیە .



هـەندێ لەو ئـاوازانـە بـە دانشتنـەوە و بـەشێکیـان بەوەستانەوە دەوترێن .. هەروەها تیایاندا هەیە بەتاك و تەنیا کەسێك یان بە کۆمەڵ دەوترێن .

دوای ئەوەی موحازیر باسەکەی پێشکەش کرد ، کۆمەڵێ پرسیاری جۆراوجۆر رووی تێکردو ئەویش بەپێی بۆچـوونی تایبەتی خۆی تیشکی ڕۆشنایی ئاڕاستە کردن .

**[ چەپکێك لە مەتەڵەکانی فۆلکلۆری کوردی ]**

بەتەنگەوە هاتنی پاراستن و ، گەشەپێدانی کەلەپووری نـەتەوەیی هـەر نەتـەوەیەك نیشـانەیـەکی ئاشکـراو دیاری چـالاکی و دڵسـۆزی ڕۆڵەکـانی دەگـەیێنێ . لە کـۆمـەڵگـای کوردەواری خۆشمـاندا ئـەم دیاردە دڵخـۆش کەرە بـەزەقی هەست پێ دەکەین ، لەمـەڕ ژیانـەوەی تێکڕای لایـەنەکـانی کەلتووری کوردی ، گەلێ هەوڵ و تەقەلای مەزن و پیرۆز دراوەو هەریەکەشیان خانەو شوێنی شیاوی خۆیان پێبڕاوە .

( چەپکێك لەمەتەڵەکانی فۆلکلۆری کوردی ) ناونیشانی ئەولێکۆڵینەوە بەنرخەیە کەمـامۆستـاو شاعـیر کاك ڕۆستـەم بـاجەلان لەهـۆڵی بەڕێـوەبەرایـەتی ڕۆشنبیری جـەماوەری لەهەولێر پێشکەشی کرد .

باسەکـەی مامـۆستا ڕۆستـەم شێوەیـەکی ڕێك وپێکی زانستانەی لەئامێز گرتبوو ، لەبـەر ڕۆشنایی بـەرنامـەیەکی دیاریکراو لەوبەشە ( مەتەڵ لە فۆلکلۆری کوردیدا ) دوا .

سەرەتا بەم شێوەیە دوا : [ .. هەر چـەندە زانـایان و پسپـۆڕانی فۆلکلۆر لەجیهـانداوا دەگـەیێنن کەوا پێچـوون و یەکێتی یەك هەیە لەنێوان جۆرەها فۆلکلۆری میللەتان سەرەڕای ئـەوەش دانیـان بـەوەدا نـاوە کـەهـەر میللەتێـك خـاوەنی کەلووپووری تایبەتی خۆیەتی کەڕەنگ دانەوەی باری ڕیالستی ژیانی میللەتەکە نیشان دەدا ، بۆیە ئێمەش لێرەدا دووپـاتی دەکەینەوەو دەڵێین : ـ
گەلی کوردیش لەبواری فۆلکلۆردا گەلێ دەوڵەمەندە .. ] .

**( مەتەڵ یان زاخاوی مێشك )**

مامۆستـا ڕۆستەم بـەپێی بیروڕای خـۆی سەبـارەت بەمەتەڵ دەدوێ و بەهۆیەکی چالاك و ڕاهێنانی مێشکی دادەنێ [ مەتەڵ نیشانەی زیرەکی و زیخی و ڕۆشنی یە ، لەجـەرگەی ژیانی کوردەواریماندا هەڵقوڵاوە .... ئەو مەتەڵانە هـەروەکو ڕاهێنان و تاقی کردنەوەو زاخ دانی مێشك و مشت وماڵ کردنی لەکۆنەوە تائێستا بەکار هاتووە ] .

لێکۆڵینەوە لەهەر بوارێکی ژیانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی ی دێرینی هەر نەتەوەیەك کارێکی سووك و ئاسان نی یەو پێویستی بەهەوڵ و تەقەلاو خۆماندو کردنێکی هەمیشەیی هەیە ، دیارە لەم رووەشەوە باجەلانی درێغی نەکردوە :

[ ئەو جۆرە مەتەڵانەی ئێستا لەژێر دەستمدانە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە سەر ساڵی (1973) کـەبۆ یـەکەم جـار بەسیفـەتی مـامۆستـا لەناوچـەی بـاڵەك دامـەزرام ، تـاسـاڵی 1979 کـە گواسترامەوە شاری هەولێر ، لەم ماوەیەدا گەلێ کون و قوژبن و کەلێنی ئەم ناوچەیە گەڕام وەك گوندی : بێشێ و گەزنە چومان وجۆجاڵۆك و پیر ئۆمەر و ڕۆست و گرتـك و شیرکـاوەو ڕەزان و شێوەلوك و ناوبەرگەو گۆرۆنی و سەکری سەکـران و شێخان و مەمی خەلان و بن دایزان و خۆشکان و مەران و زینوێ و خەلان و ڕایات و وەردێ و دیلزێ و گەلێ گوندیتر بەهـۆی تۆمـارکردن و گفت و کۆ کردن لەگەڵ هاولاتیانی ناوچەی ناوبـراو سەرەرای ئەمەش کـەسوودێکی زۆرم لەنـاوچەکـانی تری کـوردستان وەرگرتبوو ] .

مامۆستا ڕۆستەم لەلیکۆلینەوە کەیـدا دەریخست کە لەئەنجامی ئەوکەرەسانەی چنگی کەوتووەو توێژینەوەی قوڵ و وردی لەسەرکردوە ( مەتەڵ) لە فۆلکلۆری کوردیدا پێنج جۆرەو هەریەکەشیان لەخانەیەکی دیاری کراودا خۆی دەبینێتـەوەو سیماو شەقڵی تایبـەتی ی لەبەشـەکانی دی جیـا دەکاتـەوەو بریتین لە :

**جۆری یەکەم :**

بەلای لێکۆڵەرەوەوە ئەم بەجۆرە بریتی یە لە : [ چەنـد شتێکی شاردراوە بەهۆی گرێ یەکەوە بەستراوە ، ئەوکەسەی داوای هەڵێنانی ئـەم جۆرە مـەتەڵە دەکـا وەسفی ڕوخسارو هەندێ شتی بنەڕەتی لەمەتەڵەکەدا دەکا کەئەو ڕوخسارو شتە بنەڕەتیانە تەنیا بەسەر ئەو مەتەڵەدا دەچەسپێ و پەیوەندی بەهیچ شتێکی ترەوەنی یە ، کردنەوەی ئەم جۆرە مەتەڵە کارێکی ئاسان نی یە بەڵکوپەیوەندی بەهۆشیاری و زیرەکی ئەو کەسەوە هەیە ]

نموونە بۆ جۆری یەکەم :

داره‌كم هه‌یه دوانزه لكی هه‌یه
هه‌ر لكه‌ی سی (30) په‌لكی هه‌یه
هه‌ر په‌لكه‌ی لایه‌كی ڕه‌شه‌و لایه‌كی سپی‌یه

بێگومان ئه‌وكه‌سه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه هه‌ڵده‌دا پێویسته له‌سه‌ری به‌قووڵی بیربكاته‌و ، كه‌هیچ دارێك نیه ئه‌و چه‌شنه سفه‌تانه‌ی هه‌بێ ، به‌ڵكو ئه‌و سفه‌تانه به‌سه‌ر شتێكی شاراوه‌دا ده‌چه‌سپێ‌و په‌یوه‌ندی به سروشته‌وه‌یه مه‌ته‌ڵه‌كه ئه‌م واتایه ده‌گه‌یێنێ :

مه‌به‌ست له داره‌كه ساڵه‌و له‌دوانزه لكه‌كه دوانزه مانگه‌یه وه‌مه‌به‌ستیش له (30) سی په‌لك (30) ڕۆژی مانگه‌و ، ڕۆژیش واته (شه‌و ڕۆژ) لاڕه‌ش‌و سپیه‌كه‌یه . یان نموونه‌یه‌كی‌دی

سپی‌یه وه‌كی كه‌شكی
گوێ‌ی وه‌كو گوێ‌ی مشكی
ئه‌مشكه ، نه كه‌شكه . مه‌به‌ست ( له‌گوێ شه‌یتا نۆكه‌یه )

**جۆری دووه‌م :**

سه‌باره‌ت به‌م جۆره‌شیان مامۆستا ڕۆستەم ده‌ڵێ :

[ جۆری دووه‌م به‌پێچه‌وانه‌ی جۆری یه‌كه‌مه‌وه ، ئه‌وكه‌سه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه ده‌ڵێ ، نایه‌ت وه‌سفی ڕوخسارو شتی بنه‌ڕه‌تی مه‌ته‌ڵه‌كه بكا ، به‌ڵكو چه‌ند وشه‌یه‌كی ڕیزكراو ده‌ێنێ ، داوات لێ ده‌كات چه‌ندجارێك به خێرایی مه‌ته‌ڵه‌كه دووباره بكه‌یته‌وه ، بێ گومان دووباره كردنه‌وه‌ی ئه‌م جۆره مه‌ته‌ڵه‌ش كارێكی ئاسان نی‌یه ، به‌ڵكو ئه‌م كاره په‌یوه‌ندی به‌زیره‌كی‌و هوشیاری‌و زمان ڕه‌وانی‌و توانایی ئه‌و كه‌سه‌وه هه‌یه مه‌ته‌ڵه‌كه هه‌ڵده‌دا چوونكه وشه‌كان به‌زۆری له‌یه‌ك ده‌چن‌و دووباره كردنه‌وه‌یان به‌خێرایی ، مرۆڤ تووشی زمان ته‌ته‌ڵه‌یی‌و هه‌ڵه‌ی گه‌وره ده‌كات ]

نموونه بۆ جۆری دووه‌م ، به‌جۆرێك داوا له‌وكه‌سه ده‌كرێ كه مه‌ته‌ڵه‌كه هه‌ڵده‌ێنێ ده‌بێ زیاتر له (7) جار به خێرایی بیڵێته‌وه ، وه‌ك :

گه‌یشتمه تلۆیه‌كی ڕیخن
هه‌ر ڕیخم برد له بۆ ده‌می
ده‌می هێنا له‌بۆ ڕیخێ .

**جۆری سێیه‌م**

مامۆستا ڕۆستەم پێ‌ی وایه ئه‌م جۆره‌یان بریتی‌یه :

[ له‌چه‌ند وشه‌یه‌كی ڕیزكراو كه گرێ‌یه هه‌ر له‌ناو وشه‌كاندا خۆی حه‌شارداوه ، ئه‌وكه‌سه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه هه‌ڵده‌دا پێویستی به‌وه‌هه‌یه ته‌نیا بیرله‌دارشتن‌و واتای‌وشه‌كان بكاته‌وه ، ئه‌وه‌ش په‌یوه‌ندی به‌زیره‌كی‌و هوشیاری‌یه‌وه هه‌یه ، ئه‌وه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه دێنێ به‌خێرایی پیتی‌و شه‌كان تێكه‌ڵاو یه‌كتری ده‌كا بۆسه‌ر لێشێواندن‌و بۆ ئه‌وه‌ی واتای ڕاسته‌قینه‌ی ڕسته‌كه‌ی له‌بیربچێ ]

نموونه بۆ ئه‌م بابه‌ته‌یان :

**خوشكه كه‌تان ژنی كامتانه ؟**

واته : كه‌تان كه‌ناوی ئافره‌تێكه خێزانی كامتانه ؟ یان‌وه‌كو

**سه‌ر خڕی ناوشیرن**

لێره‌دا مه‌به‌ست له‌وكیژه سه‌ر خڕه‌یه كه‌ناوی شیرینه .

**جۆری چواره‌م**

سه‌باره‌ت به‌م جۆره‌ش مامۆستای ناوبراوبه‌م شێوه‌یه قسه‌ی كرد :

[ ئه‌م مه‌ته‌ڵه بریتی‌یه له‌باسی شتێك ئه‌وشته په‌یوه‌ندی به‌بابه‌تی مه‌ته‌ڵه‌كه‌وه هه‌یه ، ئه‌وه‌ی لێره‌دا سه‌رنج ڕاده‌كێشێ ئه‌وه‌یه ، ئه‌م جوره‌یان له‌وانی‌دی درێژترن‌و زیاتر پێویستیان به‌مێشك فراوانی هه‌یه‌و ده‌بێ ئه‌وكه‌سه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه هه‌ڵده‌دا به‌ناو گالیسكه‌ی ته‌مه‌ندا ڕۆشیتبێ‌و توانای هه‌بێ ]

نموونه

گه‌لێ جار ئه‌وه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه ده‌كات و ده‌ڵێ ئه‌م مه‌ته‌ڵه‌م بۆ هه‌ڵبده :

ڕه‌وه كۆترێك به ئاسماندا ده‌فڕن ، كابرایه‌ك تفه‌نگیكیان تێ ده‌گرێ له ناكامدا كۆترێك زامدار ده‌بێ‌و ده‌كه‌وێته خواره‌وه .

شایانی باسه ئه‌وه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه ده‌ڵێ ، له ناو مه‌ته‌ڵه‌كه‌دا پرسیارێك ده‌كات‌و ده‌ڵێ :

كابرای ڕاوچی سه‌یر ده‌كا بێچووه كۆترێك له‌ناو سكی كۆتره زامداره‌كه‌دا دیار ده‌بێت ، باشه خواردنی ئه‌م‌بێچووه كۆتره حه‌ڵاڵه یان حه‌رامه ؟

ئه‌گه‌ر ئه‌وكه‌سه‌ی مه‌ته‌ڵه‌كه‌ی لێكراوه زیره‌ك بێت ده‌م‌و ده‌ست ده‌ڵێ : كۆتر هه‌رگیز بێچووی نابێت به‌ڵكو هێلكه ده‌كات .

**جۆری پێنجەم**

سەبارەت بەم جۆرەشیان ووتی :

[ ئەم جۆرە مەتەڵە بریتی یە لەشتێکی شاردراوە ، ئەوکەسەی مەتەڵەکەت بۆدێنێ بەژمارە تاقیت دەکاتەوە ، تۆش دەبێ بیر لەژمارەو دارشتنی ڕستەکە بکەیتەوە ، چونکە گرێ‌یەکە هەر لەناو ڕستەکەدا خۆی حەشارداوە ]

بەنموونە :

**مەڕی مەمی ، مەم شوان**

**نۆ مەڕو ، دەبەران**

**یازدە کسوک ، دوازدە بەران**

**دەکاتە چەند ؟**

وەڵام : هەر دەکاتە (12) دوازدە شایانی باسە کۆڕەکە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبو ئەدەب دوستان ئامادە بوونو گەلێ پرسیاری بەکەڵك کراو مامۆستا باجەڵانیش بەپێ‌ی بیروڕای خۆی لایەنە شاراوەکانی ئەوپرسیارانەی ڕوشن کردەوە .

**ڕۆستەم باجەڵان**

- ڕۆستەم سەلام حەمەدەمین .
- ساڵی 1946 لەشاری هەولێر چاوی بەڕووناکی ژیان کەوتووە .
- ساڵی 1973 بەشی کوردی ـ کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدای تەواوکردوە .
- باجەڵان هەر لەقۆناغی خوێندنی ناوەندی‌یەوە دەستی بەشیعر نووسین کردوەو یەکەم هۆنراوەی ( تاقیم کەوەیان منچیمە ) ی لەدیوانی ( ژانو دڵداری ) دا بڵاوکردوتەوە .
- لەگەڵ گۆڤارو ڕۆژنامەدا شیعرو چیرۆکی وەرگێڕاوو لێکۆڵینەوەی بەکوردی و عەرەبی بڵاوکردوتەوە .
- باجەڵان ئەم نامیلکانەی بەشعر بەچاپ گەیاندوە .

1 — ژانو دڵداری 1977 .
2 — شاعیرێکی تینو لەبەراوی بیرەوەریدا 1978 .
3 — سۆڵین 1980 .
4 — دڵدارەکەم لەشارێکی ترە 1980
5 — دەریا 1981
6 — لەپێناوی تۆدا دەژیم 1982
7 — نیشتمان و مناڵی ڕەشەبا 1982

- شایانی باسە کاك ڕۆستەم باجەڵان ئێستا لە سانەوی ڕزگای لەشاری هەولێر مامۆستایە .



# لە سلێمانی

ئاسۆس : ئامادەی کردووە



**ئێوارە کۆڕەکانی شاری هەڵەبجە**

لەشاری شاعیرانا ، جەماوەر زۆر بە تاسەوە پێشوازی چالاکی ڕووناکبیری دەکەنو بەڕێزەوە ئامادەی ئەو کۆڕە ئەدەبی و هونەری و ڕووناکبیریانە دەبن کە ساز دەکرێن ، لەم مانگانەی پێشوودا چەند ئێوارە کۆڕێك بووە هۆی بەیەك گەیشتنی ووشەو جەماوەر لەوانە :

1 — ئێوارەی ڕۆژی 1983/8/29 مامۆستا ساجد ئاوارە باسێکی بە ناونیشانی [ بەراوردێك لەنێوان دوو چامەکەی نالی و سالم و کەمالی و ناطق ] پێشکەش کرد .

2 — کۆڕێکی تایبەتی بۆ شاعیرە لاوەکان ڕۆژی 1983/8/30 سازکرا ئەم شاعیرانە سەروچەپکە شیعریان پێشکەش کرد « کەمال کۆڵنەدەر ، مەریوان ئەبوبەکر ، ڕزگار حەسەن ، جەلال حاجی بابا »

3 — کۆڕێکی هونەری بۆ هونەرمەند یاسین بەرزنجی سازکرا کە تیایدا باسێکی بە ناونیشانی [ هونەری شانۆو دوولایەنی گرنگی شانۆی کوردی ] پێشکەش کرد .

ئەوەی شیاوی باسە ئەم کۆڕانە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی بۆی سازکردن .







## کۆڕە ئەدەبییەکانی سلێمانی

1 — ڕۆژی 1983/9/1 لە باخچەی یەکێتیی نووسەرانی کورد مامۆستا مستەفا نەریمان باسێکی بە ناونیشانی « کاروانی ڕۆشنبیری کوردی لە سالانی بیستەکانەوە تا ئەم سەردەمە » پێشکەش کرد ، دەربارەی هەر قۆناغێك خاوەن باس سەبارەت بە چاپەمەنیو بزوتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی ڕاژەی نێوانیانی باس دەکرد .

2 — ڕۆژانی 1983/9/9,8 میهرەجانێ لە باخچەی نووسەرانی کورد بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر یەکێ لە ڕابەرەکانی ئەدەبی کوردی سازکرا کە ئەویش ـ ئەمین فەیزی ـ یە .

لەم میهرەجانەدا مامۆستای شاعیر کاکەی فەللاح باسێکی خوێندەوە ناونیشانەکەی ئەمەبوو « چوار نووسینی دێرینو پێناسێکی ڕابەرایەتی ئەمین فەیزی » ، لەسەرەتادا پەنجەشی بۆ بەرهەمە ناودارەکەی فەیزی ڕاکێشا ـ ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد ـ بەخشانە شیعر ئامێزەکەی خوالێخۆشبوو عەبدولواحید نوریشی خوێندەوە کە کاتی خۆی لە پێشەکی کتێبێکیدا پێشکەشی بە گیانی ئەمین فەیزی کردووە .

دووەم باس مامۆستا ئەحمەد تاقانە پێشکەشی کرد ، باسەکە لەپێنج بەش پێك هاتبوو : ژیانو بەسەرهاتی ئەمین فەیزی پەیوەندی بە ناودارانەوە ، پایەی ئەدەبیو زانستی ، بەرهەمەکانی چەند سەرنجێك دەربارەی بەرهەمەکانی .

لە دووەم ڕۆژی میهرەجانا مامۆستا دکتۆر إحسان فؤاد « چەند سەرنجێکی ڕەخنەوانی » لە باسێکی پوختا پێشکەش کرد ، دواباس لە لایەن مامۆستا محمد مستەفا هۆشەنگەوەبوو کە سەرناوی « ئەمین فەیزی بەگ لە شیعری شێخ ڕەزادا » ی درابوویە بەڕاستی یاد کردنەوەی ئەدیبێکی مەزنی وەك ئەمین فەیزی کارێکی پەسند بوو .

### 3 — کۆڕێ دەربارەی تیووری سێیەمی ئاپیا .

هەر لە مانگی ئەیلو لا کۆڕێك بە وناونیشانەیەی سەرەوە بۆ کاك کەمال هەنجیرەیی لە باخچەی یەکێتیی نووسەرانی کوردا سازکرا ژمارەیەکی زۆر لە ڕووناکبیرانی شار تێیدا بەشداربوون .

### 4 — حەسیب قەرەداخیو مەسەلەی سۆفێتی :

ئێوارەی 1983/9/15 جەماوەری ئەدیبو ئەدەب دۆست لە باخچەکانی یەکێتیی نووسەرانا لە پێشوازی باسە گرنگەکەی شاعیر حەسیب قەرەداخیا بوون ، کە دەربارەی (سۆفێتی) بوو جەماوەرێکی زۆر لە ئەدیبان ئامادەبوونو لە لایەن دانیشتوانەوە گفتوگۆیەکی بە پێزی لەسەر کرا .

هەردوو کۆڕی کاك کەمال هەنجیرەییو مامۆستا جسیب قەرەداخی لەلایەن بەڕێوەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەرەوە ساز کران کۆڕی مامۆستا نەریمانو میهرەجانی ئەمین فەیزی لەلایەن دەزگای ڕۆشنبیریو بلاو کردنەوەی کوردیەوە ساز کرابوون .

### 5 — کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانو شانۆنامەی «میراتی»

لە ئێوارەی 1983/9/7 تا کۆتاییی مانگ لە نووسینی قاسم محمدو وەرگێڕانی حەمە ڕەشید هەرەسو دەرهێنانی طه خلیل لەسەر





شانۆی ئامادەیی کوڕان شانۆنامەی «میراتی» لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانەوە پێشکەش کرا .
لەم شانۆییەدا کە دوو سەعاتی دەخایاند 24 ئەکتەر بەشداری نواندنیان دەکرد کە حەوتیان ئافرەت بوون - ئەمەشیان نیشانەی پێشکەوتنی شانۆی کوردی دەر ئەخات - دەوری کاکەلاوو گوڵبەهارو جوانە بەشێوەی کاست دەبینرا واتە هەر ڕۆژەنا ڕۆژەی ئەکتەرێك . خوشکە گەزیزەش تا دوای جەژن بە تەنیا دەوری شیرینی دەبینی بەهۆی دەستپێکردنی تاقیکردنەوەکانی خولی دووەمی زانکۆکان ناچار بەرەو بەغدا ڕویشتەوەو خوشکە بەیان محمود دەورەکەی ئەوی دەبینی .
ئەم شانۆنامەیە خێزانێکی دەرەبەگ نیشان دەدات کە هێشتا ڕوالەتی کۆیلەیی تێدا ماوەو ئایدیۆلۆژیەتیان چەوساندنەوەی ژێردەستی خۆیانە ، لە سەرەتادا دەبینین چۆن ئاغاو کوڕەکانی و میوانەکانی وەرزێرێکی هەژاری چەوساوە کە ( شەماڵ عەبدوڵلا ) دەورەکەی دەبینێ چۆنی دەچەوسێننەوەو بێ ی ڕادەبوێرن و دەماری پیاوەتی لە لەشیا ناهێڵن و کردوویانە بە مەخسەرەو گاڵتەجاڕو شەکەرۆکە کاتێ کە شیرینی کچی پڕ بە دنیا دەقریشکێنی و داوا لە باوکی دەکات کە بەس مەی بخواتەوەو خۆی بکات بە گاڵتەجار لە ناوەڕۆکی گفتوگۆکەیانا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ 30 ساڵە ئەم پیاوە لە ماڵی ئەم ئاغایەدا ڕەنج ئەدا ، ژنەکەشی هەر لەوێ مردووە شیرینی کچیشی لەوەتی فامی کردۆتەوە لەم ماڵەدا ئەچەوسێتەوە . ئەمە هەمووی لە پای قەرزێکی سادە کە ساڵ بە دوای ساڵدا زیادی کردوەو سەنەدو قەباڵە باوکەو کچەی دەست بەس کردووە . لە ئەنجامی شەوێکی پڕ لە ناسۆرا ، شەوێك کە باوکە هەموو داخی خۆیان بێ ئەرێژێ و چی لەناو دڵیایەتی هەڵی ئەڕێژێ ئەمجا ئەوەندەی مەی بە گەروودا دەکەن تا لەپەو ڕوو دەکەوێ و گیانی دەردەچێ . پاش چەند ڕۆژێ میرانی ئاغاش ( عەبدولی حەمە جوان ) دەمرێ ، ئەندامانی خێزان بە شێوەیەکی چاوچنۆکانە دەکەونە مشتومڕ لەسەر میراتی ، هیچ نامێنێتەوە «شیرین» ی کارەکەر نەبێ کە بارمتەی قەرزە ناڕەواکەی باوکیەتی دوو کوڕەکەی میران - قەمووری لە ئەورووپا گەڕاوە ( حەمە ڕەشید هەرەس ) و برا گەورەکەی (دلێرمستەفا) و جوانەی نوێ بووکی کچی میران ( بەیان ڕەشیدو چیمەن علی ) لەگەڵ ئەغا ژنی دایکیانا (ئاشتی عەلی ) ئەکەونە مشتومڕ کە شیرین بۆ کامیان بێت ، هەریەکەیان دەیەوێ بیکاتە کارەکەری خۆی .
شیرین ئازایانە دەنگی دلێری بەرز دەکاتەوەو نەفرەت لە ژیانی کۆیلەیەتی دەکات و بەهیچ کامیان قایل نابێ ، ئیتر دەکەونە ڕاو تەگبیر تا بە یاریدەی مام وسووی پیاو ماقووڵی ڕیش درێژی ئەشەوبیللا هەڵکێش (حیکمەت هیندی) دەگەنە ئەو ئەنجامەی بیدەن بە کاکە لاوی نانەوای خۆیان کە ئەویش چەوساوەیەکی بەردەستی خۆیانە ، بۆ ئەوەی تەلاقی کوڕەکان نەکەوێ کە هەریەکەیان سێ بەسێ ی فڕێ داوە کە ئەبێ شیرین بۆ ئەوبێت .

ئەنجام بەخێر دەگەڕێ کە ئەم دوو زەحمەتکێشە دەبنە هاوسەری یەك بە قسەی گەورەکانیان ناکەن کە لێك جیا ببنەوە بەڵکو قەباڵەی قەرزی ساختەو سەنەدی چەوساندنەوەکەیان ئەدڕێنن و کۆشکی میران بەجێ دەهێڵن وەك دوو باڵندەی لەقەفەز ڕاکردوو بەرەو سەربەستی لە شەقەی باڵ ئەدەن .
دەربارەی ئەم شانۆنامەیە مامۆستا طه خلیل سەرۆکی کۆمەڵەو دەرهێنەری شانۆییەکە دەڵێ :

**« شانۆ ژیانەو ژیانیش شانۆیە »**

بۆیە شانۆم کردە هاوسەرم و گەنجێتی خۆمم پێوە بەست تا بتوانم ڕێبازێکی ڕاست و دروست دوور لە درۆو ڕیایی و پێچ و پەنا بەرامبەر بە چەوسانەوەو ژێر دەستی و هەست بە نەبوونیمان بەربەرەکانی بکەم . تا خواست و ئاواتی بوونمان و داماڵینی ووشەی کۆیلەیەتی کە هەر جارەی جۆرە بەرگێ لەبەر ئەکاو بە میراتی بەجێ ئەمێنێ بۆ کەسانێکی تر بەرامبەر نەتەوەکەم گۆڕکەم » .
لەم شانۆییەدا چەند ئەکتەرێك بە تەواوی دەورەکەیان دەبینی و



چووبوونە ناو شانۆنامەکەوە ، هەندێکیان بە چاکی سەرنجی بینەرانیان ڕادەکێشا لەوانە :

1 — تێکرا ئافرەتەکان سەرکەوتوو بوون بە تایبەتی ئاشتی علی‌و گەزیزە عمر علی کە گەیشتبوونە لوتکەی سەرکەوتن .

2 — عەبدولی حەمە جوان : دەرەبەگێکی ڕووخۆشی بیر پیس چەفتەکەی سەری ، چەفتەی مەلیکی ئەهێنایەوە یادو چەندین بیرەوەری تری لای بینەران ئەوروژاند .

3 — شەمال عەبدوڵلا .. هونەر وەرێکی کارامەبوو لە دەوری شەکەرۆکەی ماڵی ئاغادا ، تۆنی دەنگی ، بزوتنەوەی ، هەڵس‌و کەوتی ، ئاخ‌و هەناسەی دەروونی ، بێزکردنەوەی لە ژیانی کۆیلەیەتی ، مەی خواردنەوەکەی ئەمانە هەموویان جێی پێزانین بوون .

4 — حەمە ڕەشید هەرەس : قەمووریەکەی‌و مرومۆچییەکەی (مقداداد عبدالرضا) ی لە دەوری (ڕۆوف) دا لە زنجیرەی ـ النسر وعیون المدینة ـ دا بیر دەخستینەوە بەلام حەمە ڕەشید زیاتر لە پێویست خۆی قەموور کردبوو ، پشتی زۆرتر چەماندبووەوە ، دەوری ئەم بە باشی لە فەسلی دووەما دەستی پێکرد کە توانی خۆی لەسەرشا نۆکە دیاری بکات‌و سەرنجی خەڵکەکە بۆ لای خۆی ڕابکێشێ .

5 — حیکمەت هیندی : لە دەوری مام‌و سودا گزیرێکی سەرکەوتوو بوو دەورەکەی خۆی پڕ کردبووەوە .

لە ڕاستیدا شتێ هەیە دەمەوێ بیڵێم ، با بە شێوەی پرسیاریش بێ نەك وەك ڕەخنە : ئایا ئەگەر ئەو ووتە (مسجوعانەی) کاك حەمە سعید مصطفی‌و کاك صلاح چاوشین لابرانایە چی لە شانۆنامەکە کەم ئەبووەوە ؟ یان بوونی ئەو ووتانە چی لەو شانۆییە زیاد کرد ؟ جگە لەو تێبینیە هەندێ شتی تریش دەبێتە هۆی مشتومڕ لە لایەن بینەرانەوەو مقۆمقۆی لەسەر دەکرێ وەك .

1 — ئەو ڕواڵەتە کۆیلەییەی ناو ئەم شانۆ نامەیە دوورە لە واقیعی کوردەواری ئێمەوە ، لای ئێمە وەرزێرو ڕەنجبەرو سەپان‌و شوان‌و زەحمەتکێش هەبوە کە کردەی ئەوان‌و بردەی دەرەبەگەکان بووە ، بەلام شێوەی کۆیلەیەتی‌و سەنەدو قەباڵە ڕووی نەداوە .

2 — ئەو جۆرە گاڵتە جاری‌و شەکرۆکەییەش لە دیوەخانەکانی ئاغایانی کوردستانا بەو شێوەیە نەبووە ، بینیومانە کە هەر ئاغایە حەیران بێژو لاوك بێژی تایبەتیان بووە بۆ بەسەر بردنی شەوانی دیوەخان ، یان قسەخۆش‌و حیکایەت خوانیان بووە بەلام نەکراون بە گاڵتەجارو دەمامك لەسەر بکەن ، بە پێچەوانەوە لاوك بێژو قسەخۆشەکان ڕێزیان لای ئاغاو بەگو شێخەکان بووەو قسەیان ڕەواجی هەبووە، سەرەڕای خەڵات‌و بەراتی تایبەتیش .

3 — بۆ ئەبێ کۆتاییەکەی بدرێتە دەست [قەدەر] و کاکەلاو پەلاماری کوڕی میران بدات‌و سەنەدی کۆیلەیەتیەکەی بفرێنی‌و بیدڕێنی ؟ ئایا نابێ کوڕی ئاغا بە فیزێکەوە بڵێ « قوڕ بەسەرتان ئەو سەنەدەتان دڕاند ، دە سەنەدی تری وا لە سندوقەکەی (میران) ی باوکمانا هەیە :

نە ئەبوو ڕزگارکردنی چەوساندنەوە بدرێتە دەست ڕێکەوت دەبوایە لە ئەنجامی یەککرتنی هەموو زەحمەت کێشەکان‌و خەباتی سەختی خۆیاندابێ ! چونکە مەرج نییە هەر شتێ لە کۆمەڵگایەکی ترا وەك دیاردەیەك هەستی پێکرا بگونجێ بگونجێ کە لە کوردەواریشدا ڕووی دابێ ئەوەی شیاوی باسە جگە لەو خوشك‌و برایانەی ناویان هات ئەم ئەکتەرانەش لەم شانۆنامەیەدا بەشداربوون :

قادر مستەفا ، بەختیار عبدە ، فریاد خلیل ، شلێر رحیم ، چیمەن علی ، شەهلا بەکر ، عبدالله احمد ، غفور عبدالله ، کمال فرج ، هاوار قادر مستەفا ، جزا ڕۆوف ، کامەران عبدالرحمن لە کۆتاییدا پیرۆزباییمان بۆ هونەرمەندانی کۆمەڵ‌و هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازین ، هیواداڕین بەم نزیکانە لە بەرهەمێکی نوێی کۆمەڵدا بە یەك بگەینەوە .



# له دهوّك

## كورەك لسەر هونەری

ژزەفەرو چالاكيـين ريبەريـا رەوشەنبيـريا جـەماوەری لدهوكێ ، ل روژا 1983/9/6 كورەك هاتە سازكرن بو سەيـدايێ هونەرمەند «كمال ملكي» ل هولا بزاڤا خاندنگەهی ، ب ناڤو نيشـانێت (هونـەرو شـورەش) . هـژمـارەكـا رەوشـەنبيـرو نفيسەڤان و هونەرمەندا لڤی كوری ئامادەبون . ژريڤە سەيدای كرە باسێ ريڤەچونا هونەری لقونـاخێت ديروكيـدا . وە كارێ هونەری ، بێ كو هونەرمەند بێ رادبو . وە ئاشكرا كر كە هەر كارەكێ هونەری ، مە بڤێت ئـەم دانينە جهێ وی بێ راستو درست ، پێدڤی یە ئەم بنێرينە وی كاری ، دچارچوڤا خەباتو سەركولا جڤاكیو ئابوریو ئينفيعالی دا ، يا كو ئەوكارێ هونەری ژناڤ ، سەری هلددەت . سەيدايێ كمال گەرەم گوت : هەكە

ئەم مێژەكەينێ ، دێ بينين گش نفشتوكێت ديروكا هونـەرێ روژئاڤای ، كەلەك لايێت شارستانەتيا هونـەری ، لروژهەلاتێ ناڤەراست ، چ هزرا بو ناكەتو ب پشت گوهێ خوڤە تاڤێت . وە ئەگەر باس ژی ژێ بكەت ، رابورينەكا بلەز دسەررا دچيت . بێ‌ی كو وان لايێت كوير بێت مروڤانەتیی‌و شارستانەتيا تێـدا ئاشكرا بكەت . لدەمێ ب بەرفرەهی پەسنو زرتێت ، بنياتێت فەلسەڤ ، بێت هونەری لروژئاڤای دكەت . پاشی هات سالوڤێت هونەرمەندێ داهينەر دانە كفشێ ، هەر وسا گرنگيیا هونەری

دژيانی دا بو مە ديارکر ، وە گوت : كو رويدانێت كومەلايەتی وئابوریو راميارێ‌و ئايينی ، بێت هەر چاخو سەردەمەكی ، دكارێت هونەریدا رون دبن . پاش باسێ ليكولينێت بسهورێت سايكولوجييا جوانیێ كر ، ئەڤ بسهورە چاوان هزرێت خەلكی دابـەش دكەن ، دەربـاری رادا هەست پێكـرنا تـاما كـارێت هونەری . ديار كر كو هەر ئێكی هزرا خو يا هەی لسـەر ڤێ چەندێ . ژبو زانينا بهـايێ كارێ هـونەرییی ، كـاك «كمال»ی عەيان كر ، كو يا فەرە بێتە زانين كارێ هونەری ژبەر چ هاتيە چێكـرن ، نێتو مەرەم ژڤێ چێبـونێ چنە . هـەكە مـە بڤێت بـراستو درستی ڤێ بزانـين ، تڤييا جهـو چاخێ وی كـاری بزانين . سەيدا پێڤە چو گوت : هەكە ئەم چوينە ئنتيكخانەكێ وە مە پەيكەرەك ديت ، ئەم دێ ئەگەرێت چێكـرنا وی چێتـر زانين ، هەكە بزانين ، بو جارا ئێكێ بنەجها ڤی پەيكەری كيرێ بو ، ژكێشك پالسێ يان كنيشتێ ئينايە .

وە لسەر رنديیی‌و قەشەنگيیا سروشتی ، ژستێرو هەيڤو گش توخمێن تێدا وە كارتێكرنا وی لسەر هونەرمەندی گوت : هونەرمەند مڤـاو بهايـەكێ مەزن ژ سـروشتی وەردگريت وە ئاسونا چێكرنێ‌و داهينەريێ نيشا مە ددەت .

ئـەڤ بابـەتە هـەر وەكی سەيـدايی گوتی ، پشكـەكە ژگوتارەكا درێژ ، دهندەك كورێت بێن دا ، دێ هێنە پێش كێش كرن . ئەڤ بەشێت ماين ل ژێر ڤان ناڤو نيشانا نە .

- بيرو هزرو فێرگەهێت هونەری
- روژهەلاتو عيراق‌و جهێ وێ ، دهونەرێت جيهانێدا .
- هونەرمەندێ عيراق ، بەریو پشتی شورەشێ .

ئو لروژا پێنجشـەمب ل 1983/9/22 سەيـدا [عبدالسلام صالح]ی كورەك پێش‌كێش كر لسەر فێرگەهكـا دی يـا تورەی ، الرمـزيە [سمبـوليزم] . لپێشيێ سـەيـدای مەسەبێ تورەی وە فێركەها تورەی دانە نياسين . وە بكورتی كرە بەحسێ مەسەبێت تورەی ئەڤێت بەری رەمزيەتێ هاتين .

سەيدايی رامان ژپەيڤا «الرمزيـة» ئاشكـرا كر ، پـاش ئەگەرێت پەيدابونا وێ بو مە خـاندن . ژوانـا : كەڤنيـا رهو رويشالێت وێ ، تێك‌چونا راميارى يا ناپليونێ سی‌یێ ، ناكوكی دناڤبەرا جينا كرێكاراو رەئسماليەتێ .

پاش كاك [عبدالسلام] ی بەحسێ رەمزيـەتێ كر ژلايێ كەلواشی‌و ناڤەروكێ‌ڤە ، ديار كر كـو شينگستێ وێ بێ موكم



«مثاليەتا ئەفلاتونييە» . سەمتێت رەمزيەتێ ژی خوياكرن گوت رەمزيەتی : سەمتەكا غەيبی هەيە ، وسەمتەكا نافخويیو باطنی ، هەر وسا سەمتەكا تايبەتی هەيە دئەزمانیدا . پشتی ب كورتی ئاخفتی كا چاوا رەمزيەت بو خاندنگەها تورەی . سەيدای رێبەرو نوينەرێت ڤێ خاندنگەهێ بو مە ديار كرن وە لسەر هزرو بيرێت وان ئاخفت بتايبەتی لسەر هوزانێ . ژڤان رێبەرو نونيەرا : ئێدجار ئالان پو ـ بودلێر ـ رامبو ـ ڤرلين ـ مالارمێ ـ جيمس جويس ـ پول ڤاليریو گەلەكێت دی . موریاسێ یونانی ل 18 ئەيلولا سالا 1886 بەيان نامەك لسەر خاندنگەها رەمزيەتێ بەلافكر ، ئەڤ سالە بو سالا بونا رەمزيەتێ .

لسەر رەمزيەتێ دئەدەبێ كوردیدا كاك [عبد السلام] چار هوزانڤان گرتن ؛ لطيف هەلمەت ، شێركو بێكەس ، عبدالرحمن مزوری ـ عبدالله بەشيو . چەند هوزانەكێت وان خاندن ئو لدوی هزرو ديتنا خو چەند لايەكێت رەمزيەتێ ديار كرن . كاك [عبد السلام]ی دويماهيكی هەڤدە ژێ رژمەرا خاندن گوت من مفا ژێ وەگرتيە بو بەرهەڤكرنا ڤی بابەتی . پشتی چەند برادەرا گێنگەشە كری لسەر گوتارێ كوڕ بدويماهيك هات پشتی سەعەتو نيڤا كيشايی .

**لگەل ستێركا گەش لئاسمانێ**

**سترانا كوردی**

**«محمد عارف جزيری»**

- سالا 1912 چاڤێن خو لدونيا روهن ڤەكرينە .
- سالا 1952 قەستا ئێزگا كوردی كريە ل بەغدا .
- سالا 1974 تەقاعد بويە .
- 331 ستران تومار كرينە ل ئێزگێ ، درێژی‌يا وان 1877 دەقيقەيە ، پێن كودبنە 31 سەعەتو 17 دەقيقە . ئەڤە ژبل سترانێن وێن دی .
- دژيانا خو یا هونەریدا گەلەك خەلاتێن سەركەفتنێ وەرگرتينە .
- ل ئەرشيڤێ مونەزەما يونسكو ، يێ سترانێن مللەتا ، دو كاسێتێن وی هەنە ، ل ژێر ناڤێ سترانێن مللەتێ كورد
- «جلال الحنفي» دنڤشتوكا خو دا [سترانێت ئيراقيی] ناڤێ محمد عارف جزيری ئينا يە كە ئێكە ژ ستران بێژێت ناڤدار لئيراقێ .

ژبزاڤێن دەزگەها رەوشەنبیریو بەلافكرنا كوردی ، لروژا 1983/9/11 تورەڤانێ هێژا «سگڤان عبدالكريم»ی ، كورانگەهەك پێش كێش كر ، لسەر ژيانو بەرهەمێ ستران بێژێ مەزن «محمد عارف جزيری» .

پشتی ماموستایێ هێژا كاك «محمود زامدار»ی دەرگەهێ كورانگەهێ ڤەكری ميهڤانێن دەلال ، عاشقو شەيدایێن سترانێن رەسەن ، گوهـ دانە خودانێ گەوريا زێرين ، خودانێ پەيڤێن نازكو ئاوازێن شرين «محمد عارف جزيری» پاشی كاك سەگڤانی دەست بگوتارا خو كر لپێشێ لسەر ژينەنيگارا ستران بێژێ مە ئاخفت گوت : «محمد عارف جزيری» خەلكێ طوریيە ل جزيرا بوتا . ژوێری قەستا زاخو كر ، ژبەر هندەك ئەگەرێن راميارىو كومەلايەتی . لوێرێ مامێ وی لوقەنتەك هەبو لسالا 1927 ئينا لجەم وی شول كر . سالا 1932 ژنەك ژجولەمێرگێ ئينا . دەمەكی پشتی ژعەسكەریێ خلاس بوی ، بو سونەچی لدەڤەرا دلێم . هەر ژبچويكاتی ، دەيكا وی فێری سترانا كر ، ئو هنارتە دياربەكرێ ، دا فێری تەمبوير لێدانێ

بيت . ل دهوكێ گوهێ خودا چەند قەوانەكا ، ل دەف هندەك مروڤێن خو . وان سترانا كار تێ كر ، ئەمازە سترانێن



فولكلورى . ل بەغدا ژكومپانيا «بيضفون»را ستران تومار كرن ، لسالا 1934 . ژئێكەمين سترانێن تومار كرين ، سترانا «بەردە بەردە» بو ، وەسترانا «گرێ سيرا بەسيرە» . پاشى كاك سگڤانى ئاشكرا كر ، چونا محمد عارف بو ئيزگا كوردى ، وە ئێكەمين سترانا تومار كرى ل 1952/2/25 ئەوژى سترانا «بەفر بارى» بو . وە لسالا 1956 لزاخو سترانا «بابكو» توماركريە هەر وسا پێڤە چو گوت : براستى مروڤەكێ وەكى محمد عارف يێ كو ژينەكا ب ژارى و ژيرى وبتەحلى برى ، لتم جهێ رێزو شانازيا ملەتى يە . وە ستێرەكا گەشە لئاسمانێ سترانا كوردى . ب دەنگێ خو يێ خوش و شرين ئێش و ژان گوتينە .

ئو كاك سەگڤانى خوياكر ، كو «محمد عارف جزيرى» كارتێكرنەك مەزن هەبو ، ل سەر ستران بێژێن گەنج . هەروسا دپێش ئێخستن و پاراستنا سترانا كوردى‌دا ، ئو ڤەژينا فولكلورى ، ژلەوما پێدڤى‌يە جهەك بالا ژيرا بێتە دانان لناڤ رێزێن ملەتێ مە . براستى زەڤەرو يێ كولەكا جوان و ژێ هاتى بو ، سەيدايێ سەگڤان بيرو رايێن هژمارەكا باش ژهونەرمەندو

ستران بێژێن كورد . لسەر محمد عارفى بدەنگێن وان تومار كربون . ژدەنگ‌گرێ مێهڤانێن هێژا گوهێ خو دانە ڤان بيرو رايان . ژوان هوزانڤانێ هێژاو دلوڤان «صبرى بوتانى» وە ستران بێژ «مجيد عثمان قصاب» ، «يوسف عبو خورتا» ، «سعد الله حسين بامەرنى» ، «تحسين طه» ، «حسين على» وە گەلەكێن دى . بەرى هينگێ هونەرمەندێ داهێنەر «دلشاد محمد سعيد» بشێوەكێ زانيارى لسەر ستران و دەنگ و ئاوازێن «محمد عارف» ئاخفت . لسەر گەريان و بزاڤێن وى لدەرڤەى وەلاتى ، سەيدايێ سەگڤان گوت : «محمد عارف» ل گش كوردستانێ گەريايە . سالا 1961 لگەل «حسن زيرەكى» لقامشلى ستران گوتينە .

وە لسالا 1973 چو بو «لوبنانێ» لوێرێ وە ل مەزنترين هولێ «لبەيروتێ» ، لگەل «عيسێ بەروارى» ستران گوتينە .

وە لدوينى هێژو ڤەژەنين خو هونەرمەندێ مەيێ بها گران كارەكێ مەزن كريە ، دەربارى ڤەژاندنا فولكلورێ جزيرا بوتا .

«محمد عارف» ب خو ژى لسەر هندەك لاێن ژيانا خو ئاخفت ، لبەرى سالێن چلێ . پاش دەست هاڤێتە تەمبويرێ وە لدوى داخازا حازرا چەند سترانەك گوتن . وە لڤێرێ كورانگەهێ بكوتايى هات پشتى دوو سەعەتێن خوش و ڤەشەنگ . سوپاس بو كاك سگڤانى و رەنجيا كێشاى ، سەركەڤتنا ڤى كورى .

ژپروگرامێ بزاڤێن دەزگەها رەوشەنبيرى و بەلاڤكرنا كوردى .

لبارێزگەها دهوكێ ، روژا 1983/9/12 كورەك هاتە سازكرن بو سەيدا «فائق مختار» ى . لسەر «دەست درێژيێن فارس يێن توخم پەرست» گوتار ژپێش سەيداى ڤە هاتە خاندن ژلايێ كاك «رمضان عيسا»ى ڤە . پشتى هينگێ ، خاندنەكا هوزانا دەست پێ كر . شەش هوزانڤانێن گەنج پشكدارى دڤێ خاندنێ دا كر . «نجيب صالح بالايى» دەرگەهێ ڤى خاندنێ ڤەكر . ئەڤا ژێرى ژى كورتيێكە لسەر ژيانا وى .

- كاك نجيب سالا 1962 لگوندێ «ئورە» لدەڤەرا بەروارى‌بالا هاتيە دونيايێ .
- سالا 1976 هاتيە دهوكێ ، وە خاندنا ئامادەيى لوێرى بدويماهى ئينايە .
- ل سالا 1982 چوويە زانكويێ و نهو رێڤنگێ كوليجا پەروەردەيە لزانستگەها بەغدا
- سالا 1977 دەست بهوزانێ كرى‌يە .
- پشكدارى دگەلەك ميهرەجانێن شيعرى‌دا كريە .
- سالا 1983 يێ بويە بەرهەڤكەرێ پروگرامێ (وەرن لگەل مە) لراديوا كوردى .
- چەند بەرهەمەكێن ئەدەبى دروژنامەو كوڤارادا بەلاڤ كرينە .

هەلبەستا پێش كێش كرى ، بناڤێ (ميرم هەلزبەيى) بو ، مەيێ خوشە ، ئەم ڤێ پارچێ ژێ ، ژخويندەڤانێن هێژارا ، پێش كێش كەين :

میرم هەلز بەیی
هایێ ...
میرو هایێ
دەرگەهـ ... ئاسنەو ...
دەنگێ کلیلێ نایێ
هاڤینا مە سرێ بر
زڤستان ژگەرمێ مر
پایزا ... دیم کەسکەو
هێش زەراتی بلێڤادا نە هاتە
بەلگێت دارا نا هەژین
سلاڤ ناکەن
چو باو هور
بهارا مای رویس و عەوار
هەوار ... هەوار
میرو ... هەوار

هوزانڤانێ دی «پێزانێ ئالیخانی»

- سالا 1966 هاتیە دونیایێ .
- سالا 1978 دەست ب ڤەهاندنا هوزانی کریە .
- هژمارەکا هوزان و لێکولینێن ئەدەبی دروژنامەو کوڤارێن کوردی دا بەلاڤ کرینە .
- نڤشتەکا هەی لژێر ناڤێ (دو مراری ژگەنجینا فولکلورێ کوردی ـ دررتان من کنز الفولکلور الکردی) نهو یا ئامادەیە لبەر چاپێ . ناڤ و نیشانا هەلپەستا خاندی «دلو هەی دل» ئەڤا ژێری پارچەکە ژڤێ هوزانێ :

ژارو دلو ... !!!
بارێ تە ژی هەرێ گرانەو
گران دبیتن !!
نیڤا تە ژی
ئاگرێ تێداو
دچرمسین
خابوریێ خەمێن تە ..
پێلا ددەتن .. !!

زێدە دبیتن
سویلی روندک .. ژچاڤێن من
دهێنە خار
ئەڤینا تە
زێدە دبیتن
دژوار دبیتن
بەرەڤ خرِ ستێرێن پاییزا
ژارو دلو
بلند دبیتن
بلند دبیتن

هوزانڤانێ سێ یێ هوزانا خو خاندی ، کاك جلال محمد دهوکی بو . کاك جلال لسالا 1960 ژدایك بویە ، لسالا 1976 دەست بڤەهاندنا هوزانێ کریە ، هوزانا سەربەست دڤەهینیت . ئەڤە ژی پارچەکە ژهوزانا ل ڤی کوڕی خاندی :

ستەم کارا
وە چ دڤێتن
ژ گەلێن جیهانا سیێ
ژ مروڤێن کولەی و بن دەست و بێ رێ !
ژ کرێکارو جوتیارێن
لێ هزرەت بن
ڤەمالن خوما ئەنیێ
هێش دەرەبەگ و ئاغاییێت دمێژن خوینێ
هێش تارییە لسەر وەلاتا
خاندەڤانێت [illegible]



د دیڤرا گەها «نزیر علی عبد الله»ی هات .
نزیر علی لسالا 1965 ژدایك بویە ، لگوندێ سەرگەلێ ، سالا 1979 دەست بڤەهاندنا هوزانێ کریە هەلبەستا خاندی لژێر ناڤ و نیشانا «قازی مەحمەدێ کوردی ئەم ژبیر ناکەین» ئەڤە ژی پارچەکە ژوێ هەلبەستێ :

خوزی دیروك هەمی من ڤەکربان
پەیڤێت خەلەت من ژێ درست کربان
مێژویا کوردا ژی جوان ببا
زانایێ زانا سەر ڤێ هەل ببا

پاشی دورا کانیێ بو دورا «هزرڤانی» .
«هزرڤان» لگوندێ بورجینی سالا 1962 هاتیە دونیایێ . ل چ قوتابخانا نە خاندیە ، وی ب خو بهاریکاریا هەڤال و هوگرێن خو ، خو فێری خاندن و نڤیسنێ کریە . کاك هزرەڤان دهوزانا خودا ئەوا لژێر ناڤێ
«هو پاشلاو» دبێژیت :
من دەفتەرا پەرێن ڤینێ
هەمی سورو زەرو ئالکر
راستیا راست من تومارکر
ئاڤێتە ناڤ گەرا ژینێ
ژوێ کەڤن تر لێ نەبون
ژوێ ب هێز تر چێ نەبون

لدویماهیکا ڤی کورێ ب رەوش وخوش کاك اسماعیل سلیمان اسماعیل یێ کو سالا 1968 لگوندێ ئاڤەتەحلێ هاتیە دونیایێ هوزانەکا دلداری خاند . ئەڤا ژێری پارچەکە ژهوزانا وی :

هەر دوو برویێتە کڤانن
ئاوریێ چاڤێ تە تیر
دلێ رەبەن مەتالە
کەنیا لسەر لێڤێ تە شیر
تە تیرەك ژەنی دلێ من
لێکر برینەك کویر

## چار هونەرمەندو پیشەنگەهەکا

تەشکما



ژبزاڤ و چالاکیێن رێبەریا رەوشەنبیریا جەماوەری ل دهوکێ . لهولا رێبەریێ ، سەیدا «محمد سعید عبدالرحمن» رێبەرێ گشتی یێ رێبەریا پەروەردەی ، پێشەنگەهەکا هونەرێ شێوەکاری ڤەکر لروژا شەمبیێ ل 1983/9/10 .
ئەڤ پێشەنگەهە ژ (42) کەڤالا پێك هاتی بو . چار گولێن گەش ژباغێ هونەرمەندێن دهوکێ ، پشکداری دڤێ پێشەنگەهێ دا کر . ئەڤا ژێری کورتیەکە لسەر ژیانا ڤان هونەرمەندێن گەنج و لاو .



(1) عدنان حسين شينو :
- لسالا 1963 لگوندێ «ردێنیا» ـ قەزا ئامێدیێ هاتیە دونیایێ .
- قوتابیێ پولا سێیە لئاموژگاریا هونەرێن جوان پشکا نیگاری لسلێمانیێ .

(2) سلیمان علي طاهر :
- لسالا 1963 لقەزا شێخان چاڤێن خو لدونیایێ ڤەکرینە .
- دەرچوویێ بەرهەڤیا کاوەیە لدهوکێ .

(3) رشید علي رشید :
- لسالا 1966 لباژێرێ دهوکێ چاڤێن خو لدونیا رون ڤەکرن .
- نهو قوتابیێ پولا دوێیە ، لئاموژگاریا هونەرێن جوان لسلێمانێ ، پشکا تەشکیلی .

(4) گوهدار صلاح الدین :
- لسالا 1967 لباژێرێ دهوکێ هاتیە سەر دونیایێ .
- ئەو ژی نهو پولا دوێ دخوینیت ، لئاموژگاریا هونەرێن جوان پشکا تشکیلی لسلێمانیێ .

دەمێ مروڤ ماوەر دکەت کەڤالێن ڤێ پێشەنگەهێ ، وێ ژێرا خویا بیت ، کو هونەرمەندێن پشکدار ، چارە سەریا گەلە جورێن بابەتا کریە . باهرا پتر ، گەنجینا سروشتێ کوردستانێ بێ رەنگین وقەشەنگ ، بدەست و تلێن زێرین ، دکەڤالێن خو دا بەرچاڤ کرینە . وە کارێن سامانێ فولکلوری و رەوشت تیتلێ کومەلێ کوردی ژی ، جهێ خو دکەڤالێن وان دا دیتییە .

دیمەنێن سروشتی ، هەر چەندە ، نە تشتەکی نوی یە ئەم دکەڤالا دا دبینین ، لێ کەڤالێن ژڤێ رەنگی دڤێ پێشەنگەهێ دا ، گەلەك بدلێ مروڤی ڤە دنوسیین ، چمکی بدەستەو وناشوبەکا فرهە ، رەنگ تێدا ژسەرك تێن . هندەك کەڤالا کویر سەحکرنو لوکەکا داهینەری ، تێدا هەنە . ئەو ژی ژمشتیا وان ، بو نافەروکێن مروڤایەتی یێن کویر . هەر وەکی ئەم دبینین ، دکەڤالێن «کاروانێ هەژارا»دا وە «مالا شەهیدەکی ژکوردستانا ئیرانێ» ، «گرافیك» ، یێن «عدنان حسین شینو»ی

وە «کەلا دمدم» و «کوشتنا سەربازەکی» ئو «نەوروز نیشانا ئازادیێ یە» ، «سلیمان علي طاهر»ی . وە «شەهیدەك ژ مهابادێ» و «هویڤی» یێن «گوهدار»ی . وە «پورتەرێتا زاروەکی» یا «رشید علي» .

بێ فتیا ئالاف و ئامیرەتێن هاتینە بکار ئینان ، دڤان کەڤالادا ، بو مە وسا دیار دکەن ، کو ئەڤ هونەرمەندە ، شیاینە هەتا رادەکێ ، هزرو بیرو سەربورێن خو ، زل بکەن ، دهندە روخسارێن کارتێکرنا خو دمروڤیرا دبینن . یێن کو رویچکێ کەڤالێ ژبینەری نەڤەشێرن . براستی ئەڤ پێشەنگەهە ، جهێ دل خوشی و دلگەشییا ، ئەڤیندارێن ڤی هونەری بو . ئەڤێن لپێشەنگەهێ ئامادەبوین وە لێڤێن خو تەر کرین ، پشتن تێن و قرقچینەکا درێژ ، بو ئاڤا کانیا هونەرێ شێوەکاریێ رەسەن . یا فەرە بێتە گوتن کو ئەڤ بشکوشکە پێدڤی هاریکاریێ نە ، هێزو شیان و بێ چێبونا ڤان چار لاوێن ژێهاتی . پێدڤی ماتیەکا مەزنن ، ژێ بێتە کرن . داکو بێ خو پاڤێژنە سڤدەرا جیهانا هونەرێ شێوەکاریێ فرەهـ . لسەر رێکا پێش ئێخستنا بزاڤ و لڤلڤینا ڤی جورێ هونەری لباژێرگەهێ بتایبەتی ، وە لدەڤەرا کوردستانێ بگشتی . بدویماهیێ یوپاسیا سەیدایێ هێژا خالد حسێن دکەین ، رێبەرێ رێبەریا رەوشەنبیریا جەماوەری لدهوکێ ، بو وێ هاریکاری و بزڤاندنا وی بو ڤان لاوان پێشکێش کری ، دڤێ پێشەنگەها سەرکەفتیدا .



محافظة : اربيل
الامانة العامة للثقافة و
مجلة (كاروان)

# پۆستەی کاروان



ئامادەکردنی
سۆران حەریری

خوشکو برا خۆشەویستەکانم ؛

وا لەم ژمارەیەشدا و بۆ جارێکی دیکە بەیەک دەگەینەوەو ڕازو نیازی دڵو دەروونی یەکتریمان یەکالا دەکەینەوەو دوور بەدوور دەمەتەقێیەکی برایانە لەگەڵ یەکدیدا دەکەین دەربارەی ئەو نامەی پیرۆزبایی و بابەتو بەرهەمانەی بۆتان ناردووین و پێشکەش گۆڤارە خۆشەویستەکەتان ، گۆڤاری « کاروان » تان کردوون ، ئەو گۆڤارەی کە ئیمڕۆ هەموو ئاواتە مەزن و پیرۆزەکانی ئێوەی خستۆتە نێو تویشەبەرەو بەگەرمیەوە ڕووەو ئامانج هەنگاوی خێرا دەهاوێژێ و بەرەو لوتکە کەوتۆتە ڕێ و هەرگیز سڵەمینەوەی بە خەیاڵدا نایەت ..

- خوشکو برا شیرینەکانم :

پۆستەی کاروان دەنگی زوڵاڵی ئێوەیەو ڕاو ئارەزووەکانی ئێوە ڕادەگەیەنێ ، ئەو هیوا پیرۆزو مەزنانە دەردەبڕێ کە لە دڵی ئێوەدا پەنگ دەخواتەوەو ئاواتی ئەنجامدانی بۆ دەخوازن ، هەڵبەتە ئاواتی هەموو لایەکیشمان هەریەکەو لەیەک جیا نابێتەوە ، کە ئەویش خزمەت کردنێکی بەوەفاو دڵسۆزانەی ڕۆشنبیری و کەلەپووری ئەدەبی نەتەوەکەمانە بۆ گەیشتن بە کاروانی بەرەو لوتکە چووی گەلانی پێشکەوتنخواز ، « پۆستەی کاروان » ڕەنگە لەگەڵ ئاوات و ئارەزووی هەندێ لە خوشکو برا ئازیزەکانمان نەلوێ ، بەڵام ئێمە دووبارە ئەوە دەڵێین کە ئەم گۆشەیە زمان حاڵی هەردوولامانە - چ ئێوەی نووسەرو ئەدیب و ئەدەب دۆستو دڵسۆزانی گۆڤارەکەمان ، وە چ ئێمەی براو هاوڕێ و خۆشەویستی ئێوە - ئەم گۆشەیە دەنگی بەسۆزی ئێوە دەچرپێنێتە گوێچکەی هەموو خوێنەرانی کوردو بەنێو هەموو کوردستاندا پەخشی دەکات ، کوپلە شیعری نوێ پەخشان و چیرۆکەکانتان جوانترین مانای هاوکاری دەگەیەنن و چاکترین پشتگیرین بۆ ئێمەو ، مایەی دەوڵەمەند کردن و زیاتر چەسپانی گۆڤارەکەمانە ، لەولاشەوە ڕاو پێشنیارو بۆچوونەکانی ئێمە دەست بە باڵەوە گرتنێکی دڵسۆزانەیە بۆ ئەوەی بەگوڕتر بخزێنە نێو جیهانی ئەدەب و کەلەپووری کوردییەوەو لەسەر ڕێبازێکی ڕاست و زانستیانە خزمەتی ڕەوتی بەرەوپێشەوە چووی کاروانی ڕۆشنبیریی کوردیمان بکەین و زەمینەیەکی لەبارتری بۆ زامن بکەین تاوەکو لەسەر ئەرزێکی پتەودا بنچ داکوتێ و هەرگیز شکستی بە خۆیەوە نەبینێ ...

ئیمڕۆش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە دەڵێین گۆڤارەکەمان شانازی بەو هاوکارییە دڵسۆزانەیەی ئێوەوە دەکات و ڕێزو پیرۆزبایی خویشیتان پێشکەش دەکات لەبری ئەو گیانی لەخۆ بووردنەی ئێوەی ئازیزو دڵسۆز ، گۆڤارەکەمان ئیمڕۆ چۆتە قۆناخێکی ترەوە ، بەڵگەشمان ئەو نامەو نووسین و بەرهەمە

زۆرو بەپێزو لە بن نەهاتووانەیە کە لە سەرتا سەری وولاتەوە پیمان دەگات ، ئیمڕۆ کەم قەلەم بەدەستی کورد هەیە زیاتر لە بەرهەمیکی بە دیاری بۆ کاروان نەناردبێ ، کەم ئەدیب و ئەدەب دۆست هەن بە نامەی پیرۆزبایی و بە بابەتی بەپێزەوە گۆڤارەکەمانی بەسەر نەکردبێتەوە کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا رەسەنایەتی و رەنگ داکوتانی « کاروان » دەسەلمێنێ و ئەوە دووپات دەکاتەوە کە نووسەرانی کورد چەند بەتەنگ دەولەمەند کردن و گەشە سەندنی کاروانی رۆشنبیریی کوردی یەوەن و چەند بە دلسۆزی و وەفاداری یەوە بەپیر هەموو بانگەوازیکی خزمەت گوزارانەوە دەچن و پشتگیری لێ دەکەن ..

ـ ئازیزانم :

دوا بەدوای ئەم پێشەکی یە کورتە ، هەگبەی نامە شیرینەکانی ئێوە دەکەینەوەو جاریکی دیکەیش گەشتێك بەنێو بابەت و بەرهەمەکانتاندا دەکەین و بۆ چەند تاویکیش لەگەل ناوەرۆکی نووسینەکاندا دەچینەوە دونیای پڕ لە خەیالات و رۆمانسیانەی شیعرو پەخشان و چیرۆك و فۆلكلۆرو زانستی گشتی و جۆرەها بەرهەمی تری زادەی بیرو هۆشی ئێوەی ئازیزو خۆشەویستمان ...

**● بۆ ئەم برا ئازیزانەمان کە بە شیعرو پەخشان گۆڤارەکەمانیان بەسەر کردۆتەوە :**

رضا احمد ، محمد عثمان احمد ، زیوەر أنور مجید ، فائز ابوبکر ، مەنمی عبدالکریم عزیز ، سالار غریب ، مامند واحد منتك ، بەختیار عمر احمد ، علی ابوبکر حمه سعید ، هاشم ملا عمر ، عباس صالح عبدالله ، مهدي بلال عبدالله ، عبدالواحد ادریس ، فاضل حمد عبدالله ، فارس احمد چاوشین ، سعدي علي محمدامین ، مصطفی یعقوب ، عبدالكريم صابر ، كمال حسين حسن ، دەرسیم جلال شریف ، سردار عثمان زەنگەنە ، صباح اسماعیل ملازادە ، صلاح الدين مغدید ، عبدالخالق محمد قادر ، یاسین أنور صدیق ، لقمان حسن ماکۆس ، مغدید احمد رسول ، شیرزاد صالح ، عبدالرحمن علي عثمان ، هەژار کریم خۆشناو ، طارق غفور منتك ، طه احمد رسول ، مهدي خالد غەمبار ، ابراهیم عثمان خۆشناو ، صباح أسعد نجم ، حمه زیاد مولود ، یوسف عزالدین رؤوف ، ازاد کاکل احمد ، اسماعیل عثمان برزنجي ، ازاد احمد ملا ، هاوار سعید علي ، لقمان یاسین یوسف ، خالد صالح ، سلیمان مصطفی ، سەرکەوت شکور جاسم ، ئاشتی قادر ، فؤاد جبار توفیق ، قادر عمر ، اسماعیل محمد سعید ، حسن عثمان حسین ، مهاباد نجم رەباتی ، شیروان حسن حسني ، نجم عبدالله محمد ، حبیب سعید محمد ، سیروان محمود عبدالله ، دلشاد فاخر شیخاني ، قاسم نوري کریم ، هوشیار بابا حاجي ، جلیل عبدالرحمن کۆیی ، سلام علي زەنگەنە ، ازاد توفیق ، علي احمد عثمان پەژارە ، ئاشنا محمدامین رانیەیی ، سردار غریب ، مسعود احمد ، عثمان احمد پیرۆت ، فاروق عثمان ، احمد حاجي قادر ، احمد حسین اسماعیل ، چەوسا عمر طاهر ، سعید علي ، خلیل یاسین هۆشمەند ، ئاوات احمد محمود ، عثمان عبدالسلام محمد ،

ـ خۆشەویستانم :

دیسان وا لەم گۆشەیەدا وەلامی بەشێکی تری ئەو برا ئازیزانەمان دەدەینەوە کە گوڤارەکەمانیان بە شیعرو پەخشان بەسەر کردۆتەوەو دلسۆزی راستەقینەی خۆیان سەلماندۆتەوەو ویستوویانە لەگەل « کاروان » دا بە کاروانی شیعری هاوچەرخی کوردی رابگەن ..

ـ ئازیزانم :

هەلبەتە هەموو کاریکی ئەدەبی بە هاسانی ئەنجام نادرێ ، بەتایبەتی گەر هاتوو مەبەست هێنانە ناوەوەی ئەدەبێکی پێشکەوتنخوازو هاوچەرخ و رەسەن بێت ، ئەدەبێك کە رەنگدانەوەی چەرخی ئێستای زانست و تەکنەلۆژیا بێت ؛ هەر لەم روانگەیەوەو بۆ ئەوەی کارە ئەدەبیەکانمان هاوکێش بن لەگەل رەوتی بەرەو پێشەوە چووی شیعری کوردی ئیمرۆماندا ئەوە بەبێ هیچ دوو دلی یەك بە ئێوەی بەرێزی رادەگەیێنین کە شیعرەکانتان هی ئەوەن بکرێن بە دوو بەشەوە بەشێکیان نووسەرەکانیان بەهرەدارن و خەریکە زەوقی شیعری و پەخشان لە رەگەکانی مێشکیاندا چەکەرە دەکاو بەرەبەرە گەورە دەبێت و چاوەروانی پاشە رۆژێکی پرشنگ داریان لێ دەکرێ گەر هاتوو شارەزایانەو زیرەکانە توانیان رەفتار لەگەل کەلەپوورو سامانی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردیماندا بکەن و تەواو بچنە نێو ناخی شاعیرە کوردەکانمانەوەو سوودیان لێ وەربگرن و تەنانەت هیچ هەنگاوێکی بەرەو پێش چووی ئەم بابەتە ئەدەبیەش

هەڵنەبوێرین ، بەلام دەبێ ئەوەش بلێین کە ئەم جۆرە نووسەرانەیش بەشێکی کەمن وهی ئەوەیە کە بلێین ژمارەیان لە شەش حەوتێك رەت ناکات کە ئەمەش بەلای خۆمەوە شتێکی چاكو پەسندە ..

بەشەکەی تریان ؛ واتە ئەم برایانەی کە وەلامان داونەتەوە ، ئەوان زوربەکە پێك دەهێنن و « شەلم کوێرم ناپارێزم » دەستیان داوەتە پێنووس و چەند تیلمە کاغەزێکیان رەش کردوتەوە گورج داویانە بە بناگوێی گۆڤارەکەماندا جا وەك کابرا گوتەنی « یا گاڵ دێنێ یا پەمو » کە ئەمەیشیان بەش بە حاڵی خۆم بە کارێکی چاکی لە قەڵەم نادەم ، بەڵکو دەڵێم خۆزگە ئەو برایانەمان کاتی خۆیان بە کارێکی بەسوودتر بەسەر ببردایەو ئاوا بە فیروی نەدەن ، چونکە شیعر بەهرەیەو ئەو بەهرەیەش هی ئەوەنی‌یە لە هەموو کەسێکدا سەر هەڵبدا ، جا بۆیە وەکو برایەکی دڵسۆزو وەکوروشنبیرێکی کورد کە هەردەم حەز بە پێشکەوتن و گەشەکردنی ئەدەب و روشنبیری میللەتەکەم دەکەم ، داواتان لێ دەکەم کە تا دەتوانن هەوڵی ئەوەبدەن زیاتر روو لەو مەیدانانە بکەن کە دەزانن تیایدا سەردەکەون شتێ ئەنجام دەدەن ، هەرگیز ماوەی ئەوە مەدەن گیانی خۆ دەرخستن و خۆ بە خەڵکی ناساندنی بە ناکاملێ بەسەرتاندا زاڵ بێت چونکە ئەمەیان دەردێکی کوشندەیە گەر تەشەنە بکات بە ئاسانی چارەی ناکرێ ، دووبارە دەڵێم هیوادارم ئێوەی برای نووسەرو شاعیر تا دەتوانن لە خوێندنەوەو خۆروشنبیرکردندا دوا نەکەون و زۆر سووپاسی هاوکاری و بەشداریکردنتان دەکەین و هەربژین ..

● بۆ ئەم خوشکو برا خۆشەویستانەمان کە ناوو ناونیشانی تەواوی خۆیانیان نەنووسیوە :

« شەیدا ، جەنگی شوانی ، ژاندار چەمچەماڵی ، بەکر گەردی ، هەژار خۆشناو ، بارزان دڵسۆز ، ك .. و ، ئەحمەد بۆڵی ، هێدی کوردستانی ، ابوبکر هێور ، شەفیق رەنجاو ، ادریس شەیداهۆ ، هورمزی ، خەیاڵی ، شێرزاد مەردوخ ، کەریم تەنیا ، طالب سەرانی ، س . أ . دابان ، باوکی کاروان ، ئەحمەد ئاسۆس ، قوباد بەهرەوەر ، زیاد گەردی ، خالد شەیدا ، عثمان بێچار کوردستانی ، شاکر دلدار ، نەوزاد بەرزنجەیی ، ئازاد مۆریاسی ، مغدید ئەزموون ، تۆلاز بهاری ، ئومێد منجولی ، خوشکە (ش . م) ، نور الدین گەردی ، خوشکە (ژاکاو) ، مەریوان دزەیی ، خوشکە (هیران غەمبار) ، خەلیل بێخەم ، دڵسۆز گوڵی ، دلدار هدینەیی » ..

- خوشکو برا شیرینەکانم وابزانم زوربەتان حەز بەوە دەکەن کە گۆڤارەکەتان رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو پێشەوە بچێت و هەنگاوی گەورە گەورە بهاوێژێت بەرەو ئاسۆیەکی گەش و روونتر ، هەردیسان وابزانم خواست و ئارەزووی هەموو لایەکیشمان تەنها خزمەت کردنەو بەس ، گومانیشم لەوەدا نی‌یە کە ئێوەی نووسەرو ئەدەب دۆست و دڵسۆزی «کاروان» کەمتەرخەمی لەوە بکەن کە زوربەی بابەت و بەرهەم و نووسینەکانی نێو گۆڤارەکەتان فەراموش بکەن و نەیان خوێننەوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ، هەر لەم روانگەیەشەوە ئەم کورتە پێشەکی‌یەم هێنایەوە چونکە ئێمە لەو براو خوشکانە دڵنیاین کە هاوکاریمان لەگەڵدا دەکەن و پەیتا پەیتا بەرهەمەکانیانمان بێ دەگات بەلام دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئێمە زیاتر لە جارێك ئەوەمان راگەیاندووە کە گۆڤارەکەمان بۆی ناکرێ ئەو جۆرە نووسینانە بلاوبکاتەوە کە ناوو ناونیشانی خاوەنەکانی بەسەرەوە نەبێت ئیتر با بەرهەمەکەی زۆریش چاكو دەوڵەمەندو بەکەڵك بێت ، جا بۆ ئەوەی کارەکەمان بەرێکوپێکی بەرێوە بروات و گلەییشمان لێ نەکەن بۆ ئەوەی ماندوو بوونەکەی هەردوو لامان بێ ئەنجام نەبێت وا ئەمجارەیش پێتانی رادەگەیەنین و بە هەموو ئەو خوشکو برایانەش دەڵێین ، کە ناوەکانیانمان بلاوکردوتەوە لەمەودوا ئەگەر هاتوو هەر بەرهەم و بابەتێکی بۆمانی دەنێرن ناوو ناونیشانی تەواوی خاوەنەکەی بەسەرەوە نەبوو ئەوە بێ سێ و دوو پشت گوێ دەخرێ و بلاونابێتەوەو پێشەکیش دەبێ بمان بەخشن و زۆر سووپاسی هەموو لایەکیشتان دەکەین و هەربژین ..

● بۆ کاك یوسف کریم بێوار :

**پر بە دڵ سوپاست دەکەین بۆ ئەو پارچە شیعرەی بۆت ناردووین ، بەلام لەبەر ئەوەی هەمووی شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو وا ئەم دوو کوپلەیەمان لێ هەڵبژارد ، هیوادارین بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێری :**

● حەزێکی یەک لایی ●

— 1 —

خۆشەویستیت هەوری بارانێکی چڕە
لەسەر لاشەی ووشکی خەمو زامەکانم
لەنکەر دەگرێ ..
هەردەم لە کلپە سەندنە ،
کە ئەندیشەش لە نوێوە ؛
شالاو دەبا بۆ ڕوانگە دوورەکانم وردە وردە دەتوێتەوە !

— 2 —

لە پێرستی فەرهەنگی یادەکانت ؛
یەکەم تیشکی ..
ڕۆژی ئەوینیم هەڵبژارد
بەدوای ئەوا
گشت لاپەڕەکانیم ژمارد
ووشەیەکی خۆشم نەدی لەو ووشانەی
کە خەج بۆ سیامەندی دەنارد
بەڵام گیانە :
خۆشەویستیت بۆ دڵی من بەهارێکی سەوزو خۆشە
گەرچی نمە بارانیشی تیا دەبارێ
کێ دەڵێتن بارانی بەهار ناخۆشە ! ..

● بۆ ئەم برایانەمان کە بەرهەمیان بە زمانی عەرەبی بۆ ناردووین : « کریم عثمان ، موفق بشیر شاکر ، نورالدین » ..

ئێمە لە کاتێکدا کە سووپاسی ئەم برایانەمان دەکەین لە هەمان کاتدا ئەوە ڕادەگەیەنین و دەڵێین ؛ زۆر خۆشحاڵ دەبین گەر ئەو براو خوشکانەی لە زمانی عەرەبی بە تواناو بەهرەدارن هاوکاریمان لەگەڵدا بکەن بەڵام بەمەرجێ نووسینەکانیان لە ڕووی دارشتن و ناوەڕۆک و هەڵبژاردنی بابەتەوە پوخت و سوود بەخش بن و خزمەتی ئەدەب و ڕۆشنبیری و کەلەپوری کوردیمان بکەن ، وەئەگەر بە وردی چاو بە ژمارەکانی کارواندا بگێڕن ئەوە بە چاکی دەردەکەوێ کە گۆڤارەکەمان چ جۆرە بەرهەم و نووسینێک بڵاودەکاتەوە . هیوادارین لەمەودوا ئەم برایانەمان بەرهەمی بە کەڵکترمان بۆ بنێرن و دووبارە سوپاسیان دەکەین ...

● بۆ ئەم دۆستە ئازیزانەمان کە بابەت و بەرهەمی فۆلکلۆریان بەدیاری بۆ گۆڤاری کاروان ناردووە :

« یاسین ئەحمەد سارەیی ، طارق غفور منتك ، عبدالستار نائومێد ، ابوبكر علي جاف ، عبدالله ابراهيم عبدالله ، مصطفى يعقوب ، مجيد كامل حسين ، ازاد جليل خليل ، عبدالغني صالح » .

مایەی خۆشحاڵیمانە کە ئەم برا بەڕێزانەمان خولیای خۆیان داوەتە فۆلکلۆرو کۆکردنەوەی کەلەپووری نەتەوەکەمان و ئەسپی خۆیانیان لەم مەیدانە فرەوانەدا تاو داوەو خۆیان هیلاک کردووە هەر بۆ ئەوەی خزمەتێکی کەلەپووری میللەتەکەیان بکەن ، بەڵام خۆزگە ئەو هەوڵدان و ئەو خۆماندووکردنەیان لەجێی خۆیدا دەبوو ، چونکە ئەوی ڕاستی بێ زۆربەی هەرە زۆری ئەو بابەتانەی ناردوویانە یا بە کتێب وەیا لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوبوونەتەوە ، وەیا بە کاسێت لەبازاردا دەست دەکەون ، ئێمە کە دەڵێین پێویستە گرینگی بە کەلەپوورو فۆلکلۆر بدرێ ، مەبەستمان ئەو بابەت و بەرهەمانەیە کە تا ئێستا دەستی کەسی نەگەییوەتێ و مەترسی لەناوچوونی لێ دەکرێ ، جا بۆیە بەو براو خوشکانەمان ڕادەگەیەنین کە شەیدای کۆکردنەوەو نووسینەوەی بەرهەمی فۆلکلۆرین ، تا زووە ڕوو بکەنە ئەو کەسانەی کە لەنێو سینگیاندا بە سەدان چیرۆک و مەتەڵ و ڕووداوی فۆلکلۆریان پاراستووەو بە پاکی هەڵیان گرتوون و خەریکە تەمەنیشیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو گەورەیی دەچێ و پیر دەبن ، جا باهەولی هەموو لایەکمان بپەرژێتە سەر ئەم ڕێبازەو تا زووە فریای پاراستنی کەلەپوورو فۆلکلۆری نەتەوەکەمان کەوین و لەفەوتان بیپارێزین و هەمیشە بەزیندوویی بەسەر لاپەڕەی گۆڤارو کتێب و ڕۆژنامەکاندا بدرەوشێتەوە ..

● بۆ برای ئازیزمان سامی جمال محمد قەرەداغی ؛

زۆر سوپاست دەکەین بۆ نامەکەت ، هیوادارین زیاتر بخوێنیتەوەو چاکتر بچیتە بنج و بنەوانی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردییەوە ، وا ئەم چەند کوپلەیەشمان لە شیعرەکەت هەڵبژارد کەبۆت ناردووین و بە ئاواتەوەین بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێری :

● ڕەش ئەسمەر ●

کاتێك دەتبینم دێیتە بەر دەرگا
شاد دەبم بەتۆ ، هەرتۆی پەرستگا

ڕووی ئەسمەریت و پۆشاکی ڕەشت
شەیدایان کردووم دوو چاوی گەشت

شەرتە لەدوای تۆ دڵ نەدەم بەکەس
بەبێ تۆ ژینم بێ لانەو بێکەس

● بۆ ئەم دوو برا شیرینەمان : « فؤاد طاهر صادق ، هەژار کەریم خۆشناو » .. زۆر سوپاستان دەکەین و هیوادارین بەرهەمی داهاتووتان بەسوودو بەپێزتر بێت ..

● بۆ کاك خیری حیدر ابراهیم : سوپاسێکی گەرمت دەکەین بۆ ئەو بابەتە خۆشەی هەڵتبژاردووە بەلام خۆزگە زیاتر خۆت لەگەڵیا خەریك دەکردو بە تەواوەتی دەچوویتە ناخی بابەتەکەو لە کاتی خۆیدا بۆت دەناردین ، هیوادارین لە داهاتوودا بەرهەمی باشترمان بۆ بنێری و دووبارە سوپاس ..

● کاك فەرهاد خدر گۆمەشینی : بابەتێکی فۆلکلۆری کوردی بەپێزی بۆ ناردووین وا ئەم چەند دێرەی لێ هەڵ دەبژێرین و بلاوی دەکەینەوە ، هەروەها داوای بەرهەمی تازەتر لەکاك فەرهاد خدر دەکەین ، لەگەڵ ڕێزو سوپاسماندا ، ئەمەش چەند دێرێکە لە بابەتەکەی کە بەناوی « مەیل مەیلانێی کوردەواری »یە :

- قاسمی یەك چاو ؛ واتە « سوژن یا دەرزی »
- هەر دەڕواو نایگەیتێ ؛ واتە « سێبەر »
- دام لەدیوار ، بوو بە هەزار ؛ واتە « هەنار »
- پشتی هەسانە ، بەری قورئانە ؛ واتە « کوارگ یا قارچك »
- نەپێی هەیەو نە پانی ⎤
هەموو ماران پێ دەزانی ⎦ ؛ واتە « دەستار »

● بۆ ئەم برا ئازیزو خۆشەویستانەمان :
« محمد صدیق زەنگەنە ، ماجد بکر ، پشتیوان بکر حسن ، نجم عبداللە محمد ، صالح محمدامین ، محمد عبداللە جعفر ، هەژار کریم خۆشناو » ..

بەوپەڕی خۆشحالیەوە بەرهەمو نووسینەکانی ئێوەمان بەدەست گەیشت ، زۆر سووپاسی ئەو هەستە پاکەتان دەکەین کە بەرامبەر بە گۆڤارەکەتان ، گۆڤاری کاروان دەرتان بڕیوە ، بەلام دەبێ بمان بوورن کە دەڵێین ئەو نووسینانەی ئێوە ناردبووتان شیاوی ئەوە نەبوون لە « کاروان » دا بلاویان بکەینەوە ، چونکە هەر هەموویان لە عەرەبییەوە وەرگێردرابوون لە کاتێکدا کە گوڤارەکەمان زیاتر ئەو بەرهەمانە بلاو دەکاتەوە کە ڕاستەوخۆ لە زمانی بێگانەوە بکرێن بە کوردی ، ئەمەیشیان لەبەر دوو هۆ ، **یەکەمیان** : گەر لە زمانە ئەسلەکەوە بێت ئەوە بەتام و چێژو بەپێزتر دەبێت و تا ڕادەیەکی چاکیش ڕەسەنایەتی خۆی پێوە دەمینێ . **دووەمیان** : زووربەی زۆری ئەو بابەتانەی ئێوە وەرتان گێڕاوە ، بە کتێب هەیەو لەبەر دەستی خوێندەواری کوردەو چاکتر سوودی لێ وەردەگرێ .. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین ئێمە هەمیشە بە هاوکاری ئێوەوە پشت ئەستوورین و زۆر شادومانیش دەبین کە لەسەر ئەم هاوکاریەتان بەردەوام بن و بابەت و بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێرن تا ئێمەیش پێشکەش بە خوێندەوارانی کوردی بکەین ..

دوو برای هێژا « کاکە سامی نصراللە هەرکی و کاکە کاوە سعداللە محي الدين » ..هەریەکەیان بەرهەمێکیان بۆ ناردووین ، یەکەمیان بە شێوەی کرمانجی سەرووو لەژێر سەردێری « ژینا کوچەرا » ، دووهەمیشیان لەژێر ناونیشانی « کورتە باسێك لەسەر ووشەی کورد » .. ئێمە پێشەکی سووپاسی ئەو دوو برایە دەکەین و هیوای ئەوە دەخوازین کە زیاتر خۆیان بە خوێندنەوەو خۆ شارەزا کردنەوە خەریك بکەن بۆ ئەوەی بتوانن لە دوا ڕۆژدا بابەتی دەولەمەندترمان بۆ بنێرن و ئێمەیش لاپەڕەی کاروانی پێ برازێنینەوە ، هەروەها ئەو دوو برایەمان ئاگادار دەکەینەوە کە بابەتەکانیان شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو ، چونکە نووسین لەبارەی ئەم دوو بابەتە هی ئەوەیە بەدەیان لاپەڕەی لە سەر بنووسرێتەوەو لێکۆلینەوەی فراوانی لەسەر بلاوبکرێتەوە ، نەك هەریەکێ بە نیو « فولسکاب » تەواو بکرێ و بە خوێنەرانی بناسێنین ..

● بۆ هاوڕێی گۆڤارەکەمان ، کاك « حمد عبداللە

